سەلاح ئەلئیمام

# حیکایەتەکانی غەدرو خوێن

بەشێک لە گێڕانەوەی
تیرۆرەگەورەکانی جیهان

وەرگێڕانی
شێرزاد هەینی

سەلاح ئەلئیمام

# حکایەتەکانی غەدرو خوێن

## بەشێکە لە گێڕانەوەی تیرۆرە گەورەکانی جیهان

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

**شێرزاد هەینی**

حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی ڕۆشنبیری

بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان

xaneywergeran@hotmail.com

- ناوی کتێب: حیکایەتەکانی غەدر و خوێن
- نووسەر: سەلاح ئەلئیمام
- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: شێرزاد هەینی
- بابەت: مێژووی
- پیتچنین: شێرزاد هەینی
- هەڵەبڕی: نریفە محەممەد
- دیزاینی ناوەڕۆک: نزار نوری
- بەرگ: ئارام عەلی


- تیراژ: ٥٠٠
- زنجیرە: ٢٨٢
- چاپخانە: گەنج
- چاپ: چاپی یەکەم
- زمانەی سپاردن: (١٢٩٢) ساڵی (٢٠١٠)

# پێرست

# حکایەتەکانی غەدرو خوێن

**لە بری پێشەکیی...**

بۆنی خوێنو دەستی کوشتن گەیشتووتە گەورەکانیش، کوشتن لە پاسەوانو چەکەکان نەگەڕاوەتەوە، سەرۆکی دەوڵەتی مەزن کوژراوەو تا ئیمڕۆش ئاشکرا نەبووە کێ کوشتوویەتی. کەسانی وا کوژراون سەدان پاسەوانیان هەبوو. ئەوەی لە چەندین بۆسەو شەڕو شۆڕش رزگاری بووە، بەئاسانی لەشوێنێکی تر کوژراوە، ئەوەی باری کردووەو دوور کەوتووتەوە تا سەلامەت بێت، لەتاراوگە بەئاسانی کوژراوە.

کەسانێک هەیە بە غەدر کوژراوە، هەیە بە ئاسانیو بە پلانێکی سادە تیرۆرکراوە. هەیە کوژراوە چونکە دەستی رەش بووە، چاوی بەتەماح بووە، دڵی پیس بووە. کەسانی خاوێنو تێکۆشەرو سەرکردەی بەئەزموونیش زۆر کوژراون.

ئەو کتێبە هەڵبژاردەی چەند نموونەیەکی تیرۆری گەورە ناودارەکانی جیهانن، ئەوەش بەبیرهێناوەی ئەوەیە کە دەستی کوشتن درێژەو دەگاتە هەموو پلەو پایەو سەردەمێک. دیارە کوشتنو بڕیار وەرگرتن لەو پرۆسەیە پاش شکستی دیالۆگ بووە، پاش ترسو وەرنەگرتنی بەرامبەرەکان بووە، بۆ ئەوە بووە شەڕو جەنگەکان بەردەوام بن. ئەگەر کورسییەکان گەرمو ماوەدرێژ بن، دەسەڵاتەکان نەگۆڕ بن،

دیکتاتۆریەت دەستی درێژەو لەو لیستەیەش کەسانی بێتاوانیش هەیە، ناوەکانیان زۆرە کە بوونەتە قوربانی دەستی تیرۆر، بەداخەوەش ئەو لیستەیەش بەردەوامە.

دیارە نموونەکان زۆرن، بەلاّم من ئەوانەم بەناسانی کەوتوونەتە بەردەستو بەکوردی سازم کردن، بەهیوای ئەوەی دیالۆگو ئاشتیو سیستەمی دیموکراسی ئەو دیاردە شوومە بنبڕ بکات، چونکە ئێمەی کوردیش زۆر بووینەتە قوربانی ئەو دەستدرێژییەو دەستی رەشی تیرۆر گەیشتووتە گیانی کەسانی گەورەو ماندوونەناسەکانمان، وەک دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملوو دکتۆر شەرەفکەندیو عەبدولخالیق مەعرووفو مەلا جەمیل رۆژبەیانیو سەیدا ساڵح یوسفی.

شێرزاد هەینی
کۆتایی ساڵی ۲۰۰۹
ستۆکهۆڵم

# ناجی ئەلعەلی

بە تیرۆرکردنی ناجی ئەلعەلی فیشەکێک لە
سەری ویژدانی شۆڕش درا

پێنج دەقە پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ۲۲ ی مانگی ئۆگستی ساڵی ۱۹۸۷ ناجی ئەلعەلی گەیشتە شەقامی (ئیفز) لەناوەڕاستی شاری لەندەن. ئەو فێربوو ئۆتۆمبێلەکەی لەسەری شەقامەکە ڕادەگرێتو بەپیادەیی بەرەو نووسینگەی ڕۆژنامەی (ئەلقەبەس)ی کوێتی لە لەندەن دەڕۆیشت، شوێنەکە تەنها سی مەترێک دوور بوو، نەرم نەرم دەڕۆیشت، لەو دەمانە یەکێک لە هاوڕێیەکانی لە پەنجەرەی نووسینگەکەیانەوە ئەوی بە باشی لێوە دیاربوو. هاوڕێیەکەی دەگێڕێتەوە، کە ئەو عەلی لێوە دیاربوو کە کوڕێکی گەنجی قژ ڕەش بەدوای (ناجی)ەوە بوو، پێ بەپێ لە پشتی دەڕۆیشت، کوڕەکە چاکێتێکی ڕەنگ شینی لەبەردا بوو، ئێمە لەودەمانە گوێمان لە چەند تەقەیەک بوو، من لە پەنجەرەوە بینیم ناجی یەکسەر کەوتە سەر زەوی، کوڕەکە پاش تەقەکان بۆی دەرچوو، بەغاردان دوورکەوتەوە. پۆلیسی لەندەنی لە ڕاپۆرتەکەی خۆیاندا نووسیویانە کە کوڕە بکوژەکە دەگاتە تەنیشت ئەوو لە نزیکەوە چەند فیشەکێک بەسەریەوە دەنێت، گوللەکان کەللەی سەری لە ڕاستەوە بەرەو چەپ دەبڕن.

کە پۆلیس دەگاتە شوێنی ڕوداوەکە زوو داوای ئەمبولانس دەکەن، بەڵام ئەمبولانسەکە لەبەر شاپووڕەی ترافیکی ناوشار کەمێک دوا دەکەوێت، بەگەیشتنیان ناجی هەڵدەگرنەوەو دەیگەیەننە نەخۆشخانەی (سانت ستیفنز)، چەند دڵۆپە خوێنێک بەجەستەیەوە دیاربوو، کە هەڵیدەگرنەوە دەستێکی بە سویچی ئۆتۆمبێلەکەیەوە بوو، دەستی دووەمیشی کۆمەڵە تابلۆیەکی هەڵگرتبوو، ئەو هێشتا نەمرد بوو، بۆیەش زوو دەیبەنە ژووری تایبەتی چاودێری وردەوە، بەڵام ئەو هۆشی

لەخۆی نەبوو، بۆ بەیانی‌و بۆ چارەسەریی برینداره سەختەکە دەیبەنە نەخۆشخانەی (چارنگ کرۆس).

پاش ۲۸ رۆژ لە بێ ئاگایی‌و رەوشی خراپی تەندروستی دەزگاکانی راگەیاندنی عەرەبی‌و جیهانی لە رۆژی ۲۹ ی مانگی ئۆگستی هەواڵی گیان لە دەستدانی ئەلعەلی لە نەخۆشخانەی چارنگ کرۆس لە لەندەن رادەگەیەنن. دیارە کۆششی زۆریش کرا بۆ رزگاربوونی ئەو لە مردن، بەڵام لەبەر برینە سەختەکەی کۆچی دوایی دەکات، ئەگەرچی ئەو وەسیەتی کردبوو لە خیوەتگەی (عین الحلوه)ی نزیک شاری (سەیدا) ی لوبنانی لە تەنیشت گۆڕی دایکو باوکی بنێژرێت، بەڵام بەداخەوە هیوایەکەی ئەو نەهاتەدی، بۆیە لەرۆژی ۲ ی مانگی سپتەمبەری ساڵی ۱۹۸۷ لە لەندەن‌و لەگۆڕستانی (برۆک وردی)ی موسڵمانان بەخاک دەسپێردرێت. ئەو گۆڕستانە دەکەوێتە ناوچەی (ویکنگ) کە ۳۰ کیلۆمەتر لە لەندەن دوورە، لەوێ ئاڵای فەڵەستینی بۆ هەڵدەکەن‌و لە گۆڕی ژمارە ۲۲۰۱۹۰ دەنێژرێت، دیارە ناشتنەکەشی بەشێوەیەکی کاتی بووە، تا ئەودەمانەی بوار ساز دەبێت تەرمەکەی بگوازنەوە خیوەتگەی (عەین ئەلحلوه) تا بەیەکجاری بگەڕێتەوە تەنیشت گۆڕی دایکو باوکی خۆی. لە سەعات یەکو نیوی نیوەڕۆ لە مزگەوتی مەڵبەندی رۆشنبیری ئیسلامی لەدەڤەری (ریگنتارک) لە ناوەراستی لەندەن نوێژی لەسەر کرابوو. لەرۆژی ۹ ی مانگی سپتەمبەر بنەماڵەکەی بەیاننامەیەک بڵاودەکەنەوە کە تێدا نووسرابوو:

دوژمنەکانمان تاوانێکی گەورەیان دەرحەق بەو ئەنجامدا، کوشتنی نیگارکێشێک گەورەترین تاوانی ئەو سەدەیەیە، ئەوان ناجی ئەلعەلییان

تیرۆرکرد، کە زۆر مولتەزم بوو بەکێشەی ڕەوای فەلەستین، چونکە خامەکەی ئەو لەسەردەمانێکدا بوو کە ڕەوشی عەرەبی زۆر بۆگەن ببوو، ئەویش ڕۆڵی کاریگەری لە ڕەخنەگرتن دەبینی، بۆیە نامەردانە کوشتیان. هونەرەکەی ئەو لە ناخی جەماوەرەوە هەڵقوڵابوو، هەر لە دەریای ئەوانیشی دەکردەوە. ئەلعەلی کوڕی بەوەفای جەماوەرە سادەو ڕەش و رووتو ساویلکەکە بوو، وێنەکانی ئەو وزەیەکی بەزەبرو کوشندەی هەبوو، بۆیەش خەڵکێکی زۆری بێزارو تووڕە کردبوو، هەموو گاڤن بەرهەمەکانی ئەو نمایندەی دڵی زیندووی کەسایەتی فەلەستینییەکان بوو، ئەوانەی بەردەوام ستەمیان دەرحەق کراوەو بەشیان خوراوە، ئەو گیانی خۆی کردبووە قوربانی بۆ کێشە ڕەواکەیان. ئەو ماوەیەکی زۆر ئاوارەبوو، بۆیەش بەسەرگەردانی ژیاوە، لەبەر ئاڵۆزی سیاسی دۆزی فەلەستینییەکان ئەو بەناچاری وڵاتانی عەرەبی جێدەهێڵێتو بەرەو تاراوگەیەکی تر سەر هەڵدەگرێت.

## گەڕان بۆ شوێنی گۆڕێک!

تیرۆرکردنی ئەو هونەرمەندە تێکۆشەرە کارەساتێکی جەرگ بڕ بوو، بەڵام ستەمو کارەساتەکە لەوە گەورەتر ئەوەبوو کە گۆڕێک نەبوو، گۆڕستانێک نەبوو ئەوی تێدا بنێژرێت، ئەوەش بنەماڵەو هاوڕێیەکانی ماندووو خەمبار کردبوو، ئەو وەک چۆن لەناو دڵی دۆستو عاشقانی هونەرەکەی دەژیا بەو شێوەیە دەیویستو شەیدای ئەوەبوو گۆڕەکەی لە

خەڵـکەکە نزیـک بێـت، دەیویسـت بەمردوویـی بگەڕێـتەوە گونـدی (ئەلشـەجەرە)ی فەڵەسـتینی، بگەڕێـتەوە زێـدی پیـرۆزی خـۆی، بەڵام ئەوەیـان نەسـتەم بـوو، چـونکە وڵاتەکەی داگیرکـراو بـوو، ئەگەرچـی هەمووڵایەک بڕیار وەردەگرن ئەو لە خیوەتگەی فەڵەستینی لە لوبنـان لە عەیـن ئەلحلـوە بنێژرێـت. بنەمـاڵەکەی کۆشـش زۆریـان کـرد تـا هەمـوو رەزامەنــدییە پێویسـتییەکانیان دەسـتەبەرکرد، بەڵام دەرئەنجـام هیوایەکەیـان نەهـاتەدی، نەزانـرا هۆکارەکـان چـی بـوون، بـۆ بـوار نەدرا بەگەڕانـدنەوەی تەرمەکەی ئەو بـۆ خیـوەتگەی عەیـن ئەلحلـوە لەلوبنـان. زۆر لەبەرپرسە دیارەکان خۆیان لە کارەکە کێشایەوەو نەهاتنە بەر باری کارەکە، رەنگە لەوە ترسیان هەبووبێت بەگەڕانەوەی تەرمەکە ئاڵۆزییەک لەنـاوچەکەدا بقەومێـتو لەو کـاتەدا خەڵکێکـی زۆر ببـنە قوربـانی خۆپیشاندانەکە، ئەوەش ببێتە هۆکارێک بۆ لەناوچوونی ژمارەیەکی تری نـوێی فەڵەسـتینییەکان کە بەچەنـدین هۆکـارو دەسـت ئەوان بەردەوام دەکـوژرێن، دیـارە ئەگەر خـزمو کەسەکانیشـی بەوە رازی دەبـوون، ئەوە نـاجی خـۆی قبـووڵی نەبـوو لە نێـوچەوانی گەڕانەوەی تەرمەکەی ئەو، ژمارەیەک خەڵک ببنە قوربانی ناشتنەکەی ئەو لەتەنیشت تەرمی دایکو باوکی لەو خیوەتگەیەدا. هەمووڵایەک گەیشتنە رایەک کە تەرمەکەی ئەو لەگۆڕستانی موسڵمانان لە لەندەن بنێژرێت، بەڵام بەشێوەیەکی کاتی تـا رۆژێـک بوارسـاز دەبێـت بگـوازرێتەوە لوبنـان، لەوێـش رێبێـوانێکی شارستانەی شیاو بەکەسایەتیو بەهونەرو رۆحە پاکەکەیو خەباتەکەی بۆ سازبکەن.

# سەربردەی ژیانی ناجی

ئەلعەلی نازناوەکەی ویژدانی شۆڕش بوو، ئەو لە گوندی (ئەلشەجەرە) لەساڵی ١٩٣٦ لەدایکبووە، ئەو گوندە دەکەوێتە نێوان شاری ناسرەو تەبەریا لە ئەلجەلیلی باکووری فەلەستین، دەڵێن ئەو ناوە لە پیرۆزی ئەو دارە وەرگیراوە کە حەزرەتی مەسیحی پێوە ناسراوە. ئەویش وەک هەزارەها بنەماڵەی تری فەلەستینی لە ساڵی ١٩٤٨و لە ئەنجامی شەڕەکاندا کۆچ دەکەن و لەگەڵ بنەماڵەکەی دەگەنە خوارووی لوبنان، هەواریان لە خێوەتگەی عەین ئەلحلوە هەڵدەدەن، لەوێش خوێندنی سەرەتایی تەواو دەکات، ماوەیەک لەبەر نەبوونی و بۆ کارکردن لە کێڵگەکانی لیمۆدا دەست لەخوێندن هەڵدەگرێت، بەڵام دووبارە دەگەڕێتەوە سەر خوێندنەکەی و لەقوتابخانەیەکی پیشەیی لە شاری تەرابولسی لوبنانی دبلۆمی میکانیک وەردەگرێت. لە کۆتایی پەنجاکاندا دەچێتە ئەکادیمیای هونەر لەبەیروت، لەوێ موخابەراتی لوبنانی بەردەوام رایدەنێن و هەراسانی دەکەن و چەند جارێکیش دەگیرێت، بۆیە خوێندنی لەو ئەکادیمیایە پێ تەواو ناکرێت، لە ترسی گرتن و زیندان لەبەیروت دوور دەکەوێتەوەو دەچێتە شاری سوور، لەوێ لە کۆلیژی ئەلجەعفەرییەدا وانەی هونەر دەڵێتەوە، لەساڵی ١٩٦٣ سەفەری کوێت دەکات و لە گۆڤاری (ئەلتەلیعە) کار دەکات، پاش ماوەیەک و لە ساڵی ١٩٧٥ لەرۆژنامەی (ئەلسیاسە) کارێک وەردەگرێت.

ناجی دووبارە دەگەڕێتەوە بەیروت و لە رۆژنامەی ئەلسەفیر کار

وەردەگیرێتەوە. ئەو لە ساڵی ١٩٧٧ دەگەڕێتەوە کوێتو لە ڕۆژنامەی ئەلسیاسە دووبارە کار دەکاتەوە. لە ساڵی ١٩٨٢ دەگەڕێتەوە بەیروتو لەودەمانەشدا لەگەڵ ڕۆژنامەی ئەلوەتەنی کوێتیش هاوکاریبان دەکات، پاش ماوەیەک دەگەڕێتەوە کوێتو لەرۆژنامەی ئەلقەبەس کار دەکاتەوە، دەڵێن لەسەر داوای یاسر عەرەفات لە کوێت دوور دەکەوێتەوەو واز لەو کارە دەهێنێتو سەفەری لەندەن دەکات تا لەوێ لەنووسینگەی ڕۆژنامەی ئەلقەبەس کار بکات. ئەو بەبەرهەمەکانی ناوو پلەیەک پەیدا دەکات، تا وای لێ دێت لەبەر وێنەکانی ئەو کە لەدوا لاپەڕەی ڕۆژنامەکاندا بڵاودەبوونەوە رەواجو داوای زۆر دەکەوێتە سەر کڕینی ڕۆژنامەکان، ئەگەرچی ڕۆژنامەکان بابەتی دەوڵەمەندو گرینگیشیان تێدا بووە. تا ئەو ڕۆژەی لەلەندەن تیرۆر دەکرێت لەو کارەو لەو نووسینگەیەدا بەردەوام دەبێت.

## وێستگەکانی ژیانی

ژیانی ناجی تژی لە هەڵوێست بووە، بۆیە ناکرێ ژیاننامەی ئەو باش بنووسرێتەوە ئەگەر زۆر ڕاستگۆیانە نەبێت، گەشتەکەی ئەو لەژیاندا هەموو زانو ئەشکەنجە بووە، ئەو لەو وڵاتانەدا خۆی بەمیوان زانیوە. تا ئێمەش سەربردەی ژیانی ڕاستگۆیانە بنووسینەوە، ئەوە دەنووسینەوە وەک چۆن خۆی نووسیویەتەوە، بەو شێوەیە:

من ناوم ناجی ئەلعەلییە، لەزێدی حەزرەتی مەسیح لەدایکبووم،

شوێنەکە دەکەوێتە نێوان گوندی ئەلشجەرەی نێوان شاری تەبەریەو ناسرە لەجەلیلی باکوور، من تەنها دە ساڵ لەوێ ژیاوم، ئێمە لەسالی ١٩٤٨ لەوێ دەرکراینو لەو رۆژەوە دەربەدەر بووین، کاروانی کۆچەکەمان گەیشتۆتە خێوەتگەی عەین ئەلحلوە لە لوبنان، من ئەو دە ساڵەی لە زێدی خۆم ژیاوم زۆر شانازی پێوە دەکەمو بەردەوام باسی دەکەم، چونکە ژیانی ئەوێم ئەوەندە دەهێنێت کە بەردەوام لەخەیاڵمدا بێت، کە لە هەموو سەردەمەکانی تری ژیانم خۆشتربوون، لەوێ گیاو بەردو سێبەرو روناکیم ناسی، ئەوانە لەناو سۆمای چاوم گیربوونو دوور ناکەونەوە، هەموو دیمەنی شوێنەکانی تر دەڕۆنو دەڕەوێنەوە، بەڵام ئەو دیمەنانە هەرگیز ناڕەونەوە. من کەسێکی نیگارکێشم، من حەقایەت نانووسمەوە، یان بخوور ناسوتێنم، من وێنە دەکەم، ئەگەر پەڕەموچەکەی دەستم برینەکانی تیمار کرد، ئەگەر بەدروستی پێناسەکانیان کرد، ئەوەیان سەرم بەرز دەکاتو شانازییەکی مەزنە بۆ من، خەونەکانم بەوەش هێشتا نەهاتوونەتە دی، من کەسێکی قەشمەر نیم، یان من شاعیری عەشیرەتێک نیم، من ئەو فەرمانانە لەناو دڵم بەیەکجاری دەر دەکەمو هەرگیز بۆیان نییە دووبارە بگەڕێنەوە، بەیەکجاری دەریان دەکەم. ئەگەرچی کارو پیشەکەی من گرانو زەحمەتە، بەڵام دەزانم من بەوهۆیەوەیە کە دەژیم، ئەوەیە من ئاسوودە دەژێنێت، بەوە نەبێت من ناژیم!

کە تاوانبارم دەکەن کە من کەسێکی مولتەزمەو لایەنێکم دەوێت، ئەوانە راست دەکەن، من کەسێکی بێلایەن نیم، من لایەنگیری ئەوانەم کە لە(ژێر) باری قورسی درۆزنەکانو گرانی سەرلێ شێواندنەکانو کەفری

قەهرو تاڵانو ناو تەلبەندی گرتووخانەکانو زیندانە تاریکەکاندا دەژین، مـن بەراسـتی لایەنگیـرم، لەگەڵ ئەو خێـزانە داماوانەم کە لەنـاو گۆڕستانەکانی میسر ژیـان بەسەردەبەن، یـان ئەوانەی لەپێدەشتەکانی خەرتووم زنجیر بەدەستن، کۆتکراون، ئەوانەی شەوەکان چەکەکانیان بۆ تیژ دەکەنو بەیانیان کوشتیاریان دەکەن، بەو ئاگرانە تیشکی خۆریان لە حەشارگاکانیانەوە بـۆ بەرز دەکەنەوە... لەوانەی لە خیوەتگاکـان کتێبـی وڵاتیـان بـۆ دەخوێنەوە. من بەتەواوی لایەنگیـری ئەوانەم، مـن بـێلایەن نیم.

# عەین ئەلحلوە

ناجی ئەلعەلی لەسەر سەربردەی ژیـانی تـایبەتی خـۆی بەردەوامەو نووسیویەتی:

من منداڵ بووم پێخاوسو سەرکۆت بەرەو خیـوەتگەکە رامانکرد، مـن منـداڵێکی نەفـام بـووم، لەگەورەکـانم گوێ لـێ دەبـوو دەیـانووت، وڵاتـانی عەرەبی، ئینگلیز، پلانو ... لەناو خیوەتەکانـدا گوێم لەگریـانی پەکۆڵو سـووتان دەبـوو، ئاگـام لـێ بـوو ئەوانەی دەمـردنو رۆحیـان دەدا روویـان لەوڵاتە دزراوەکەیـان بـوو، لەنـاو چـاوی هەموویـان خەمـم دەبینـی، لەودەمـانە حەزم دەکـرد لەسـەر دیوارەکـانی خیوەتگـاکە وێنە بکێشـم، لەسـەر هەمـوو رووبەرە چۆڵەکـان شـەیدای ئەوە بـووم هێلکـاری بـکەم، بەردەوام دەست بەتەباشیر بووم، بەبێ وەستان خەریکی خشەخش بووم.

ئەو وردە خەیاڵانەی وڵاتەکەم کە لەهزرمدا مابوون لەسەر دیوارەکانی خێوەتگەکە دەمنەخشاندنەوە، وێنەکانم دروست دەگواستنەوە سەر دیواری بەندیخانەکانی سوپای لوبنانی، لەوێ ماوەیەک بەناچاری مانەوەو دەستبەسەر بوون، پاشان ئەو وێنانە خرانە سەر کاغەز، تا ئەو رۆژەی غەسان کە نەفانیم لە خێوەتگاکە بینی، وێنەکانم نیشانی ئەو دا، ئەو وێنەکانی منی بردو لەگۆڤاری (ئەلحوریە) بڵاویکردنەوە، هاورێیەکانم گۆڤارەکەیان بەخۆشییەوە بۆ هێنام، ئەوان زۆرتر هانیان دام، دەستیان گرتم.

لەو قۆناغەدا رووم لە خوێندنی ئەکادیمیا کرد، خوێندن لەئەکادیمیای لوبنانی یەک ساڵ بوو، من تێیدا نزیکەی یەک مانگ مامەوەو ساڵەکەم لەبەندیخانەکانی سوپای لوبنانی بەسەر برد، زوو زوو منیان دەگرت، بیانوویان دەدۆزیەوەو بەجۆرەها بیانوو دەیانگرتم، هەمووش بۆ ئەوە بوو بمانترسێنن تەنها بۆ ترساندنمان بوو، کە بێزارو سەخڵەت دەبوون ئازادیان دەکردین، یان خزمو ناسیارەکانمان دەبوونە کەفیلمانو بەپەلە بۆ ئازادکردنمان دەهاتن. لەبەر ئەو رەوشەو رووداوەکان بڕیارمدا بۆ خوێندنی وێنەکێشان سەفەری قاهیرە یان رۆما بکەم، دیارە ئەو سەفەرەش پارەی دەویست، بۆیە بۆ پەیداکردنی بڕێک پارە بۆ نیشکردن چوومە کوێت تا لەوێ کارێک بکەمو بڕێک پارە بۆ خوێندنەکەم پاشەکەوت بکەم.

لەساڵی ١٩٦٢ گەیشتمە کوێت، لە گۆڤاری (ئەلتەلیعە) کارم کرد، رێبازی گۆڤارەکە نەتەوەیی عەرەبی بوو، هەندێ جار لەگۆڤارەکە رۆڵی سەرنووسەرو دەرهێنەری هونەریو دیزاینیشم دەبینی، سەرەتا لەهەر

ژمارەیەک یەک تابلۆم بڵاودەکردەوە، پاشان کردمە دوو تابلۆ لە هەر ژمارەیەک، هەستم کرد بابەتەکانم باش تەماشا دەکران، جەماوەریان هەبوو، بەرجەستەی پردێکم لە نێوان خۆمو خەڵکەکە دەکرد، وەک خوداکانی هیندم لێهاتبوو، هەستم دەکرد وەک ئەوان بیست دەستم هەیە، وێنەی زۆرم دەکێشا، بەرهەمەکانم زۆر بوون، پەنجەکانم قسەی ناو دڵی منیان رێک دەکردە وێنە، لەگەڵ ئەو کارمشدا من لەرۆژنامەی رۆژانەش کارم وەرگرت، وێنەکانم گەیشتنە هەموو گۆشەیەکی ئەو جیهانە.

لەکوێت بووم کە رۆژنامەی ئەلسەفیر لەبەیروت دەرچوو، لەوێیەوە تەلاڵ سەلمان پەیوەندی پێوەکردم کە بچمە بەیروتو لەگەڵ ئەواندا کار بکەم، بەداواکردنەکە دڵم خۆش بوو، هەستم کرد رزگارم بوو دووبارە گەیشتمەوە بەیروت، بەڵام لەو سەفەرەدا زۆر دڵتەنگ بووم، لەوێ تێگەیشتم شتەکان زۆر گۆڕاوە. هەستی شۆڕشگێری ناو خەڵکەکەی عەین ئەلحلوە بەهێزەو وەک بڵێسەی دەسوتێن، دڵیان بۆ شۆڕش بەجۆشە، بۆچوونە سیاسییەکانیش روون دیاربوون، هاوڕێو نەیارەکان لەیەکتری جیاواز دەردەکەوتن، هەموو مەبەستەکانیش فەڵەستینو تەواوی خاکی داگیرکراوەکە بوو. کە من گەڕامەوە خێوەتگاکەم بینی یەک پارچە چەکە، چەک زۆرە بەڵام هوشیاری سیاسی تێیدا نەبوو، مەسەلە سیاسییەکان دیار نەبوون، بینیم خەڵکەکە بۆتە عەشیرەت عەشیرەت، بینیم هەموو سیستەمەکان لەلایەن دۆلارەکانی پترۆڵەوە داگیرکراون، گەنجەکانیان بەوە مەست کردووە.

ئەگەر خێوەتگاکە منداڵدانی شۆڕشگێران بوو، بەڵام کۆششەکان

بەردەوام بوو بۆ لەباربردنی ئەو نەوەیە كاركەرە، من هەموو لایەكم تاوانبار دەكرد، ئەوەش تاوانی هەموو لایەك بوو، نێوان خیانەتو كەمتەرخەمی بەڕوونی دەناسرایەوە، بەڵام من كەس لەبەرپرسیەتی ئەوەیان نابوورم، هەتا شۆڕشی فەڵەستینیش تاوانی هەیە. ئەو رەوشە بوو بواری سازكرد رووداوەكانی پاش داگیركردنی لوبنان روو بدات.

# داگیركردنی لوبنان

من لەشاری (سەیدا)بووم كە هێرشەكەی سەر لوبنان دەستی پێكرد، فەڵەستینییەكانی ناو خیوەتگاكان وایاندەزانی سەركردایەتییەك هەیە پێشڕەوایەتییان دەكات، ئیسرائیلییەكان بەسوپایەكەیان هێرشیان هێناو دووبارە داگیریان كردینەوە، مەبەست لەو هێرشەش لەبیركردنی فەڵەستین بوو، تا ناوەكەشمان لە بیر بچێتەوە، ئەوان باشیان دەزانی ئاراستەكان بەقازانجی ئەوان دەشكێتەوەو ئەوان دەیبەنەوە، هەموولایەك ئەوەیان لا روونو ئاشكرابوو كە ئەوە بەدەسكەوتی عەرەب ناشكێتەوە. ئەو رەوشەی كە هاتبووە پێشەوە بەقەوارە عەرەبییەكانو پێشهاتە دەولییەكان هەتا بەفەڵەستینییەكانیش چارەسەر نەدەبوو، بۆیەش رژێمە عەرەبییەكان خۆیان لە رێكەوتنەكەی (كامپ دیڤید)یش بێلایەن كرد.

ئەگەرچی من كەسێكی سەربازی نەبووم، لەو بوارەش شارەزاییم نەبوو، من لەژیانمدا یەك فیشەكم نەتەقاندووە، هەموولایەكو هەتا

سەرکردایەتییە سەربازییەکان باشیان دەزانی کە سوپای ئیسرائیل بەرەو لوبنـان هێرش دەکـاتو پێشـڕەویش دەکـات، دەکـرا زیـانی زۆریـش لەو سوپایە داگیرکەرە بدرێت، بەڵام من دەڵێم پـیلانەکە لەلایەن رژێمەکانی خۆمـانەوە بـووە، ئەوان دەسـتیان هەبـووە لەوەی فەلەسـتینییەکانو چەکدارەکان لەخوارووی لوبنـان دوور بخەنەوە، هیوایـان وا بوو بەوەیـان کەشـێکی ئاشـتییانە لەنـاوچەکە سـازبکەن، هەمـووش بـۆ ئەوە بـوو هەمـوولایەک بەراکـردن بەرەو ئەمریکـاو باوەشـە گەرمەکەی سوپاسـگوزار بن، تا چاویان لەوە بێت ئەمریکا هەموو کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکات. رەوشی عەرەبی بەو شێوەیە بوو، فەلەسـتینییەکانیش بەشـێک بوون لەو بـــازنەیە، مـــن وادەزانــــم ئەگەر لەخێوەتگەکـــانی نـــاو لوبنـــان سەرکردایەتییەکی باشو لێوەشاوە بـۆ فەلەسـتینییەکان هەبـووایە زیـانی گەورە بەر ئالەتی سەربازی ئیسرائیلی دەکەوت! هۆکارەکانی شـکانەکە زۆر بـوون، لەئاسـمانەوە بۆردمـان زۆر بـوو، لەدەریـاوە بۆردمـان دژوار بـوو، لە دەشـتەکانیش سـوپاکە دەهـاتو بەئاسـانی پێشـڕەوی دەکـرد، لەگەڵ ئەوانەشدا سەرکردایەتییە پیرەکە پێدەسەڵات بوو، خێوەتگەکان ببوونە چڵپـاوو یەک پـارچە قـوڕو لیـتە، بـۆیەش ئیسـرائیلییەکان کردبوویـانە گۆڕەپانی فوتبۆل بۆ یارییەکانی سوپاکەی خۆیـان، سوپاکەیان بەئاسـانی گەیشـتە نـاو بەیروتـی پـایتەختیش، بەڵام بەرگـریو بەرەنگـاری لەنـاو خێوەتگەکـــان هەر مـــابوو، شـــەڕەکە لەوێ بەردەوام بـــوو، ســـەربازە ئیسـرائیلییەکان شـاهیدی ئەوەیـان داوە، منـیش شـاهیدی ئەوە بـووم، منیش وەک خێزانەکەم، وەک شاری سەیدا داگیرکراین، ئێمە سێ چوار رۆژ لەسەر دەریا ماینەوە.

کە سوپای ئیسرائیلی پێشرەویی کردو لوبنانی داگیرکرد من بەرۆشی ئەوە بووم لەنزیکەوە بەرگری و بەرهەڵستی دانیشتوانە فەلەستینییەکانی خیوەتگەکانی ناو لوبنان ببینم، چوومە ناو خیوەتگەکان لەگەڵ خۆمدا کوڕەکەشم برد، ئەو لەودەمانە تەمەنی پازدە ساڵان بوو، کە چووینە ناو خیوەتگەی عەین ئەلحلوە رۆژ بوو، چەندین تەرمی کوژراومان بینی لەناو شەقامەکاندا مابوونەوە، دەبابە سوتاوەکانی ئیسرائیلییەکانیش لەوێ بوون، کە لەدەروازەکەدا بوون، هێشتا دەبابە شکاوەکانیان رانەکێشابووە شوێنی تر، لەشێوەو چۆنیەتی شەڕەکانم پرسی، وتم کێ بوون بەرگرییان دەکرد، جەنگاوەرەکان سەر بەکام لایەن بوون، شەڕەکان چۆن بەڕێوە دەچوون، لەئەنجامدا بۆم روون بۆوە کە شەڕەکان تەنها ٤٠ تا ٥٠ گەنج کردبوویان، هێزەکەی ئیسرائیل خیوەتگەکەیان سوتاندبوو، ژنو منداڵەکان هێشتا لەناو ژێر زەمینەکاندا بوون، ئاگری سوپاکە دەگەیشتە هەموو گۆشەو خاڵێکی دووری خیوەتگەکە، دیارە لەشاری سەیداش بەرگری و بەرەی شەڕ هەبووە لەوێ ژنو منداڵیش ببوونە قوربانی، گەنجەکان شەڕیان کردبوو، بڕیارو بەڵێنیان دابوو تا شەهید نەکرێن تەسلیم نەبن، قبووڵیان نەبوو دەستبەرداری چەکەکانیان بن، بۆیەش بەرۆژ ئیسرائیلییەکان کەسیان لەو جەنگاوەرانە نەگرتبوو، شەوانەش تەقەو بەرگری هەبوو، دەست بەتاریچی بۆیان دەردەچوون. من خۆم شاهیدی رۆژانەو شەڕەکەی ئەو بەرەیە بووم، دیارە کە لەبەرەکانی تری وەک (سوور)و (برجی باکوور)و ... لە(رەشیدیە)یش بەرگری و وەستان بەرووی داگیرکردن هەبووە. خەڵکەکە رژابوونە شەقامەکانو لەخودا دەپاڕانەوەو جنێویان بەحکومەتە

عەرەبییەکـــان دەدا، نـــاوی ســـەرکردەکانیان بەناشـــیرینی دەهێنـــا، لەواقیعەکە زۆر نیگەرانو ترساو بوون، باشیان دەزانـی تەنهـا خـودا لەگەڵ ئەواندایە، ئەوان کەسیان لەپشتدا نییە، لەو کارەساتەدا تەنهان. خەڵکە رەشـــوورووتەکەی خـــوارووی لوبنـــان بەبـــێ ئەوەی کەسو لایەنێـــک سەرکردایەتییان بکات خۆیان دەستیان دابووە چەکو بەرگرییان دەکـرد، هەژارەکـــان لەنـــاو ســـەنگەردا بـــووون، ئەوان کە دەکـــوژران لەگەڵ بەڵێنەکانیانـدا بەوەفـابوون، زۆریـش برسـی بـوون، لەکـاتی شـەڕەکاندا خانوویان بەسەردا خاپوور دەکرا، من وا دەزانـم دەزگاکـانی راگەیانـدن زۆر کەمتەرخەمن لەناوهێنانی بەرگری لوبنـانی، بزاڤی نیشـتیمانی لوبنـانی رۆڵیـان کـاریگەربوو، بەرگرییـان کردبـوو، بەڵام بەداخەوە کەس ئامـاژەی بەو لایەنە نەدەدا، باس لەرۆحی بەرگری نەدەکرا.

# رۆڵی ژنان

لەخێـوەتگەی عەیـن ئەلحلـوەدا خەڵـکەکە بەژنو منداڵەکانیشـەوە پەرتەوازەی ناو باخچەکان بوون، ئیسرائیل گەنجەکانیشی کۆ دەکـردەوە، منیش چەند جارێک تەنها مامەوە، پاشان زۆربەی گەنجەکانیان لەچەند شوێنێکدا زیندانی کرد. لێرەوە رۆڵی ژنان بەرجەستەو دیار دەبێت، هـیچ هونەرمەنـدێک ناتوانێـت وردو راسـت رەوشـەکە وەک خـۆی لەخـوارووی لوبنان بەرجەستە بکات، ئەوەیـان کـارێکی ئاسـان نەبـوو، ژنەکان لەگەڵ تەرمەکـان لەنـاو شـەقامەکان تەنهـا مـابوونەوە، ژنەکـان کەوتنەخـۆ بـۆ

کۆکردنەوەی شتەکانو چاککردنەوەی دارمانەکان، بەردیان کەڵەکە کردو دارەڕێیان کردەوە، منداڵەکان لەو دەشتەو لەبەر تیشکی خۆرەکەش چاوەڕوان بوون، ئەوانیش وەک مێروولەکاریان دەکرد، ئیسرائیلییەکان هەتا حکومەتی لوبنانیش لەگەڵ ئەودا بوون ئەو خێوەتگایانە تەخت بکرێت، چونکە ئەوان وایاندەزانی هەموو چالاکییەکان لەناو ئەو خێوەتگایانەوە سەر هەڵدەدات، ئەوێندەری سەرچاوەی بزاڤی شۆڕشەکەیە.

لەبەرئەوەی پیاوەکان یان رایانکردبوو یان گیرابوون، بۆیە هەموو کەلاوەکانی ئەو خێوەتگەیە بەژنو منداڵەکان چاکرایەوە. من لەوێ هەستم دەکرد کە سەربازە ئیسرائیلییەکان چەند لەو منداڵانە دەترسن، منداڵی تەمەن دەساڵەو یازدە ساڵە، ئەوانە توانای هەڵگرتنی چەکی قورسیشیان هەبوو، دەیانتوانی ئارپێچی بتەقێنەوە، مەسەلەکە وا ئاڵۆزو زەحمەت نەبوو، دەبابەکانیان لێوە دیاربووو چەکیشیان پێ بوو، بۆیەش سوپاکە بەشەو نەدەچوونە ناو خێوەتگاکە، تەنها بۆیان هەبوو بەرۆژ بچنە ناو خێوەتگاکە.

لەودەمانە هاوڕێیەکانم وایاندەزانی منیش کوژراوم، من دەنگم نەمابوو تا رۆژێکیان هاوڕێیەکم دۆزیەوەو تابلۆییەکانم بەو برادەرە بۆیان رەوانکرد، هاوڕێیەکانم لەرۆژنامەی ئەلسەفیر بەو تابلۆیانە زانیان کە من لەژیاندا ماوم. بەردەوام بیرم لەوە دەکردەوە من ئێستا چ بکەم، روو لەکام لا بکەم، تا بڕیارمدا بگەڕێمەوە بەیروت، بچمە بەیروت، کە رۆیشتم هاوسەرەکەمو منداڵەکانم جێهێشتو ماڵئاوایم لەوان کردو رۆیشتم، لەبەر دوو هۆ بۆم نەدەکرا بگەمەوە بەیروت، دیارە لەبەر

ئیسرائیلییەکان نەبوو؛ من ترسم زۆرتر لەهێزەکانی کەتائیب هەبوو، ئەوان منیان دەناسی، دەیانزانی من فەڵەستینییم، منیان بینیبووایە یەکسەر دەیانکوشتم. بەیانییەکی زوو سواری ئۆتۆمبێلێک بووم، لەناوچەیەکی دار زەیتونەدا دابەزیم، لەناوچەی ئەلشوەیفاتەوە بەپێ بەرەو بەیروت بەڕێکەوتم، هەر ئەو رۆژە چاوم بەنووسەری شانۆی سوری (سەعدوڵا وەنوس) کەوت، ئەو بەرەو دیمەشق دەڕۆیشت، ئەویش وایزانیبوو من کوژراوم، من نەماوم، بەکۆششێکی زۆر گەیشتمەوە ئەلسەفیر.

لەبەیروت چاوم بەهەردوو نووسەری فەڵەستینیی حەنا مقبل و رەشارد ئەبو شاوەر کەوت، ئەوان بەیەکەوە گۆڤاری (ئەلمعرەکە) یان دەردەکرد، لەو رۆژەوە من تابلۆم بۆ ئەوان و بۆ ئەلسەفیریش دەکرد، من بیرم لەوە دەکردەوە لەو دەمانە چ بکەم، چۆن بەرووی ئەو بۆردومانە بوەستین، ئێمە چ بکەین، لەو ئاگربارانە چ بکەین، کە لەهەر چوار لاوە ئاگر دەباری، لەئاسمانەوە ئاگر بوو لەسەر زەمینیش ئۆتۆمبێلەکان مینرێژکراو بوون، بۆیەش فەڵەستینییەکان دەیانووت لێرە مردن بوونی هەیە، هەموو هاولاتییەک بێدەسەلاتو کەمتەرخەم بوو، بۆیە بەئائومێدییەوە مردنیان دەخوازی و بەگەرمییەوە پێشوازییان لە مەرگ دەکرد. ئەزموونە تایبەتییەکەم نوێ بوو، ئێمە کارمان دەکرد بە وشەو بەنووسین ورەی خەڵکەکە بەرز بکەینەوە، مانشێتەکانمان و وێنەکان هەموویان بۆ جەماوەرەکەمان بوو، رۆژەکان سەختو دژوار بوو، گوللە تۆپەکان لەناو کونەکانی خۆشاردنەوەش دەگەیشتنە منداڵان، مانەوەمان بەرێکەوت بوو، مردنمان نزیکتر بوو لەژیان و ماندا، بواری خەمو

پرسەگرتنو بیركردنەوەش نەبوو، پاش ئەمانی بەرگرییەكەو تەسلیمبوونی چەكدارەكانو بینینی كوشتاری ئۆردوگاكانی (سەبرا)و (شاتیلا) من زۆر گریام، من ئەو دەمانە لەخەماندا نەگریام، من دەگریام تا بزانن منیش هاولاَتییەكی فەلەستینیم، من بۆ شەهیدەكان دەگریام، بۆ رەوشەكە دەگریام، هەستم بەوەحشیەت دەكرد. هاورِێیەكانم رۆیشتن كەسم لەگەلَدا نەما، من تەنها مامەومو مالَەكەم چۆلَ بوو، پێشتر كە لەشەقامەكاندا تێكۆشەرێكی میسرییم دەبینی، یەكێكی لوبنانی لەناو جەرگەی شاردا رووبەرووم دەبۆوە، فەلَەستینییەكو عێراقییەكم بەیەكەوە دەبینی، بەوانە من هەستم بەدلَۆڤانیو گەرمی دەكرد، ئەگەرچی هێزەكانی بەرگریش لە بەیروت دەرچوون من هێشتا هەستم دەكرد ئەو شارە رێزێكی تایبەتی گەورەی لەناخمدا هەیە. لەو رەوشە نوێیەدا هەستم دەكرد هیچم لەباردا نەماوە، چیتر ناتوانم گوزارشت لە هیچ بكەم، بروا ناكەم هیچ شاعیرێك هەبێت لەودەمانە بكارێت ئەو ساتانەی بەیروت بەرجەستە بكات، كەس بوی نەبوو وێنەكان بكات، تابلۆكان رەنگین بكات. رۆژی رۆیشتنی فیداییەكان كارەسات بوو، بینیم خەلَكەكە گولَبارانیان دەكردن، بینیم خەلَكەكە بۆ بەرێكردنیان ریزیان بەستبوو، نەمدەتوانی ئەودەمانە ببینم، بۆم نەكرا بۆ خوداحافیزیان بێمە دەرەوە، كە كەشتییەكە هاورِێیەكانمی باركردو رۆیشت، كارەساتێكی گەورەبوو، لەوێ وێنەی فیداییەكم كرد لە كەشتییەكە دادەبەزێتو بەمەلە دەگەرِێتەوە ناو بەیروتو دەلَێت، بەیروت غەریبیت دەكەم.

ناجی ئەلعەلی لەسەر گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانییدا بەردەوام دەبێتو دەڵێت،

کە گەڕامەوە هەستم دەکرد وا خەریکە لەناو خێوەتگەی عەین ئەلحلوەدا چالاکیی سیاسی سەرهەڵدەداتەوە، قەومییە سوورییەکان کەوتبوونە بزاڤی سیاسییەوە، هەستم کرد زۆربەی گەنجەکان کاریگەری بزاڤی قەومییە عەرەبییەکانیان پێوەیە، بەڵام خەڵکەکە کاریگەری ناسرییەتیان پێوە دیاربوو، هەموولایەک هیوایان بەوە هەبوو ڕۆڵی سەرکردایەتی جەمال عەبدولناسر زیندوو ببێتەوە. من لەساڵی ١٩٥٩ دەمویست بچمە ناو بزاڤی قەومییە عەرەبییەکان، بەڵام منو ئەوانیش هەستمان دەکرد کە من بۆ کارو چالاکی حزبایەتی دەست نادەم، لەماوەی یەک ساڵدا چوار جار لەبەر ئیلتزام نەکردنم بەدیسپلینەکانی حزبەوە دوور دەخرامەوە. لەو ڕۆژانە کتێبەکانی نەتەوەیی (ساتیع ئەلحوسەری)یم دەخوێندەوە، گەنجەکانی ناو بزاڤەکە ئەوەیان فێرکردبووم، دیارە گۆڤاری (ئەلحوریە)یشم دەخوێندەوە کە مانگانە دەردەچوو. هێشتا هیچ بەرهەمی غەسان کەنەفانیم نەدەخوێندەوە. جارێکیان ئەو لەکۆڕێکی خێوەتگەکەمان قسەی کرد، لەوێ قسەکانی کاری تێکردم، هەستم کرد ئەو بەڕاستی باس لەژانو کارەساتەکانی خەڵکو ڕۆژگارەکە دەکات، دیارە لەخەمە نیشتیمانییەکانمان نزیک بوو، بۆیەش لەو ڕۆژەوە دەستم کرد گۆشە سیاسییەکانی ئەوم لەگۆڤاری ئەلحوریە دەخوێندەوە. من هەرگیز پەیوەندییم بەناوەندە ڕۆشنبیرییە فەلەستینییەکانەوە نەبوو، تا ساڵێک پێش داگیرکردنەکە نەدەچوومە دەزگا کولتوورەکانی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی، پاش ماوەیەک

بوومە ئەندامی ئەمانەتی گشتی یەکێتی نووسەرانیش. لەو دوایانەدا هەستم دەکرد لەرووی کەسایەتیو تایبەتمەندییەکانو رۆشبیرییەکە لەقاڵبی فەلەستینی دوور دەکەوتمەوەو ئینتیمام بۆ ئەو رەوتە لاواز دەبوو، لەبەرامبەر ئەوەشدا ئاکاری نەتەوەییو مرۆڤایەتیم وەردەگرت، ئەوەش هەستکردن بوو نەک بڕیاردان.

من ئەوەم بەبێ سیماو کاردانەوەیەکی سیاسی لەلا دروست ببوو، لەودەمانەشدا کەسانی چواردەورەی من بەپێچەوانە دەردەکەوتن کەسێک باسی لوبنانییەتی خۆی دەکرد، یەکێکیتر سیمایە فەلەستینییەکەی دەردەخست، ئەوی تریان بەشانازییەوە دەیووت من سورییم، لەلای ئەوان بۆچوونی هەرێمایەتی دەردەکەوت، منیش دژایەتی ئەو پەرتبوونەم دەکرد، من دژایەتی ئەوانەم دەکرد، چونکە من وامدەزانی بوارێکی زۆرتر هەیە بۆ هەستکردن بەیەکێتی مەبەستو ئارەزووەکان، ئەوەش هەمووەمان دەگرێتەوە. لەسەرەتای هۆشیاری سیاسییم بوو کە لەگەڵ چەند کەسێک بیرم لەوە دەکردەوە رەنگە بکرێت ناوچەی ئەلخەلیل لەدەستی ئیسرائیلییەکان رزگار بکرێت. من ئەو دەمانەو ئیستاش بڕوام بەشەڕو بەرەنگاری میللی هەیە، چونکە من گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی کە کوفرە باس لەرژێمەکانو هەموو دەزگا سەربازییەکانو سیاسییەکانو ئیدارییەکانو هەتا کولتوورییەکانیشیان بکرێت، یان بڕوایان پێ بکرێت، چونکە ئەوان جێگای متمانە نین.

چ روو دەدات ئەگەر من خۆم لەبیربچێتەوەو کاس بم، یان ئەگەر کۆمەڵگەی خۆشگوزەرانیو نسکۆکانو راوانەکان منی گرتەوە...؟ دیارە ئەگەر منیش ئەوە بکەمو بگۆڕێم ئەوەم پێ ناگرێت، بۆم ناچێتە سەر،

چونکە کورەکە (حەمزەلە_ گوژالَک) لەهەموو تابلۆکانمدا بوونیان هەیە، ئەو بەردەوام چاودێریم دەکات من ترسی زۆرم لەو کەسایەتییە هەیە، ئەو هێمایەو ئەو بوونەوەرە گچکە ئامادەیە بەبێ ئەوەی ئاوڕێکیش بداتەوەو ئامادەیەو زۆریش بووێتە جێگای سەرنج و نیگا، هەموولایەکی سەرقالَکردووە، لەبەر ئەو گوژالَکەیە کە وێنەکانم نافرۆشرێن، ئەویش لەناو تابلۆکانمدا جێگیر بووەو ناڕوات. ئەوانو زۆریش کۆششیان کرد من بکەنە نیگارکێشی هۆزەکان، عەشیرەتەکان دەستەمۆ بکەن، من لەدژی رژێمێک لەلایەن ئەوانی ترەوە بەکاربهێنن، بەلاَم من چۆن بتوانم ئەوە بکەم ئەگەر گوژالَکەکە بەردەوام بەدوامەوەیە، ئەو چاودێریم دەکات، من لەبەر ئەو هیچم پێ ناکرێت.

نیگارکێشی بۆ من بووێتە پیشەو کارو هەلَوێستێکی پیرۆز، ئەگەرچی من ماوەیەکی زۆرە کاری نیگارکێشی دەکەم، بەلاَم تا ئیمڕۆش زۆر لەبەرهەمەکانم رازی نیم، دەستەلاَتم بەسەر زمانەکەی ئەشکاوەو بێدەستەلاَتم، چونکە ئەرکەکەم قورسە، من تەنها بەو تابلۆیانەو بەو هونەرییە کە دەکارم هاوسەنگی خۆم راگرم، ئەوەیان بووێتە پرسەکەم، بووێتە ژانێک لەناو هەناوەدا، هەندێ جار من لەبەر خۆمەوە دەلَێم رەنگە من کە وێنە کاریکاتێرەکان دەکەم بەختیار بم، چونکە بەوەیە من هەناسە دەدەم، من بەوەیە کە دەژیم، خەلَکێکی زۆریش لەخەفەتا گیانیان دەردەچێتو دەمرن، خەمی سەر دلَیان گەورەیەو نارەوێتەوەو رۆژانە هەناسە سوارن، من دەزانم هونەرەکەم دلَم دەداتەوەو سەرەخۆشیم پێ دەلَێتەوە. من وا دەزانم کاریکاتێر زمانی لێدوانو تێگەیشتنە لەنێوان خەلَکەکەدا، زمانی تەبشیرو روونکردنەوەیەو رەخنە دەگرێت،

هونەرەکەم بۆ گاڵتەو بەزمکردن نییە. من خۆم بەجۆرێک لە نەشتەرگەر دەزانم، ئەوە رەشبینیو ژانو خەمەکانی ناو وێنەکانمن کە حاڵەتێکی پاکو هاوبەشە لە نێوان منو هاوڵاتیاندا، بەتایبەتی ئەوانەی ئەو رەوشە عەرەبییە نالەبارە بێزارو شەرمەزاریان دەکات.

* * *

تا ئەو کۆمەڵگا خۆشگوزارییە کارم تێ نەکات لەکوێت کەسایەتی گوژاڵکم دۆزیەوە، ویستم وێنەکانم هیچ پەلارو توانجی لەگەڵدا نەبێت. مەبەستیش پەیداکردنی نیشانەو هێمایەک بوو بۆ گرێدانی پەیوەندی پتەو لەنێوان منو خوێنەرەکانم، زۆرجار بیرم لەوە کردۆتەوە وردە سەرەنجەکان بنووسمەوە، بارانە حیکاتەکان بڵێمەوە، بانگەوازێک... مانیفێستێک بنووسم... من دەمویست بۆ خەڵکەکە بانگێک بدەم، دەبوایە بەروونیو بەئاشکرا پەیامەکەم رابگەیەنم، وامدەزانی ئەوەم بەتابلۆکانم پێ دەکرێت، بەڵام نازیش لەسەر خوێنەرەکانم نەکەم، خۆم بەگەورە نەبینیم، دیارە رەمزەکانیشم بەکارهێناوە، من مەبەستم بوو پەیامەکەم بۆ هەژارەکان بێت کە لەخانەی یەکەمی رێزبەندییەکەی منن دڵسۆزانە بگەیەنم. هونەرمەندانی میسر (سەلاح چاهین)و (رەجائی)و (بەهجەت عوسمان) جێگەی سەرەنجی من بوون، ئەوانە ئەودەمانە کەسانی پێشەنگ بوون، بەتایبەتی ئەوانەی لەقوتابخانەی گۆڤاری (روزال یوسف) بوون، هەروەها ئاگاشم لەهونەرمەندانی لوبنانیش هەبوو لەوانە (بەیار سادق)و (نیازی جەلول)و (مەلحەم عیماد)و (جان

مەشعەلانی)، بەلام ئەوانە هیچ کامیان کاریگەرییان لەسەر من نەبوو، ئەگەرچی من هەستم دەکرد بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر من دانابوو، لەسەرەتاوە وامزانی کە من لەچاو ئەوان حاڵەتێکی جیاوازم، من شێوازی تایبەتی خۆم هەیە، ئەو ڕێبازەی کە لەپەیامەکەمدا دیارە، بەوەیان ڕووبەڕووی خوێنەرەکانم دەبمەوە، دیارە ئەوەش نیشانەی سەرکەوتنە، یان بەوەش سەرکەوتم کە کارەکانم عەفەوییەنو لەخۆڕا دەردەچن، ئەوەش لە هێماو مەبەستەکانمدا دیارن، لەگەڵ ئەوانەش بەسادەییو هەرەمەکی دەردەکەون.

شەڕەکە بەردەوامەو منیش هیوام بەرزە، هەست دەکەم بەهەر شێوەیەک بێت ئێمە دەگەینە مافەکانمان، خۆم لەڕووی خەڵکە سادەکانمان بەلاواز دەبینم، من کە کەسی ناو ئەستێرەکانو پایەدار نیم، وادەزانم دەبێ خەڵکەکە شۆڕشگێڕ بێت، بەرێز بن، دیارە مەعقولیش نییە بوار بدەینو خۆمان نەوی بکەین تا خەڵک سواری پشتمان بێتو لەسەر شانمان سەرکەون. من دەزانم لەو کاروانەدا دەمێنمەوەو بەردەوام دەبم، من ژووانم لەرەهەندێکی ترەوە هەیە، ئەگەرچی شوێنەکەش دوورە، بەلام من پاش ناکەوم، ڕۆژێک دێ دەگەمە ئەوێندەرێ، ئاوارەکانی تاراوگەکان وێنەی ولاتیان لەناو چاویاندا هەڵگرتووە، (فاتیمە)ی فەڵەستینی هەموو خەمەکانی خێوەتگاکانی پێیەو بەو بارەوە دەناڵێنێت، ڕۆژێک دێ ئالای فەڵەستین لەولاتدا دەشەکێتەوەو دەگەینەوە ناو خاکی خۆمانو بەردەوام دەبین.

# سەربردەی گوژاڵکەکە

کوڕە گوژاڵکەکەی خێوەتگەی عەین ئەلحلوە بۆ ماوەی بیست ساڵ تابلۆ هونەرییە کاریکاتێرەکانی ناجی ئەلعەلی نەخشاند بوو، کوڕەکە بەمەراقەوە دەیڕوانییە ڕووداوەکان، سەرساموو بەنارەزاییەوە دەیڕوانییە تابلۆیەکان. کەسایەتییەکە بێدەنگی نەریتیو شاهێدی نارەزاییەکان بوو، بەڵام کەسایەتییەکە دەگۆڕا بۆ کەسایەتییەکی دەگمەنو چالاک، ئەو بەردەوام قسەی هەبوو، بەردی هەڵدەگرتەوەو دەیهاویشت، لەبەرئەوەی ناجی سووربووە لەسەر بەکارهێنانی ئەو کوڕەو بۆیەش ڕەنگە لەلای ئەو مانایەکی هەبووبێت، کوڕەکە ڕەمزێکو سونبلێک بووە لەهزرو هونەرەکەی ئەو، ڕەنگە هێمای منداڵی خۆی بێت کە لەوڵات دەرکراوەو دەرپەڕیوە، ساتی راکردنو دەربازبوونی خۆیەتی، کوڕی یەکەمی ناجی ئەلعەلی ناوی (حەنزەلە) بوو. تا باشتر کەسایەتی (حەنزەلە) بناسین، هێماکانی بدۆزینەوە، عەلی لەسەر زاری ئەو وتوویەتی، بەو جۆرەش پێناسەی خۆی کردووە:

❖ ناو: (حەنزەلە)، ناوی باوکم گرینگ نییە، دایکم.. نسکۆیەو خوشکە گچکەشم ناوی فاتیمەیە.

❖ ژمارەی پێڵاو: ژمارەی نییە، چونکە من بەردەوام پێخاوسم.

❖ مێژووی لەدایکبوون: من لەرۆژی ٥ ی یونیۆی ساڵی ١٩٦٧ لەدایکبووم.

❖ رەگەزنامە، من فەلەستینی نیم، ئوردنیش نیم، کوێتیش نـیم، میسریش نـیم،... بەکورتی ناسـنامەم نییەو، بەتەماش نـیم رەگەزنـامە وەرگرم، ئەوەندەم بەسە کە من عەرەبم.

ناجی ئەلعەلی دەڵێ:

(حەنزەلە) لەتەمەنی دە ساڵییدا لەدایکبووە، تەمەنیشی هەر بەدە سـاڵی دەمێنێـتەوە، لەو تەمەنەش بـووە کە وڵاتـی جێهێشـتووە، کە دەگەڕێـتەوە تەمەنـی دەگـاتە سـەرووی دە سـاڵی، لەودەمـانەوە گەورە دەبێـتو تەمەنـدار دەبێت، یاسا سروشـتیە باوەکـانی کـۆمەڵی لەسـەر ناچەسـپێت، ئەو کەسـێکی ریـزپەڕە چـونکە گومبـوونی وڵات ریـزپەڕییەکەیە. کە دەگەڕێـتەوە وڵات مەسـەلەکان ئاسـایی دەبێـتەوە، منداڵ هەڵویستێکی نموونەییە، نەک تەنها بـۆ منو بەس، بەڵکو بـۆ ئەو حـاڵەتەی کە مـنو ئەو کـۆمەڵەی منـی تێـدا دەژیـت، مـن ئەوەم بەخوێنەرەکانم ناساندووە وەک رەمـزی تـاڵیو نەهامەتییەکـان، سـەرەتا وەک منداڵێکی فەلەستینی پێناسەم کردبوو، ئەو بـاش گەشـەی کـردووەو بـوویتە نماینـدەی هۆشـیاریی بـۆ ئاسـۆیەکی نەتەوەیـی، پاشـان بـووە بەرەمزێکی مرۆیی. سەرەتا کە وێنەم دەکێشا ئەو رووی لەخەڵکەکە بوو، کلاشینکۆفی پێبوو، بەردەوام دەجوڵایەوەو رۆڵێکـی راسـتەقینەی هەبـوو، بەهەردوو زمانی ئینگلیـزیو عەرەبـی دەمەتەقێـی دەکـرد، تـا وای لێهـات کاراتیەی دەکرد، گـۆرانی دەچـری، هـاواری دەکـردو بـانگی دەداو مـوژدەی شۆڕشی دەگەیانـد. لە چەنـدین حـاڵەتی دەگمەنو لەکاتی راپەڕیـنەکەی کەنـاری خۆرئـاوا بەردی هەڵـدەگرتەوەو لەدوژمنەکـانی دەدا، کە هێـزی بەرگریی فەلەستینیەکان لەناو شاری بەیروت دەرچوون دەستی ئەو شارە

برینداره‌ی ماچ ده‌کردو گوڵی پێشکه‌ش ده‌کرد. منداڵه‌که ده‌سته‌کانی له پشتی خۆی گرتبوو، من به‌وه‌یان خه‌ڵکه‌که‌م هار ده‌کرد، پاش شه‌ره‌که‌ی ئۆکتۆبه‌ری ساڵی ١٩٧٢ کوڕه‌که‌م قۆڵبه‌ستکرد، له‌وده‌مانه ناوچه‌که له‌پێش رووداوێکی نوێ بوون، بیریش له‌پرۆسه‌یه‌کی ئارامکردنه‌وه‌و ساردبوونه‌وه ده‌کرا، هێشتا سه‌رۆکی میسری ئه‌لسادات سه‌فه‌ره‌که‌ی نه‌کردبوو، قۆڵبه‌ستنی ئه‌و منداڵه‌ش له‌لای من گوزارشتی له نارەزایی‌و نه‌ویستنی ئاساییکردنه‌وه بوو، دژی چاره‌سه‌رو دانوستانه‌کان بوو.

(حه‌نزه‌له) شاهیدی سه‌رده‌مه‌و نامرێت، ئه‌و شاهیده‌یه که به‌ناخۆشییه‌وه ده‌چێته ناو ژیان‌و دوورناکه‌وێته‌وه، ئه‌و شاهێدێکی ئه‌فسوناوییه، که‌سێکی نه‌مره‌و مردن ناناسێت، بۆ ژیان له‌دایکبووه، به‌رگریش بۆ مان‌و به‌رده‌وامی ده‌کات، دیاره ئه‌و بوونه‌وه‌ره پاش منیش ده‌ژیت، نامرێت به‌رده‌وام ده‌بێت.

## بکوژه‌که

هه‌ندێک که‌س ده‌ڵێن ئیسرائیل ده‌ستی هه‌بووه له تیرۆرکردنی ناجی ئه‌لعه‌لی، به‌ڵام هه‌ندێکیش ده‌ڵێن رێکخراوی رزگاریخوازی فه‌له‌ستین ده‌ستی له‌و تیرۆره‌دا هه‌بووه‌و ئه‌وان ناجییان تیرۆرکردووه. به‌پێی قسه‌ی ژماره‌یه‌ک له هاورێیه‌کانی ناجی که بۆ (بی بی سی) قسه‌یان کردبوو، ئه‌ویش له‌راپۆرتێکی تایبه‌تییدا بڵاویکردۆته‌وه که ئه‌وان وتوویانه، چه‌ند هه‌فته‌یه‌ک پێش تیرۆرکردنه‌که ناجی له‌لای ئه‌وان

وتوویەتی بەرپرسێکی ڕێکخراوەکە داوای لەو کردووە ڕێبازە سیاسییەکەی بگۆڕێت، بەڵام ئەلعەلی کوڕی خێوەتگە فەڵەستینییەکان، ئەوەی ژانی دیــوەو کــۆچی پێکــراوەو ڕازی نەبــووە تەســلیمی ئەوان ببێــت، لە داهێنانەکــانی نەکەوتــووەو پاشــگەز نەبــووە، بەو مەرجەی ئەوان ڕازی نەبووەو، بەردەوام وێنەی کاریکاتێری بەرووی سەرۆکی ڕێکخراوەکە یاسر عەرەفاتو دەستەکەی کردووەو سووریش بووە لەسەر ئەو ڕێبازە.

گۆڤــاری ئەلئەزمــنەی عەرەبیــیە کە لەقــوبرس دەردەچــوو، لەژمــارە ١٧٠ی، کە لەمــانگی ئۆگســتی ســاڵی ١٩٨٧ دەرچــووە، دیمــانەیەکی لەگەڵ نــاجی ئەلعەلــی بەئامــادەبوونی ئــوم خالیــدی هاوســەرییەو، لەمــاڵەکەی خۆیــدا لە لەنــدەن ســازدابوو، دوو ڕۆژیــش پــێش تیرۆرکــردنەکەی بڵاوکراوەتەوە، لەوێدا ئەو وتوویەتی:

لەســاڵی ١٩٧٥ عەرەفــات لەپــێش قوتابخــانەی عەبــدوڵڵا ئەلســالم لە کوێت قسەی بۆ خوێندکارەکان کردووەو وتوویەتی:

ئەو ناجی ئەلعەلی کێیە...؟ ئاگاداری بــکەنەوە کە چیتــر ئەو جۆرە وێنــانە دروســت نەکــات، ئەگەر لەو وێنەکــردنە بەردەوام بێــت پەنــجەی لەناو ترشی ئەسید دەنێم.

لەهەمان دیمانەدا ئەلعەلی وتوویەتی:

ئایــا دەزانــن ڕەشــیدە مەهــران کێــیە...؟ وا مەزانــن ئەوە کیــژە فیــداییەکەیە. ڕەشــیدە مەهــران ئەو ژنەیە بــۆی هەیە ســواری فــڕۆکە تــایبەتییەکەی ســەرۆکی ڕێکخــراوی ڕزگــاریخوازی فەڵەســتین ببێــت، ئەو لەتونس لەناو کۆشکێکی تایبەتیدا دەژیت، ئەو دەسەڵاتی نزیکبوونەوەو دوورخستنەوەی لەنــاو ڕێکخــراوەکەو هەمــوو دەزگاکانیــدا هەیە، دەســتی

باش دەڕوات... من وێنەم لەسەر ئەو ژنە کردووە، پاش ئەو وێنەیە چەندین هەڕەشەم پێ گەیشتووە، چەندین کەسیش دەستخۆشیان لێم کردووەو پیرۆزباییان بۆم ناردووە. بڕوا بکەن یەکێک لەلایەن کەسایەتی (ئەبو ئەیاد)ەوە خۆشحاڵی پێراگەیاندم، ئەو وتبووی ئێمەی گەورەکان لەناو ڕێکخراوەکەمان بۆمان ناکرێتو حەزمان لێیەو دەسەڵاتمان نییە بیکەین، ئەو بەوێنەکانی خۆی دەیکات، بەڵام وادەزانم ئەمجارەدو بەو وێنەیە هێڵی سووری بەزاندووە، بۆیەش ترسم لەو هەیە، با ئاگای لەخۆی بێت. منیش وەڵامی ڕاسپاردەکەم دایەوەو وتم:

برایەکەم ئەگەر ئاگام لەحاڵی خۆم بێت، کاتی ئەوەم نامێنێت ئاگام لەمێوە بێت.

## مەحمود دەروێش

پاش ئەوەی ئەو وێنەی کاریکاتێری ژنە دۆستەکەی عەرەفاتی کردبوو، ئەو ژنەی بەوە دەناسراو ئەو قسەیەی لەسەر بوود، هونەرمەندی شەهید ناجی ئەلعەلی تابلۆیەکی تری لەسەر مەحمود دەروێش بەناوی (دەروێش دوا بێ ئومێدییەکانمە) کردبوو، لەو ڕۆژەش ناکۆکی تەواوی ڕاستەقینە دەکەوێتە نێوان هاوڕێی هەزارانو شاعیرەکە بە کەسێکی پەراوێزخوازو پارێزگار لە هەڵوێستە نیشتیمانییەکان دەناسرا پەیدا دەبێت. دەروێش پەیوەندی بەناجی دەکاتو هەڕەشەی لێ دەکات، ئەویش دەقی قسەکانی ئەو لەگۆڤاری ئەلئەزمنەی ئەلعەرەبیە بڵاودەکاتەوەو ئابڕووی دەبات، قسەکەش ئەوە بووە کە دەروێش

هەرەشەی لێ کردبووو وتبووی:

بەڵام ناجی تۆ بەقەد من نیت، دەرەقەتی من نایەیت.!

ناجیش وەڵامی داوەتەوەو وتوویەتی:

دەرویش مەبەستت چییە...؟ من لەو بابەتە تێناگەم، مەسەلەکە بە قەد تۆو خەڵکی تری لێهاتو. ، بەو خودایە کە من وێنە دەکەم حیساب بۆ قەدی کەس ناکەم، تۆش ئەی مەحمود ئەوە باش دەزانیت.

دەرویش بەتوورەیی وەڵامی دەداتەوەو وتوویەتی:

من پێت دەڵێم ناجی تۆ بەقەد من نیت، تێبگە.!

ناجی: بەو خودایە من هیچم نەدەزانی وا لەو رۆژانە لەشتەکان حاڵی دەبمو زۆر شت فێر دەبم، وایەرمکانم بەیەک کەوتوونو شۆرت دەکەن، بۆم روون بکەرەوە دەی بابزانم مەبەستت چییە...؟

مەحمود دەرویش (بەتەحەداوە): تۆ دەزانی من کێم...؟

ئەلعەلی: مەحمود دەرویش شاعیری تیرو ددان.

دەرویش (بەتوورەییەوە): لەوەش زۆرتر...؟

ناجی ئەلعەلی (بەفیزو بەلەخۆباییەوە): من نازانم، چ رووی داوە لەو رۆژانە چ بووە، دیارە مەحمود بوویتە سەرلەشکرو ئێمە ئاگامان لەوە نییە، ها مەحمود چی بووە...؟

دەرویش (بەتەحداوە): ئێستا کاتی گاڵتەو فشە نییە، دەمەوێ ناجی ئەوە باش بزانیت من ئەو کەسەم دەتوانم لەو لەندەنە دەرتپەڕێنم، من دەتوانم.!

لەو ڕۆژەی ئەو هونەرمەنــــدە تیرۆرکــراوە پرســیارێک ئامـــادەیەو وەڵامەکەی دیار نییە ئایا کێ نـاجی ئەلعەلی تیرۆرکرد...؟ دیـارە هەمـوو لایەک ئەوە بـاش دەزانــن کە ئەو لەشـەقامێکی لەنـدەن تیـرۆر کـرا، لەو کێســەدا ســێ کەس ناویــان هــاتووە، ئەوەش لەدۆســییەکانی دەزگــا ئەمنییەکـانی بەریتـانییەوە دیـارە، لەوانە (بەشـارە سمارە)و (ئیسماعیل سەوان)و (عەبـدولرەحمان مەسـتەفا) بـوون. یەکەمیـان ئاگـاداری ئەوە بـوو کە کــێ تیرۆرکــراوە، پاشــان رادەســتی ئیســرائیل کــرایەوە. دووەمیــان کەسێکی بەکرێگیراوی مۆساد بووەو خزاوەتە ناو هێزی ١٧ی فەڵەستینیو لەسەر ئەوەی چەکی هەبـووە ١١ سـاڵ حـوکم دراوە، بەڵام ئەو بەو تیـرۆرەو بەیارمەتیدانی تاوانبار نەکرابوو. کەسـی سێیەمیشیان ڕەنـگە ئەو تەقەی لەنـاجی کـرد بێت، ئەویـش ئەنـدامی هێـزی ١٧ ی فەڵەسـتینی بـوو، کە پاش ڕووداوەکە دیار نامێنێت، دەڵێن لەبەریتانیا دەرچووەو گەیشتووەتەوە ناو ڕێکخستنەکانی ڕێکخراوی رزگاریخوازی فەڵەستینیو لەوێشەوە هیـچ شوێنەواری نەمـاوە. ئەوانەی بایەخیـان بەو کێشـە دەداو خەمـی ئەوەیـان بـوو بـزانن کێ بکوژی نـاجییە، دەڵێن هەمـوو لایەنە فەڵەستینییەکانو ئیسـرائیلییەکانو بەریتانییەکـان بەردێکیـان لەسـەر ئەو کێشــە دانــاوەو بەیەکجاری دۆزەکەو خوێنەکەی ئەو لەبیرکراوە.

ئەگەر ورد لەتابلۆو مەبەستەکانی ئەو ورد ببیتەوە دەزانیو دیارە کێ ناجی کوشتووە، کـام لایەن دەسـتیان لەو تیـرۆرەدا هەبـووە. لەوێنەکانیـدا دیارە کە ئەلعەلی چەنـدین لایەنـی دەولـیو حزبـی پێکـاوەو توانجەکـانی گەیشــتووەتە دامەزراوە سیاســییەکانیش، کەســایەتییەکانی گۆڕەپــانی

سیاسی، لەبەر ڕۆشنایی بەرگریی لەکێشەی ڕەوای میللەتەکەی لەهیچ لایەنو بزافو حزبێک نەترساوە، بەردەوام خەونی بەکێشەی میللەتەکەیەوە بینیووە کە لەپاش ساڵی ١٩٤٨ تەشەنەی کردوومو ئەو دەنگی ڕەوای مافی فەڵەستینی بێ ڕکابەرایەتی بووە.

# بەزاندنی هێڵە سوورەکان

ناجی لەو ساڵانەی دواییداو پاش نسکۆی فەڵەستینییەکانو دەرچوونیان لە بەیروتو ڕۆیشتنیان بەرەو تونسو ڕازیبوون بەمەرجە دەولییو تەنازولە بەردەوامەکان بەرووی بڕیارە عەرەبییەکان، ئەو کۆڵی دڵی خۆیو توورەبوونەکانی بەوێنەکانو بەسەرکردایەتی فەڵەستینی دەرکردووە. ئەو وێنەی سەرکردەکانی ئەو بزافەی بەورگی گەورەو بەکەرشەوە دروستکردووە، عەگالەکانی ئەوانی کردبووە کڵاوی ئەمریکیو بەردەوام ملپێچی نازداری لە مل کردوون، لەوێنەکانییدا دیارە کە ئەوانە پاشەڵیان بۆ ئەرز شۆڕبوویەتەوەو لە ئەرزا خشاوەو قاچیان کورتە، ژمارەی بڕیارە دەولییەکانو دانپێدانانەکانیان بەدوژمنەکانو لەبیرکردنی مافە ڕەواکانیان لەسەر سینگیان نووسیوە، بڕیارو بۆچوونە سیاسییەکان کەوتوونەتە بەر تیشکی گەورەکەری خامەی ناجی ئەلعەلی کە پێویستی بەهیچ لێدوانو ئامازەیەک نەبووە.

ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی ڕەوشی ئاڵۆز دەبێت، بەتایبەتی

کە لە بەیـروت دەردەچـن‌و گەیشـتوونەتە تەرابلـس، تـا شـەڕی نـاو خێوەتگاکان، لەودەمانەی ناکۆکیی‌و ململانێیەکانیان گەشەیان کردبوو، کارتەکـان تـێکەڵ ببـوون، بـۆیەش بڕیـارو ڕێکخسـتنەکان‌و گوتارەکـان سەرلەنوێ دادەرێـژرانەوەو نـوێژەن دەبـوونەوە. دیـارە کە دۆسـییەکە بەو شێوەیە بووە ئیدلرەکەش نالەبارە بـووە، لەنـاوەوەدا گەنـدەڵی‌و لاوازیـیش دیاربوو، بـۆیەش هەمـوولایەک لە وێنەکـانی ئەو نـیگەران‌و تـووڕە دەبـوون. چەنـدین لایەن ئامۆژگـاری ئەویـان دەکـرد، کە لەدەربڕینەکانـدا نەرم بێت، هەڕەشەیان لێ کردووە تا دەستبەرداری ئەو وێنـانە بێـت، بـۆیەش خاوەنی ئەو ڕۆژنامەیەی ئەو لەکوێت کاری تێدا دەکرد ناچـاری دەکـات لە کوێتەوە بچێـتە لەنـدەن، لە وێشـەوە وێنەکـانی تیـژو کـاریگەربوون، ئەو ڕۆژانەو لەهەمـوولایەک هەڕەشـەی تونـدی ئاراسـتەکراوە، تـا ئەو ڕۆژەی پووشی سەر پشتی حوشترەکەی دوولەتکردووەو لەڕۆژی ٢٤ ی یونیۆی ساڵی ١٩٨٧ی ڕۆژنـامەی ئەلقەبەسـدا وێنەیەکـی کـردووەو نـاوی یەکێکـی لە توێژەرە ژنەکانی هێنـاوەو بەنـاو نـاوی هێنـاوە، ئەوەش کـاریگەری لەسـەر یەکێتـی نووسـەران‌و ڕۆژنامەنووسـانی فەڵەسـتینیش کـردووە، کە ئەو لەیەکێـک لەسـەرکردایەتییە دیارەکـانی فەڵەسـتینی زۆر نزیـک بـووە، سـەرەتا داوای لێکـراوە لەرۆژنـامەکەوە داوای لێبـووردن بکـات، ئەگەرنـا گیانی دەکەوێتە مەترسییەوە، دیـارە داوای لێبووردن هەرگیـز لەمێشکی خەیـاڵی کەسـێکی وەک نـاجی ئەلعەلیـدا نەبـووە، بـۆیەش بەو ڕێبـازەو لەسـەر ئەو بەرنـامەیەو بەبـێ ئەوەی هـیچ گـوێ بـداتە هـیچ لایەنێـکو ترسـی هەبێـت لەسـەر ڕێبازە ڕەخنەگرییەکانیـدا بەردەوام دەبێـت، تـا بەیانی ڕۆژی ٢٢ ی یولیۆی ساڵی ١٩٨٧ بە فیشەکێک دەکەوێـتە سـەر ئەرزو

تـا ٢٨ رۆژ دەبـووریتەوە، دیـارە کە ئەو چـارەگە سـەدەیەک بەخـامە نەترسـەکەی بەرگـری کـردووە، بەڵام جەسـتەکەی ئەو بەرگـری ئەو فیشەکانەی نەکردو برینەکەی بەکراوەیی مایەوە.

# مارشاڵ رۆمڵ

مارشاڵ رۆمل خۆی دەکوژێت، یان دەکوژرێت...؟

مارشاڵ ئێرڤین رۆمل یەکێک بوو لەسەرکردە سەربازییە ناودارەکانی سەدەی بیستەم، لە جەنگی دووەمی جیهانییدا بەناوی (رێوی بیابان) ناودارببوو، ئەو ناوەشی لەوە وەرگرتووە کە لە هونەرە نوێیەکانی شەڕی دەبابەکانـدا زۆر لێـزان بـووە، پـلانە سـەربازییەکانی ئەو لەخێرایـیـو تیژییدا بێ وێنە بووە، ئەو وەک بروسکە گەیشتووتە سەر دوژمنەکان، لەجەنگەکانی دووەمی جیهاندا لە باکووری ئەفریقیاو ئەلعەلەمێندا ناوی زۆرتر دەرکردووە.

شێوەی تیرۆرکردنی رۆمل زۆر سەیر بووە، بەڵام ناوی ئەو لە لیستی تیرۆرەکانـدا نییە، گوایە ئەو نەکوژراوە بەڵکو خۆی کوشتوە، ئەوەش شێواندنی بەشێکی مێژووە، چونکە کۆتاییەکەی ئەو زۆر کارەساتبار بووەو تراژیدیاکەی ئەو یەکێکە لەنموونە دەگمەنەکانی مێژوو.

رۆمل لەرۆژی ١٥ ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٨٩١ لەشاری هایدنهایم لەناو چوار برادا لەدایکبووە، باوکی مامۆستای دواناوەندی بووە، ئەو زوو حەزی لە دروستکردنی پەرەشووتو ئەندازیاری کردووەو شەیدای ئەوە بووە لەو بوارەدا شکۆیەک بۆ خۆی بنیات بنێت، بەڵام دایکو باوکیان بەو ئارەزووەی ئەو دڵیان خۆش نەبووەو پشتیوانیان نەکردووە، بۆیەش ئەو بوارو کاروانی ژیانی دەگۆڕێتو لەساڵی ١٩١٠ دەچێتە بواری سەربازی، تا لەسوپای ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیدا لەتەمەنی بیستو پێنج ساڵییدا پلەی ئەفسەری وەردەگرێتو لەخوارووی ئەڵمانیادا مەشق بەسەربازانی پیادەیی دەکات. رۆمل لەجەنگی یەکەمی جیهانی لەساڵی ١٩١٤ دا بەشدار دەبێت، لەساڵی ١٩١٥ میدالیای خاچی ئاسنین وەردەگرێت، شەڕەکەش چاش رێکەوتنامەی فرسای کۆتایی پێ دێتو لەئەنجامی شکستەکەیاندا سوپای

ئەڵمانیا بە ژمارەی تەنها سەد هەزار سەرباز سنووردار دەکەن، ئەو لەو بوارەدا دەمێنێتەوە بەڵام لە بواری وانە وتنەوە لە قوتابخانەی مەشقی پیادەیی تا دەگاتە پلەی وانەبێژ لەزانستەکانی شەڕی تاکتیکی لەقوتابخانەی جەنگییدا.

هیتلەر لە مانگی یەنایەری ساڵی ۱۹۳۳ دەگاتە لوتکەی دەسەڵات، ئەو رۆملی وەک کەسێکی دڵسۆز ناس دەکات کەلەساڵی ۱۹۳۸ پلەی عەقیدی هەبووەو یەکێک بووە لە دەستەی پاسەوانی تایبەتیدا، کە زۆر بەو ئەفسەرە سەرسام دەبێتو بڕیار دەدات لەساڵی ۱۹۳۹ رۆمل بکاتە بەرپرسی سوپایی لە نەمساو چیکۆسلۆفاکیا. لە جەنگی دووەمی جیهانیدا سوپای ئەڵمانیا بەسەرکردایەتی رۆمل لەساڵی ۱۹٤۰ بەسەرکەوتوویی فەرەنسا داگیر دەکات، هاوشانی ئەو جەنگە سوپای ئەڵمانیا لە رۆژانەی جەنگی دووەمی جیهانییدا لە هەموو ئەوروپا سەرکەوتنی بێ وێنە تۆمار دەکات.

## رۆمل لەئەلعەلەمێندا

هیتلەر ئەوەی لە رۆمل رادەبینی بۆ یارمەتیدانی هاوپەیمانە ئیتاڵیاییەکان لەکۆلۆنیلەکانیان لەلیبیا بەرووی هێرشەکانی بەریتانیا رەوانەی ئەوێندەرێی بکات، لەمانگی فبرایەری ساڵی ۱۹٤۱ فەرمان دەدات بکرێتە سەرکردەی باڵای سوپای ئەڵمانی لەباکووری ئەفریقیادا، بۆیە ئەو دەچێتە فەرەنساو لەوێ فەرمانەکەی لە بیابانی ئەفریقی وەردەگرێت، دیارە نەبەردییەکەشی بۆ ئەوە بوو لێشاوی هێرشەکەی

بەریتانی لەو ناوچەیەدا رابگرێت.

رۆمل لە باکووری ئەفریقیا چەندین شەڕی ئازایانەو لێزانانەی کردبوو، لەئەنجامدا نازناوی رێوی بیابان وەردەگرێت، بەوەش توانی وڵاتی لیبیا لەناو کەڵبەی بەریتانییەکان دەربهێنێت، لەئەنجامی شکانی سوپای بەریتانییەکان لەتەبرق ژمارەیەکی زۆری هێزەکانی بەریتانی تەسلیمی سوپاکەی رۆمل دەبن، کە ژمارەیان دەگەیشتە ۲۰ هەزار سەرباز، رۆمل بەوە نەوەستاوەو لەمیسر بەدوای هێزەکانی بەریتانیا دەکەوێت کە بنکەی سەرەکیان لەو ناوچەیەدا بووە. لەبەر ئازایەتییەکانی ئەو لەو شەڕانەدا هیتلەر پلەی مارشاڵی لەرۆژی ۲۲ ی یونیۆی ساڵی ۱۹٤۲ پێ دەبەخشێت، بەوەش ئەو گچکەترین ئەفسەرە لە سوپای ئەڵمانی ئەو پلەیە وەردەگرێت. رۆمل بەرەو وڵاتی میسر هێرشەکانی بەرە پێداوەو زیانی کوشندەی لەلایەنی بەریتانی داوە، تا سوپاکەی گەیشتووتە شاری مەرسە مەتروح، تەنها ۱٥۰ کیلۆمەتری مابوو بگاتە شاری ئەسکەندریە، دیارە بەوەش زۆری نەمابوو سوپاکەی ئەڵمانیا بەسەرۆکایەتی مارشاڵ رۆمل بگاتە قاهیرەی پایتەختی میسر، بۆیە لەدەروازەی ئەلعەلەمێندا دەوەستێت، لەوێشەوە چاوەڕوانی یارمەتیو زۆرترین چەکو سوپای دەکرد تا بچێتە ناو پایتەختی میسرو لەوێشەوە بگاتە کەناڵی ئەلسوێس، بەڵام لەودەمانە هیتلەر لەلای رووسیادا بەرەیەکی تری جەنگی دەکاتەوە، دیارە ئەوەش سوپاو جبەخانەیەکی زۆری دەویست، بۆیە نەدەکرا یارمەتی سوپاکەی رۆمل بدات تا بەرەو کەناڵی ئەلسویس پێشڕەویی بکات.

لەبەرەو شـەڕی ئەلعەلەمێنـــدا گـۆڕانێکی جەوهەری لەبەرەکانـــدا پەیدا دەبێت، لەپاش گرتنی تەبرەقیش ئەمریکا بڕیار دەدات بەشداری شـەڕەکە بکـاتـو یـارمەتیو سوپا بـۆ پشـتیوانی بەریتانییەکـان رەوانەی باکووری ئەفریقیـا بکات، بـۆیەش ناهاوسـەنگی دەکەوێتە نێوان هەردوو سـوپای شـەڕکەری ئەڵمانیـاو بەریتانیـا، بەوەش دەشـتاییو ئاسـمانی ناوچەکە دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی بەریتانییەکان، لەهەمووش کوشندەتر ئەوەبـوو کە شـوفێرەکانی ئەڵمانیایـان ئاشـکرا کردبـوو، بەوەش هەمـوو پـلانو بەرنامەکـانی ئەڵمانییەکـان دەزانـن، لەئەنجامـدا ئەڵمانەکـان دەشـکێنن‌و رۆمـل توانـای بەرگـریو هێرشـەکانی نامێنێـتو بەناچـاری دەکشێتەوەو شکست دەهێنێت، بەڵام هیـتلەر کشانەوەو شکانی قبـووڵ نەبـووەو داوای کـردووە تـا دوا سـەربازیان بەرگـری بـکەن، فەرمـان دەدات رۆمـل لەبەرەکە بەردەوام بێـت، بـۆیەش هێرشـەکانو شـەڕەکان بەردەوام بووەو سەرکردەی بەریتانیش مۆنتیگۆمری کە زۆر پڕ چەکتر بـووو ئامادە بـوو بەدژواری شـەڕەکە بکـات، لەو شـەڕەدا بەریتانییەکـان زۆرتـرین یارمەتییـان لە ئەلعەلەمـێن دەگـاتێ، لە بەرامبەر ئەوەش ئەڵمانییەکـان سووتەمەنییان نامێنێتو ژمـارەی سـەربازەکانیان کەمتـر دەبێتەوەو رۆمـل ناتوانێت شەڕە لە ناکاوەکانو سووڕانەوەکان ئەنجام بدات، دەرئەنجام لەو بەرەیەدا ئەو دەشکێت، بۆیە شەڕەکانی ترو بەرەکانی بـاکووری ئەفریقیـا ئاراستەیەکی تر وەردەگرێت. بەو شکسـتو بەکشانەوەکانی تـر سوپاکەی ئەڵمانیـا ناچـار دەبێـت بەرەو لیبیـا پاشەکشـە بـکەن، کەفشـارەکە توندتریش دەبێت لە بیابانەکەی تونسیش دەکشێنەوە، کە لە نـاوچەی میـدنینی تونسـیش دەشـکێن، هیـتلەر فەرمـان دەدات رۆمـل بگەڕێـتەوە

ئەڵمانیا، بەتایبەتی کە قسەی وا هەبوو گوایە رۆمل نارەزایی‌و رەخنەی لەسەر رێبەرایەتی‌و سەرکردایەتی هیتلەر نیشاندا بوو.

# هیتلەر کۆشش دەکات رۆمل بکوژێت

لەرۆژی ٢٠ ی مانگی یولیۆی ساڵی ١٩٤٤ هیتلەری سەرکردایەتی رەهای دەسەڵاتەکانی رایخی سێیەمی ئەڵمانی لە یەکێک لە بنکە قایمە سەربازییەکان لەرستنبرگ دەکرد، لەو کۆبوونەوەیەدا کەتێیدا دوو سەرکردەی گەورەی سەربازی نەهاتبوون، لەبەرئەوەی هیتلەر لەو رۆژەدا لەگەڵ مۆسۆلینی ژووانی هەبوو، بۆیە کۆبوونەوەکە دوو سەعات زووتر دەستی پێکردبوو. لەناو کۆبوونەوەکەدا کۆلۆنێل کلاز فۆن ستنفنبرگ خۆی دەدزێتەوەو جانتایەک لەسەر مێزەکەی جێدەهێڵێت‌و دەڕوات، پاش پێنج دەقە لەدوورکەوتنەوەی ئەو، لەسەعات ١٢و ٤٢ دەقەی نیوەڕۆ جانتایە تژی تەقەمەنییەکە دەتەقێتەوەو ژوورەکە کاول دەکات، لاشەی ژمارەیەکیان دەباتە ئاسمانی ژوورەکەو ژوورەکە بەدووکەڵ رەش هەڵدەگەڕێت، چەندین کوژراوو بریندار لێ دەکەوێتەوە، بەڵام هیتلەر بەچەند سووکە برین‌و بەجلوبەرگی دڕاوەوە لەناویاندا هەڵدەستێتەوە. هەر ئەو رۆژە لەئێستگەی ئەڵمانی هەواڵی کۆششی کوشتنی هیتلەر بڵاودەکرێتەوە، بەڵام سەلامەتی ئەو رادەگەیەنن. لەودەمانە رۆمل لەناو ئۆتۆمبێلێکی سەرکراوەی مارسیدسدا بوو، سەردانی بەرەکەی جەنگی لەناوچەی نۆرماندی دەکرد، چونکە تەرازووی هاوکێشەی شەڕەکان بەرەو

لای هاوپەیمانـــان دەشـــکایەوە، فڕۆکەکانیـــان ئاســـمانی ئەڵمانیـــای کۆنترۆڵکردبوو، شـارەکانی بەبۆمبـا دەکـێڵاو ژمـارەیەکی زۆری ڕێگاوبـانو پردەکانی دەرماندو کێڵگەکانی تێکدەدا.

کە فڕۆکەکـانی بەریتـانی لەئاسمانی بەرەکانـدا دەسـووڕانەوە ڕۆمـل بەئـالآی سـووری سـوپای ئەڵمـانییەوە بـووە نیشـانەیەکی بەقـیمەتو گرانبەها، بۆیەش دوو فڕۆکە کە لەسـەر ئاستی نزمـی زەویـدا دەفـڕینو بەرزییـەکەی تەنهـا ۲۰ مەتـر دەبـوو، بۆمبێکیـان ئاراسـتەی ئەو کـردووەو لەئەنجامـدا بەخەسـتی ئەو برینـدار دەبێـت. لەئەنجـامی ئەو هێرشـە ئاسـمانییەدا ئەو دەگەیەنـدرێتە نەخۆشـخانەو بەبـێ ئاگـایی هەمـوو برینەکـانی دەپێچـنەوەو چاوەکانیشـی دەبەسـتن، لەو ڕەوشـە خـراپەی خۆیـدا دەزانێـت پلانـی کوشـتنی هیـتلەر لەئـارادا بـووە، بەڵام پـلانەکە سەری نەگرتووە.

# ڕۆمل دەکەوێتە تەڵەوە

پێش ئەوەی ڕۆمل بەرەو بەرەی نورماندی بەڕێ بکەوێت لەڕۆژی ۱۷ی یولیۆ ڕاپۆرتێکی ئاشـکراو ڕوونـی لەسـەر ڕەوشـی سـوپای ئەڵمـانی لەبەرەی خۆرئاوا ئامادەکردبوو، کە تێدا ئەو نووسیبووی:

مـن وادەزانـم لەو چەنـد ڕۆژەی داهـاتووو لەو نزیکـانەدا هاوپەیمانـان بەرەی نورماندی دەگرن، چونکە ڕایخـی سـێیەم توانـای بەرگـری نەمـاوەو ڕەنـگە دوژمـن بـگەنە نـاو خـاکی ئەڵمانیـاو پێشـڕەوییەکان بـگەنە سـەر

رووباری ئەلراینیش، هێزەکانمان لەبەرەی مانش دەکشێنەوەو لەبەرەی رووسیش شکاونو ناوچەکانیان چۆڵکردووە. رۆمل راپۆرتەکەی بەو رستەیە کۆتایی پێهێنابوو، بێگومان ئەوەش روونو ئاشکرایە کە ئێمە شەڕەکەمان دۆڕاند.

کە راپۆرتەکەیان بەچاپکراوەی داوەتە رۆمل، ئەو بەدەستی خەتی خۆی لەسەر راپۆرتە چاپکراوەکە نووسیبووی، لەو رەوشەدا زۆر پێویستە سەرکردایەتی بڕیارێکی چارەنووسساز دەربکات، رەوشە نوێیەکە ئەوە دەخوازێت، ئەرکی پیرۆزی سەربازییم ئەوەم لێ داوا دەکات، دەبێ راشکاوانە راستییەکان بدرکێنم.

یەکێک لەوانەی تاوانبارکرابوون بەکۆششی کوشتنی هیتلەر ژەنەراڵ ئاسنیدل بوو، کە ئەو دەگێرێت، لەکاتی دادگاییکردنەکەیدا دەڵێت کە رۆمل وتوویەتی ئەوەیان دوا هەلە، کە دەبێ (مەبەستی هیتلەرە) بەگوێمان بکات، دەبێ هەمووولایەکمان بۆ رزگارکردنی ئەڵمانیا کۆشش بکەین. ئەو زانیارییەش دەگاتە هیتلەر، ئەویش ئەو قسەیە لەدڵ هەڵدەگرێتو بڕیار دەدات ئەو قسەیە لەبیر نەکات، چونکە دەیزانی ئەو کەسێکی شۆڕشگێرەو هەموو شتی لەدەست دێت، بۆیە بیردەکاتەوە بەزووترین کاتو دەرفەت ئەو لەناو ببات، چونکە مەترسی لەسەر دەسەڵاتەکەی پەیدا ببوو. پێش ئەوەی هەواڵی کۆششی کوشتنەکەی هیتلەر لەدەزگاکانی راگەیاندن بڵاوبکریتەوە هەزارەها ئەڵمان دەگیرێن، لەوانە چەندین سەرکردەی سەربازییان لەگەڵدا بوو، هەر لەو هەڵمەتەدا سیاسەتمەدارانی زۆریشیان گرتبوو، زۆریان لەزیندانەکان مانەوەو ژمارەیەکیشیان پاش ماوەیەکی کورتی دادگاییکردن بەسێدارەدرانو

خنكاندنو سەربڕینو خنكاندن بەگاز یان بەگوللەبارانو ئەشكەنجەدان لەناودەبەن.

دەزگاكانی تایبەت بەهیتلەر بۆ دۆزینەوەی دەستەی پلانەكەیان سەدان كەسیان بەرچاو گرتبوو، یەكێك لەوانە عەقید كلاز فۆن ستیفنبرگ بوو كە خۆی بەبوونی فشارو چاودێری زۆری پیاوەكانی گستاپۆ تەقینەوەكەی دادەنێتەوە، كە ئەو ماوەیەی لەزیندانەكانی بەرلین دەمێنێتەوە، ئەو ناوی كەسانی گرینگی ناو پلانەكەی ئاشكرا كردبوو، لەوانە ناوی رۆملیشی هێنابوو كە ئەوەیان ناوێكی گرنگ دەبێت، كە بە هیچ شێوەیەك هیتلەر ئەوەیان لەبیر ناكات.

شەڕەكە لە مانگی ئۆكتۆبەری سالی ١٩٤٤ بەدرێژاری بەردەوام بوو، كە شەڕەكە گەیشتبووە گەنجینە گوللەنەبڕەكانی سەركردایەتی هیتلەر، هیتلەر لەناو ئەو گەنجینانەدا دۆسیە تایبەتییە گرنگە بایەخدارەكانی هەڵگرتبوو، یەكێك لەوانە لاپەڕەیەك بوو كە تێدا رۆملی تێدا تاوانباركردبوو بەپلانی كوشتنی هیتلەر، كە بەشێك بووە لەو دەستنووسەی لە كاتی دادگاییكردنی عەقید كلاز فۆن ستیفنبرگ دانی بە بەرنامەی پلانەكە دانابوو، لەوێش ناوی رۆمل هاتووە. لەرۆژی ٧ ی مانگی ئۆكتۆبەری سالی ١٩٤٤ رۆمل لە ماڵە گوندییەكەی دەبێت كە هیتلەر بروسكەیەكی ئاراستە دەكات تێدا داواكارە بێتە بارەگای سەركردایەتی لە بەرلین، بەلام رۆمل بڕیار دەدات داواو بانگكردنەكی هیتلەر قبوڵ نەكاتو نەچێتە بەرلین، بۆیەش بەلۆسی ماریا دەڵێت:

من شێتێك نیم بچمە بەر داوەكەو بكەومە بەردەستی هیتلەر، ئەگەر ئەو سەری منی دەوێت با خۆی بێت سەرم ببات.

کە ئەو قسەیە لەگەڵ ژنەکەی دەکات ئەقیب ئالدنجر گوێی لەو قسەیە دەبێتو بەژن و مێردەکە دەڵێت؛

جەنابی مارشاڵ من لەگەڵ ئەو بۆچوونەی تۆ دا نیم، تۆ کەسێکی زۆر ناوداڕو ناسراویت بڕوا ناکەم کەس دەستت بۆ درێژ بکات، چونکە ئازاردانی تۆ ئاژاوەیەکی گەورە لەناو لایەنە سیاسیی سەربازییو کۆمەڵایەتیی لەناو ئەڵمانیا پەیدا دەکات. بەڵام رۆمل بەیاریدەرەکەی دەڵێت؛

تۆ هەڵەیت ئالدنجر، ئەو پیاوە شێتو سەرلێشێواوە، ئەو بەهیچ فشارێک لەبڕیاری خۆی پەشیمان نابێتەوە، بایەخ بەهیچ نادات، ئەو تەنها تۆڵەکردنەوەی مەبەستە، ئەوانەی ناویان هاتووەو باسیان کردووەو وتوویانە رەوشەکەمان مەترسیدارەو با کار بکەین ئەڵمانیا لەو ئاژاوەو رووخانە دەرباز بکەین، ئەو ئەوانە هەموو دەکوژێت.

یەکێک لەوانەی ئەو جۆرە قسانەیان بەهیتلەر وتبوو ژەنەراڵ هنس سبیدل بوو، کە دەگیرێت بەفەرمانی هیتلەر لەسەرەتای مانگی سپتەمبەری ساڵی ١٩٤٤دا لەسێدارە دەدرێت. هیتلەر هەرگیز ئەوەی لە بیر نەدەچوو کە رۆمل وتبووی نازییەکان ئەڵمانیایان بەرەو کاولبوون بردووە. بەڵام رۆمل دوایی بەیاریدەرەکەی دەڵێت؛

پەیوەندی بەبەرلین بگرە، من دەخوازم بڕوا بەبۆچوونەکەی تۆ بهێنم، با ماوەیەکیش نیازپاک بم!

ئەفسەرە یاریدەرەکەی رۆمل پەیوەندی بەسەرکردایەتی گشتی لە بەرلین دەکات، پاش کاتێکی کورت ژەنەراڵ ویلهام بورجدورفی سەرۆکی دەزگای تاکەکان لە سوپای ئەڵمانی وەڵامی دەداتەوە، ئەو بەوە دەناسرا

کە ئەفسەرێکی رەفکاربوو بەرۆملی وتبوو، کە سەرۆکی ئەرکانو راوێژکاری هیتلەر لەئەلفروهەرەوە فەرمانی پێدراوە کە تۆ بەرپرسی بەرەیەکی نوێت پێ دەسپێردرێت، بۆیە دەبێ ئامادە بیت تا لەسەر ئەو بەرپرسیەتییە دانووستان بکەین، تۆش سەرپشکی کام بەرەت دەوێت، رۆژی دەی ئەو مانگەت بۆ دیمانەکە بۆ دانراوە، بەڵام رۆمل بەبیر بەرامبەرەکەی دەهێنێتەوە کە ئەو لەبەر برینداریەکەی ماوەیەکو بۆ چەند مانگێك لەکردەوەی سەربازی پارێزکراوە، دکتۆرەکانی ئاگاداریان کردۆتەوە کە ناکرێ سەفەر بکەیتو بۆت نییە بجوڵێیتەوەو بەوەش تەندروستیت دەکەوێتە مەترسییەوە، بۆیە زەحمەتە من لەو کاتانەدا بگەمە بەرلین. بەڵام پیاوەکەی سەر هێڵی تەلەفۆنەکە سوور دەبێت لەسەر ئەوەی ئەو لە کاتی دیاریکراودا بگاتە بەرلین، بەڵام رۆمل وەڵامی دەداتەوە کە ئەو لەژێر پرۆسەی چارەسەری دایەو ماوەی پشوودانەکەی تەواو نەبووەو هەفتەی داهاتوو پشکنینی پزیشکی زۆر پێویستی هەیە. ویلهام بورجدروف پاش ئەو رستەیە تەلەفۆنەکەی لەگەڵ رۆمل دەپچرێنێت، بەقسەی ئالدنجر پاشان وتبووی، من ئەوم بەنیگەرانیو شڵەژانەوە بینی، هەستم کرد بریندارە، بۆیەش لەناو ژوورەکەیدا دەهاتو دەچوو، لەمنی پرسی دەبێ هیتلەر چ سەرکردایەتییەکم پێ بسپێرێت، رەنگە بەرەی خۆرهەڵات بێت، لەگەڵ یاریدەرەکەی چەند راو بۆچوونێکیان لەسەر ترسناکی ئەو بەرەیە کە سوپای سۆڤیەتی تێدا جێگیرە دەگۆڕێتەوە. لەودەمانەی رۆمل بیری لەو بەرە ترسناکە دەکردەوەو باسی گرنگی ئەو بەرەی بەمێشکدا دەهات کە چەند بایەخدارە لەئەوروپا، هیتلەر لە سەرۆکایەتی گشتی لەگەڵ سێ کەسی

تــردا پلانیــان دادەڕشــت چــۆن ڕۆمــل لە نــاوبەرن، بەمەرجێــک هــیچ ئاشوبەیەک ڕوو نەداتو پرۆسەکەش بە ئاسانی بڕوات.

# گەمارۆدانی ماڵی ڕۆمل

پــاش چــوار ڕۆژ لەقســەکردنی ڕۆمــل لەگەڵ بورجــدروف، ڕەوشــەکە بەئــارامی دەڕۆیشــت، تــا بەیــانی ڕۆژی پێنجشــەممەی ڕێکەوتــی ١٢ ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٤٤ میوانێک لە دەرگای ماڵی ڕۆملی دابوو، میوانەکەش ئادمیرال فریدریش بوو کە لەبەرەی فەرەنسییدا یاریدەری دەریاوانی ئەو بوو، بەیەکەوە کەوتنە قسەکردن، ڕۆمل بەمیوانەکەی دەڵێت هیتلەر شێت بووە، کۆشش دەکات بەهەر شێوەیەک بێت لەناوم بەرێت، بەڵام ئەو دەستی ناگاتە من. برادەرە میوانەکەی وەک گاڵتەکردنێک وەڵامی داوەتەوەو وتوویەتی:

ئەگەر بتوانیت لەدەستی ڕزگاری بێت ئیستاش بوار ماوە ئەو ببینیت، چونکە هێشا ئەو لەژیاندا ماوە. لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا ڕۆمل بروسکەیەکی سێ وشەیی دەگاتە دەست، کە تێدا نووسرابوو، بورجدروف دەگاتە لاتان.

لە ڕۆژی دوایی ڕێکەوتی ١٢ ی ئۆکتۆبەردا، بەیانییەکەی ڕۆمل لەگەڵ کوڕە تاقانەکەی لەناو باخچەکەیان پیاسەیان دەکرد، هێزێکی پڕ چەکی سوپا دەروازەی شارەکە دەگرێت، سەرەڕێیەکان دەگرن، هەموو دەروازەو بوارەکانی دەربازبوونو ڕاکردن دەبەستن، ئەوەش پێشەکییەک بوو تا ئەو

دەست نەکاتەوەو بەرگری نەکات. لەسەعات یازدەی نیوەڕۆ ڕۆمل دەچیتە ژوورەکەی سەرەوەی ماڵەکەیان، پاش گافێکی کورت بەجلی سەربازییەوە دادەبەزێــــت، ئەو بەدلەیەی کە لەبەرەی ئەفریقــی لەبەری دەکــرد لەبەردەکات، کە منفرید باوکی بەو جلەوە دەبینێت سەرسام نابێت، چونکە جلەکان لەلای ئەو ئاسایی بوو، بەڵام نەیدەزانی باوکی چاوەڕوانی کێ دەکات، بۆ وا خۆی گۆڕیوە، لەودەمـانەدا ئالدنجر لەگەڵ سەرۆکەکەی دەچـــنە ژوورەوەو مـــاوەیەک لە نووســینگەکەی ئەو دەمێنێـــنەوە، کە سەعاتەکە زەنگی سەعات دوازدە لێدەدات ئۆتۆمبێلێکی سەرکراوەی ڕەنگ کەسک کە پیاوێکی سەر بەدەزگای گستابۆ لێیدەخوڕی دەگاتە بەر دەرگای ماڵەکەیان، کە ئۆتۆمبێلەکە لەبەردەم ماڵی سەرۆک ڕۆمل دەوەستێت، دوو ئەفسەر بەپلەی ژەنەراڵ دادەبەزنو بەخێرایی بەرەو ماڵەکە دەچن، لەپەنا پەنجەرەکەوە ئالدنجرو چاوی لەدوو کەسەکە بوو، هەردووکیانی ناسیبوو، ئەوانیش ژەنەراڵ بورجدروفو ژەنەراڵ ئارنست مازیلی یاریدەری بوو. هەردوو ژەنەراڵەکە هاتنە ناو ژووری پێشوازییەکە، کە ڕۆملو ژنەکەیو کوڕەکەی لەوێ بوون، یەکسەر هەردوو ژەنەراڵەکە داوا لەهاوسەرەکەو کوڕەکەی دەکەن، لەگەڵ ڕۆمل تەنها جێمانبهێڵن. یەک سەعات ئەو سێ کەسە بەیەکەوە لەژوورەکە دەمێننەوە، پاش ئەو سەعاتە دەرگاکە دەکرێتەوەو ڕۆمل لە ژوورەکە دەردەچێت، بەرەو رووی ژنەکەی دەچێت، بەڵام ئاکاری شێواو دیاربوو، نیگەرانیو ترسی پێوە بوو، وەک بت دەوەستێتو ڕوویەڕوو بەژنەکەی وتووە من پاش چارەگە سەعاتێکی تر دەگەمە نێــو جیهــانی مــردووان. کە ژنەکە ئەو قســەیە دەبیســتێت دەقیژێنێتو هاواری لێ هەڵدەستێت، بۆیە منفریدی کوڕی زوو دەگاتە

لای دایکو باوکی، لەودەمانە ئەو قسەیەی بەدایکی وتبوو هەمان قسەش لە باوکی دەبیستێت، کە بەدایکی وتبوو؛

منیان لەنێوان ژەهرو شوورەیی سەرپشک کردووە... دەیانەوێ من خۆم بکوژم. کە قسەکەی تەواو دەکات روو لەکورەکەی دەکاتو دەڵێت؛

ئا کورم من بۆ قازانجی تۆو دایکت لەبەر چاوی ئێوە، من ئەوە دەخوازم، لەبەرئەوەی من کەسێکی سەربازی شەرمەفەندم بۆیە هیچ بواری ترم نییە تەنها مردن نەبێت، دەبێ بمرم. کە کورەکە ئەو قسەیە لە باوکی دەبیستێت دونیای بەرەو رووەدا دەهەژێت، ژیان لە پێش ئەو دەبێتە سەراب، دەبێتە خەونێکو بەهەڵاتنی خۆر دەرەوێتەوە، لەودەمانە هەموو رووداوو کارەساتەکانی دێتەوە پێش چاوان.

## مردن یان مردن!

هەردوو ژەنەراڵەکانی پەیامنێرانی مردن لە نهۆمی خوارەوەیماڵەکەی رۆمل چاوەڕوان بوون، لەژوورەکەدا دەهاتنو دەچوون، بەپەرۆشییەوە سەیری سەعاتەکەی دەستیان دەکرد، سەریان بۆ ژوورەکەی سەرەوەی ماڵەکەش بەرز دەکردەوەو چاوەڕوانی دابەزینی رۆمل بوون، ئەو تەنها دە دەقەی یارمەتی لەو دوو کەسە خواستبوو کە خوداحافیزی لە هاوسەرو کورەکەی بکات. ئەو دوو ژەنەراڵە بڕیاریان لە هیتلەر وەرگرتبوو بەتاوانی پلانداناڵ بۆ کوشتنی هیتلەر رۆمل لەناوبەرن، ئەوان پێیان وتبوو لەبەر شەرمەفی پلە سەربازییەکەت وا باشە

خۆت بکوژیت، ئەگەر بگیرێتو دادگا بڕیاری لەسێدارەدانت بۆ ببڕێتەوە ئەوا هەموو خەباتو نەبەردییە سەربازییەکانت بەفیڕۆ دەچێت، بۆیە رۆمل بڕیارو ئەگەری یەکەمی قبوڵ کردبوو، ژەنەراڵ بوجدروف لەرۆمل دەچێتە پێشەوەو پێی دەڵێت:

ژەنەراڵ کایتل ئەو شووشە ژەهرەی بۆ ناردیت، ئەوەش لەخزمەتت دایە.!

پاشان ژەنەراڵ ئارنست مازیلیش دەڵێت:

ئەو ژەهرە کاریگەری زۆر بەهێزی هەیە، تەنها بەسێ چرکە دەتکوژێت!

کە رۆمل ماڵئاوایی لە ژنو کوڕەکەیو ئالدنجروی یاریدەری دەکات، بەهەنگاوی دیاردا لەگەڵ هەردوو جەلادەکە بەرەو ئۆتۆمبێلەکە دەڕوات، بەڵام سەریەرزو نێوچەوان شکۆداربوو، دارە مارشاڵییە ساف زێرینەکەی لە بن هەنگڵیدا بوو، پەخە سوورەکەی تژی بوو لەنیشانو مەدالیای ئازایەتی لە وێنەی هەڵۆو خاچە شکاوەکان، نیگایەکی لە خانووەکە دەکاتو بەرەو ئۆتۆمبێلەکە دەڕواتو سوار دەبێت، بەڵام ئاوڕی پشتەوەی ناداتەوە، بەڵام هاوسەرەکەی لەپشتی پەنجەرەکەوە سەیری دەکات. رۆمل لەپشتەوە لەتەنیشت هەردوو جەلادەکە دادەنیشت، شوفێرەکەی گستابۆ کە ناوی دوز بوو ئۆتۆمبێلەکە لێدەخوڕێت، ئۆتۆمبێلەکە لەناو دارستانەکە دەردەچێت، تەنها سێ کیلۆمەتر دوور دەکەوێتەوە کە رۆمل ژەهرەکە دەخوات. هەردوو ژەنەراڵەکە لە ئۆتۆمبێلەکە دادەبەزن، بەپیادەیی لە ئۆتۆمبێلەکە دوور دەکەونەوە، کە دەگەڕێنەوە دەبینن رۆمل بەدانیشتووی سەری نەوی بووە، دارە سەربازییەکەی کەوتووتە بن

پێیەکانی، نرخە نرخی بوو، جەستەی دەلەرزی، بەو ڕەوشە ناڵەبارە دە دەقەیەک دەمینێتەوە، دیارە ژەهرەکە کاریگەری زۆر بەهێزی نەبووە وەک ئەوان وتیان.

ئۆتۆمبێلەکە لاشەی مردووی ڕۆملی بەرەو نەخۆشخانەی سەربازی لە شاری ئولم بردبوو، دکتۆرەکان جەستەیان سەیر کرد، لەسەر داوای ژەنەراڵ بورجدروف دکتۆرەکە راپۆرتێکی نووسیبوو کە ڕۆمل لەئەنجامی خوێنپژانی مێشکو بوونی شکانی کەللەسەر مردووە، ئەوەش لە ئەنجامی برینەکانی بۆردومانەکەی نورماندییەوە بووە.!

حکومەت بەرنامەی دانابوو پاش کوشتنەکەی بەرەسمی مردنی ڕۆمل لەرۆژنامەو هەموو دەزگاکانی راگەیاندنی ئەڵمانیدا بڵاوبکاتەوە، تا گومان لە هیچ شتێک نەکرێتو پرسەیەکی رەسمییان بۆ دانابوو، وەک پاڵەوانێک تەرمەکەیان بەرێکردبوو، کە تێدا گەورە ئەفسەرانی سوپاو کاربەدەستانی دەوڵەت لە کاروانی بەرێکردنی تەرمەکەیدا ڕۆیشتبوون، هەروەها نوێنەری وڵاتانیش لەو مەراسیمەدا بەشداریان کردبوو، لە پێش تەرمەکەش تیپی مۆزیکی سەربازییش مارشی سەربازی پرسەداری ژەنیبوو، چەندین ئاڵای سەربازی سوپاکانو تیپە سەربازییەکانو لیواکانیش لەسەر شەرەفی ئەو دەشەکانەوە، بەو جۆرە تەرمی ڕۆمل بەخاک سپێردرابوو، بۆ گەورەیی ناوو مێژوو پلەکەی گۆڕستانێکیان سازکردبوو.

کوشتنی ژەنەراڵ کلیبەر لە مێژووی خەباتی میللی عەرەبیدا پێگەیەکی دیارو بەرچاوی هەیە، کە وڵاتە عەرەبییەکان لە ژێر دەستی کۆلۆنیالیزم دەیانناڵاند، کلیبەر سەرکردەیەکی دیاری هەڵمەتە سەربازییە فەرەنسییەکەی سەر میسر بوو، لەساڵی ١٧٩٨ لەگەڵ ئەوەی سەرکردەی سوپا فەرەنسییەکە بوو، بەڕێوەبەری کاروبارە سیاسییەکانو، بەرنامەکانی ئەو وڵاتەش بوو.

ئەو زانیارییانەی لەسەر ژەنەراڵ کلیبەردا هەیە زۆر کەمو دەگمەنە، ئەو لەرۆژی ٩ ی مارسی ساڵی ١٧٥٢ لەشاری ستراسبۆرگی پایتەختی ئالزاس لەدایکبووە، بەشداری شەڕەکانی شۆڕشی فەرەنسی کردووە، لەوێ لێزانیی و کارامییەکانی دەنگی داوەتەوە، ئەو یەکێک بووە لە ئەفسەرە هەرە چالاکەکانی سوپای فەرەنسی و زۆر لەناپلیۆن پۆناپارت نزیک بووە، لەبەرئەوەی ئەویش وەک ناپلیۆن ناودارو سەردلر نەبووەو بۆیەش رقی ئەستووری لەو هەبووەو تەمەنیشی شازدە ساڵ لەو گەورەتر بووە، ئەو زۆر دژی هەڵمەتە سەربازییەکەی سەر وڵاتی میسر بووە، چونکە ئەوەیان بە نەمری و بەشکۆداری بۆ ناپلیۆن دەزانی و بەس، بەڵام ناپلیۆن دەیزانی بوونی ئەو لەسوپایەکەیدا سەروەرییەکی مەزنەو هێز دەداتە سوپایەکەی بۆیە بەشداری پێ کردووە.

ئەو قسانەی لەسەر کوشتنەکەی کلیبەر نووسراوەو زانراوە زۆریان دوورن لەراستی، زۆر لەرووداوەکانی عەرەبی و ئیسلامیی ناوچەکە کەسانی نەشارەزا دەستی تێ وەردەدەن، بۆیەش بابەتە راستو گاڵتەکان، خەیاڵو راستییە بەرجەستەکان تێکەڵ دەبن.

# بکوژە بەکرێگیراوەکە

من ئیمرۆ هەواڵێکی نوێتان لەسەر کوشتنی کلیبەر پێ رادەگەیەنم، ئەوەی ژەنەراڵ کلیبەری کوشتووە گەنجێکی سووریی بووەو ناوی (سلێمان ئەلحەلەبی) بوو، ئەو کەسێکی پاڵەوان نەبووە، کوشتنەکەی لەتۆڵەی سوتاندنی قاهیرە نەبووە، یان سووکایەتیکردن بەشێخەکانی ئەلئەزهەرو لەبەر ئەوەش نەبووە کە سوپای فەرەنسییەکان وڵاتانی موسڵمانانیان داگیرکردووە، بەڵکو ئەو پیاوەی کە ناوی سلێمان بووە ژەنەراڵ کلیبەری کوشتووە یەکێک بووە لەبەکرێگیراوانی سوڵتانەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ئەوەش لەتۆڵەی ئەوەی سوپای فەرەنسی عوسمانییەکانیان شکاندووەو ناوچەکانی دەسەڵاتی ئەوانیان داگیرکردووە.

مێژووی جبرتی خاڵی یەکلاکەرەوەیە لەروونکردنەوەی ئەو رووداوە، چونکە ئەو سەرچاوەیە تاکە تۆماری مێژووی ئەو رۆژگارەیە کە رووداوەکانی بە رۆژو بەسەعات تۆمارکردووە، ئەوەی ئەو کتێبە بخوێنێتەوە وا دەزانێت کە رۆژنامەیەکی رۆژانە دەخوێنێتەوەو تێیدا هەموو وردەکارییەکانی ئەو رۆژگارە دەدۆزێتەوە، لەوانە نرخی مێوەو سەوزەو گۆشتو شیرنەمەنیشی تێدایە، نرخی کانزا گرانبەهاکانی نووسیوەتەوە، نرخی دراوی ئەو رۆژانەی تێدایە، ئەوەی لە وڵاتی میسر قەوماوە لەوێ نووسراوە. نووسەرەکەی ئەو کتێبەکارێکی مەزنی مێژوویی گەورەی ئەنجامداوە، کە هەموو مێژوونووسانی عەرەبو بێگانەش شاهیدیی بۆ دەدەن.

لەگەڵ مێژووی جبرتی سەرچاوە فەرەنسییەکانیش ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەیان تۆمارکردووە، چونکە تاکە بەرەکەتی هەڵمەتە فەرەنسییەکە بۆ سەر وڵاتی میسر هاتنی ژمارەیەکی زۆری زانایانو هونەرمەندان بووە کە هاوشانی ناپلیۆن گەیشتوونەتە وڵاتی میسر، ئەوانیش ڕووداوەکانو ڕۆژانە کۆمەڵایەتییەکانی وڵاتی میسریان رووماڵکردووە، مێژوو جوگرافیاو جیولوجیاو لایەنی کۆمەڵایەتییان نووسیوەتەوە، جێ پەنجەی سپی ئەوان لەو بوارانەدا دیارو روونە، ئەوان کتێبی (وەسفی میسر) یان نووسیوە، ئەو کتێبە سەرچاوەیەکی دەگمەنەو ناوەرۆکەکەی دەوڵەمەندو باوەڕپێکراوە، بەهەموو پێوەرەکانی سەردەم ئەو کتێبە دەگرێ بەمەزنترین کار ئەژمارد بکرێت کە لەو سەردەمە لەسەر میسر نووسرا بێت.

مێژوونووسی گەورە عەبدولرەحمان ئەلرافعی پشتی بەو سەرچاوە فەرەنسییانە بەستاوە کە لەماوەی داگیرکردنی فەرەنسا بۆ وڵاتی میسر نووسینیان هەبووە، ئەویش لەبەر رۆشنایی ئەو سەرچاوانە مێژووی هاوچەرخی میسری نووسیوەتەوە کە لەسەرەتای سەدەی هەژدەمەوە تا هەڵگیرسانی شۆڕشی یولیۆی ساڵی ١٩٥٢ لەخۆ گرتووە، کتێبەکانی ئەو لەو بەشانەدا زۆریان باوەڕپێکراوو وردو بێلایەن دەژمێردرێت، بۆیەش دەقی نووسینەکەی ئەو لەسەر ڕووداوەکە بڵاودەکەینەوە کە سوودی لە سەرچاوە فەرەنسییەکان سەبارەت بەکایە مێژووییەکەی وەرگرتووە، ئەو بەو جۆرە باس لەکوشتنی ژەنەراڵ کلیبەر دەکات.

# ڕووداوی کوشتنەکە

لەڕۆژی شەممەی ڕێکەوتی ١٤ی یونیۆی ساڵی ١٨٠٠ ژەنەراڵ کلیبەر بۆ وەرگرتن‌و نمایشی کەتیبەی ئەرواح لەسوپای فەرەنسییدا دەچێتە دووگەی ڕەوزە، پاش نمایشەکە دەگەرێتەوە ئەزبەکیە تا سەردانی کارەکانی نۆژەنکردنەوەی خانەی سەرکردایەتی گشتی‌و ماڵی سەرۆکایەتی گشتی بکات، پاش ئەوەی لەئەنجامی بۆردومانی گوللە تۆپەکانی شۆڕشگێرانی شۆڕشی قاهیرەی دووەم زیانی بەرکەوتبوو، لەو کاروانەدا مسیو بروتان کە ئەندازیاری تەلارسازیی‌و ئەندامی لیژنەی زانست‌و هونەرەکان بوو هاوشانی ئەو دەبێت. کە سەردانەکە تەواو دەکەن دەچنە ماڵی ژەنەراڵ داماس کە سەرۆکی ئەرکانی جەنگی بوو، لەوێ‌و لەماڵەکەی ئەودا داوەتێکی نیوەڕۆ خوان لەسەر شەرەفی سەرۆکی گشتی سازکرابوو، لەو داوەتەدا ژمارەیەک لەسەرکردەو ئەندامانی کۆڕی زانیاری‌و سەرۆکی دائیرەکانیش ئامادەبوون، ئەو لەو دانیشتن‌و داوەتەدا دڵی خۆش بوو، بەئارامییەوە باسی ڕەوشی ناو میسری دەکرد.

بەرنامەی خوانەکە تا سەعات دووی پاش نیوەڕۆ بەردەوام دەبێت، کلیبەر لەگەڵ ئەندازیارەکە دەگەڕێنەوە خانەی سەرکردایەتی گشتی تا بەیەکەوە سەردانی پرۆژەکان بکەن‌و لەنزیکەوە لەسەر بەرنامەی نۆژەنکردنەوەکان راوەستن، باخچەی سەراکە بەهەیوانێکی درێژی داپۆشراوو بەکەپری دارمێو بەماڵی ژەنەراڵ داماسی دەبەستایەوە. ژەنەراڵ کلیبەر کە لەو هەیوانەدا دەڕۆیشت باسی پرۆژەی نۆژەنکردنەوەکەی

سەرای بۆ ئەنـدازیارەکە دەکـرد، لەودەمانەدا پیاوێـک لەپشت بیـرێکەوە کە جـۆگەیەکی لێـوە نزیـک بـوو، وەک ئەوەی پرسیارێکی هەبێـت یـان بیەوێت بۆ داوایـیەک لەو بپـارێتەوە لەژەنەراڵ کلیـبەر نزیـک دەبێـتەوە، بۆیەش ژەنەراڵ زۆر لەنیەتی پیاوەکە حاڵی نابێت، زۆریـش رووی نـاداتێ، کـابرای دەسـت بەخەنـجەر زەبرێـک لەسـینگی دەوەشـێنێت، بەلێـدانی خەنــجەرەکە ژەنەراڵ کلیــبەر هــاواری لــێ هەڵدەســتێنێتو دەڵێــت: ئەی پاسەوان..

لەگەڵ ئەو قسەیەدا کلیبەر دەکەوێتە سەر ئەرزو لەنـاو خوێنەکەیـدا دەگەوزێـت. کە هـاوڕێیەکی مسیو بروتـان ژەنەراڵ دەبینێـت، پـڕ دەداتە بکــوژەکەو یەخەی دەگرێــت، بــۆیەش پیــاوەکە خەنــجەرەکە لەویــش دەدات، کە دەزانێت ئەویشی پێکاوە شەش جار خەنـجەرەکەی لەهەنـاوی را دەکات، تا ئەویش لەتەنیشت کلیـبەر پەلاواز دەبێتەوە، بـۆ دڵنیـابوون لەمردنی ژەنەراڵ کابرا دەگەڕێتەوە سەریو سێ جـاری تـر خەنـجەرەکەی لەهەنـاوی را دەکـاتەوە، بەڵام ژەنەراڵ کلیـبەر بە یەکەم خەنـجەر گیـانی دەردەچێتو تەواو دەبێـت، چـونکە خەنـجەری یەکەمـی دروسـت لەدڵـی دابوو، بەوەش هەناسەی بڕابوو. کە بکوژەکە دەزانێت نێچیـرەکەی بـاش پێکاوە خۆی گووم دەکاتو لەناو باخچەکەی سـەرای خـۆی حەشـار دەدات، بەڵام عەمامەکەی لەکاتی دەستەویەخەی لەگەڵ کلیبەر بەجێدەمینێت، ئەوەش دەبێتە تاکە پاشماوەی تاوانەکە. کە پاسەوانەکە بەهانـای دەنگـی کلیبەر دەگاتە شوێنەکە دیمەنێکی ترسناکو چـاوەڕواننەکراو دەبینێـت، زوو خـــۆی دەگەیەنێـــتە مـــاڵی ژەنەراڵ دامـــاس، لەوێ بەســـەرهاتی دیمەنەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە، هەموو ئامادەبووان بەپەلە دەگەنە شوێنی

رووداوەکە، دەبینن ژەنەراڵ کلیبەر لە تەنیشت بروتان بەمردوویی کەوتووە، بەڵام بروتان لەگەڵ ژانی برینە سەختەکانی بوراوەتەوە. هەموولایەک بەو دیمەنە شۆک دەیانگریت، ژەنراڵە مردووەکە بەپەلە دەبەنە ماڵی ژەنەراڵ داماس، کە دکتۆر دیجنت دکتۆری سوپا دەگاتە سەری دەبینیت کلیبەر تەواو بووە.

## ئاڵۆزیی و سەرسامبوون

هەواڵی کوشتنەکە چەشنی بروسک خێرا لەناو شاری قاهیرە بڵاودەبێتەوە، خەڵکەکە لە ترسی تۆڵەسەندنەوە هەموو سەرسام دەبن، ترسیان لێ دەنیشێت، سەربازە فەرەنسییەکانیش بەو رووداوە تووڕەو بێزار دەبن و نیازی تۆڵەکردنەوەیان لە ئاکاریان دەردەکەوێت. لەگەڵ رووداوەکە نەفیری سەرتاسەری لێ دەدرێت، هەموو سەربازەکانی ناو قاهیرە کۆدەبنەوە، هەموولایەک بەمەبەستی تۆڵەکردنەوەو فریاکەوتن و بەنیازی سووتاندنی شاری قاهیرە لە گۆڕەپانی ئەزبەکییە کۆدەبنەوە، هەموو دوکاندارەکان دوکانەکانیان دادەخەن، ترس باڵی بەسەر شارەکە دادەکێشێت، کۆڵانەکانی شار چۆڵ دەبێت، هەموولایەک تا سەلامەت بن و نەکوژرێن دەچنەوە ماڵەکانی خۆیان، گومان لەدوارۆژی خۆیان دەکەنەوە، چاوەڕوانی جۆری تۆڵەکردنەوەکە دەبن، شەقامەکان بەسەربازەکان گەمارۆ دەدرێت، پاسەوانەکان لە هەموو شوێنێک ئامادەییان دەبێت، بەتایبەتی لەناوچەی ئەزبەکییە، هەموو پەرۆشی دۆزینەوەی بکوژەکە

دەبن، بەڵام ئەویش لەبەر چاوان باش خۆی دەشارێتەوە، پاسەوانەکان لەناو باخچەی سەرا بەوردی لە بکوژەکە دەگەڕێن، گومان دەکەن ئەو لەوێ خۆی شاردبێتەوە.

سەعاتێک پاش ڕووداوەکە بکوژەکە لەناو باخچەکەی تەنیشت خانەی سەرکردایەتیو لەتەنیشت کۆنە دیوارێکی ڕووخاو دەدۆزنەوە، کە لەلایەن دوو پاسەوانیماڵەکەی ژەنەراڵ کلیبەرەوە هەستی پێ دەکەن. بکوژەکە ویستبووی لەناو دەستیاندا را بکات، بەڵام دوو پاسەوانەکە لەگرتنی ئەودا چوست دەبنو توند دەیگرنو ڕاپێچی پێش سەرکردەکانی ئامادەبوو لەماڵی سەرۆکی ئەرکانی جەنگی دەکەن کە لەوێ کۆبببوونەوە. شوێنەواری تاوانەکە لە سەرەتای دەستگیرکردنەکە دیاربوو، جێی دەستی بەخوێنی لەسەر دیوارەکەوە دیاربوو، جلی هەموو خوێنی تاوانەکەی پێوە بوو، کە خەنجەرەکەیان دۆزیەوە هێشتا خوێنی کوژراوەکەی پێوەبوو. بکوژەکە دەبەنە ماڵی ژەنەراڵ داماس لەوێ ژەنەراڵ مینو ئیفادەی لێ وەردەگرێت، لەگەڵ ئەندازیار بروتان ڕووبەڕووی دەکەنەوە، ئەو زوو دەموچاوی دەناسێتەوە، کە بکوژەکەی لەگەڵ ژمارەیەک لەکرێکارەکان بۆ رادەگرن، ئەو یەکسەر دەستنیشانی دەکاتەوە، چەند شاهیدێکی لێ پەیدا دەبێت کە دەڵێن ئەو پیاوە چەند ڕۆژە شوێن پێی ژەنەراڵ کلیبەری هەڵدەگرت، لەجیزە کە بارەگای سەرکردایەتی گشتییە لەوێ بینراوە کە ویستوویەتی داوایەک پێشکەش کلیبەر بکات، بەڵام مسیو بیرۆسی سکرتێری تایبەتی ژەنەراڵ کلیبەر بواری دیمانەکەی ئەوی لەو ڕۆژەدا نەداوە.

# خوێندکارێک لەحەلەب

لە بەیانی رۆژی هەینی کە تاوانەکەی تێدا رووداوبوو، تاوانبارەکە خۆی دەخزێنێتە ناو دەستەی خزمەتکارەکان، لەوێ یاوەر دیفۆج دیویەتی، ئەو هەستی کردووە ئەویش یەکێکە لە کرێکارەکانی نۆژەنکردنەوەی باڵەخانەی سەراکە، بۆیە فەرمان دەدا لەباخچەی سەراکەی دەربکەن.

لەگەڵ ئەو بەڵگە سەلمێندراوانەشدا بکوژەکە دانی بەتاوانەکەی نەدەنا، بۆیە تا دان بەتاوانەکەیدا بنێت بەرتلەی ئەلرومی ئەشکەنجەی توندی دەدات، لەگەڵ ئازارو ئەشکەنجە زۆرەکە تاوانبارەکە دان بەتاوانەکەو ناوی راستی خۆی دەنێت، ئەو وتبووی من خوێندکاری زانستیم لەحەلەبەوە هاتووەو تەمەنم بیستو چوار ساڵەو ناوم سلێمان ئەلحەلەبییە، باوکم لەشاری حەلەب بازرگانەو ناوی حاجی محەمەدئەمینە، لەماڵەوە دەرچووەو گەیشتوومەتە بەیتی موقەدەس، لەوێیەوە گەیشتوومەتە قاهیرە، مەبەست لەو سەفەرەشم کوشتنی ژەنەراڵ کلیبەر بوو، رێگای کاروانەکەشم سی و یەک رۆژی ویستووە. لەکاتی لێکۆڵینەوەکانی پێش دادگا دانی بەوەدا ناوە کە ئەو لەلایەن سەرکردەکانی عوسمانییەوە هاندراوە ئەو ژەنەراڵە فەرەنسییە بکوژێت، ئەو لەقودس سەرکردەیەکی سوپای عوسمانی بەناوی ئەحمەد ئاغا بینیووە، کە لەشاری حەلەب سەرۆکی ئەنکشاری عوسمانی بووە، ئەو لەوەزیفەکەی دوورەخرێتەوەو بۆیەش دەگاتە قودس تا لەوێ کۆشش

بکات سەدر ئەلئەعزم ببینێت تا بگەڕێتەوە سەر پۆستەکەی جارانی خۆی، لەوێ چاوی بەسلێمان ئەلحەلەبی دەکەوێت، بەیەکەوە قسە لەسەر زوڵمو بەدکارییەکانی ئیبراهیم پاشای والی حەلەب دەکەن، سلێمان پێیدەڵێت ئەو پارەیەکی زۆر وەک سزای زۆر لەباوکی وەردەگرێت، بۆیە لەئەحمەد ئاغا داوا دەکات کارێک بکات زوڵمەکەی سەر باوکی کەمێک سووک بکاتەوە، بۆیەش ئەویش گفتی ئەوەی پێدەدات کە پارەتی باوکی بدات، لە بەرامبەر ئەوەش ئەو بەڵێنی ئەوەی پێدەدات سەفەری میسر بکاتو لە قاهیرە سەرۆکی سوپای فەرەنسییانی بۆ بکوژێت، ئەو قسەیەش پاش ئەوە کراوە کە سوپای عوسمانی بەشکاوی و لە بەرەی میسری بەرامبەر فەرەنسییەکان گەڕاوەتەوە سوریا، بۆیەش سلێمان ئەلحەلەبی بەو داوایە ئەو رازی دەبێت، ئەحمەد ئاغا سلێمان رەوانەی لای یاسین ئاغای حاکمی غەزەی دەکات، ئەویش برێک پارەی سەفەرەکەی دەداتێ تا بگاتە قاهیرە.

سلێمان ئەلحەلەبی پارەکە وەردەگرێتو بەڵێن دەداتو بەرەو میسر بەڕێ بکەوێت، بەمەرجێک ئەو ناحەقیانەی دەرحەق بە باوکی لەحەلەب کراوە هەڵگیرێت، ئەو لەگەڵ بازرگانەکان دەکەوێتە رێو بەرەو قاهیرە دەڕوات، پاش رۆیشتنی شەش رۆژ لەرۆژی ١٤ی مایو دەگاتە قاهیرە. سلێمان زووتر شاری قاهیرەی دیبوو، لەوێ سێ ساڵ ژیا بوو، لە ئەلئەزهەر بۆ وەرگرتنی زانست لە قاهیرە ماوەتەوە، کە دەگاتەوە قاهیرە دەچێتە لای کۆنە مامۆستا هاوڕێیە تورکەکەی کە خۆشنووسی بووەو ناوی مەستەفا ئەفەندی بروسلی بووە، لەودەمانە خانەخوێیەکەی تەمەنی نزیکەی هەشتا ساڵ دەبوو، ئەو لەسەردەمی منداڵییدا دەرسی لەلای ئەو

خوێنـد بـوو، یەکەم شـەوی مـانەوەی لەقـاهیرە وەک میـوان لەلای کـۆنە مامۆستایە پیـرەکەی دەمێنێتەوە، بەڵام لەلای ئەو هیچ نادرکێنێت، بـۆ مـانەوەو گـوزەرانی ڕۆژانەکەی ڕوو لەمزگەوتـی ئەلـئەزهەر دەکـات، لەوێ تێکەڵی خوێنـدکارەکان دەبێـت. لەنـاو فێرخوازەکانـدا مـاوەی یەک مانـگ دەمێنێتەوە، لەوانە (ئەحمەد ئەلوالی)و (موحەممەد ئەلـغەزی)و (عەبـدولا ئەلغەزی)و (عەبدولقادر ئەلغەزی) دیـارە ئەوانە بـرا نەبـوون، بەڵام لەبەر ئەوەی هاوڵاتی شاری غەززە بـوون بـۆیە نازناوەکانیـان وەک یەک بـووە. ئەو مەبەسـتی هـاتنەکەی خـۆی بۆیـان ڕوون دەکـاتەوەو بەوردی باسـی بەرنامەکەیان بۆ دەکات، بەڵام چوار کەسەکە کە گوێیـان لەقسەکانی ئەو دەبێت بە کەسێکی سەرلێشێواوو بەدرۆزنی دەشوبهێنن، داواشیان کردبـوو لەو قسانەی خۆی پەشیمان ببێـتەوەو کەسـانی نائاگـاداری وەک ئەوان بەو تـاوانە نەبەسـتێتەوە، بەڵام ئەو گـوێ بەئامۆژگارییەکانیـان نـادات. لەبەرئەوەی کلیبەر لەشاری جیزە بووە بۆیە لەرۆژی ١٢ ی یونیـۆ سەفەری جیـزە دەکـات، لە کەسـانی داودەستەکەی ئەو دەزانێت ژەنەراڵ کلیبەر کەی‌و چۆن دێتە دەرەوەو ئێوارانیش لە بـاخچەی سەرکردایەتی سەرا لە ئەزبەکییە پیاسە دەکات.

ئێوارەیەکیـان سـلێمان ئەلحەلەبـی کۆشـش دەکـات بچێـتە نـاو بـاخچەکە، بەڵام بـۆی مەیسـەر نابێـت، شـەوەکەی لە مـزگەوتەکە دەمێنێـتەوەو لە بەیـانی رۆژی ١٤ ی مـانگی یونیـۆدا هەنگاوەکـانی ژەنەراڵ هەڵـدەگرێتـو لە نـاوچەی ئەلمنیـل دەچێـتە بـاخچەکەو لە داوی ئەودا دەگەڕێتەوە قاهیرەو دەتوانی بەدزەدزە بگاتە ناو باخچەی سـەرکردایەتی گشتی، تـا دەگـاتە ئەو هەیـوانەی کە دەسـتدرێژییەکەی تێـدا ئەنجـام

دەدات. کە بکوژەکە دان بەتاوانەکەی دادەنێت، فەرمان دەدەن هەر چوار کەسەکەی ئەلئەزهەر دەستگیر بکەن، چونکە ناویان لەنێفادەکەی سلێمان ئەلحەلەبیدا هاتبوو، لەوانە سێ کەسیان دەگیرێن و کەسی چوارەمیان کە عەبدولقادر ئەلغەزی بوو رادەکات، کە لێکۆڵینەوە لەگەڵ سێ کەسەکە دەکرێت، ئەوان نکۆڵی لەناسینی ئەو کەسە دەکەن.

## لێکۆڵینەوەو دادگاییکردنەکە

ژەنەراڵ مینو یەکێک بوو لەئەفسەرە گەورەکانی سوپای فەرەنسی و قوماندەری قاهیرە بوو، پۆستی ژەنەراڵە کوژراوەکە وەردەگرێت، ئەو فەرمان دەدات لە دادگایەکی سەربازیی دادگایی سلێمان ئەلحەلەبی بکرێت، کە لەنۆ گەورە ئەفسەری سوپاو بەسەرۆکایەتی ژەنەراڵ رینیە پێکهاتبوو، ئەرکی داواکارە گشتییەکەش دەسپێرن بەقومیسێر سارتلۆنی بەرێوەبەری نەبەردییەکانی سوپا، لەرۆژی ١٥ی مانگی یونیۆدا دادگاکە کۆدەبێتەوەو سەرۆکی دادگاو داواکارەکە کار بۆ لێکۆڵینەوە دەکەن بۆ کۆکردنەوەی هەموو سەرەتاییەکان بۆ دۆزینەوەو دەستنیشانکردنی بکوژەکانو یاریدەرەکانی ئەو لەو تاوانەدا. قومیسێر سارتلۆن دەست بەلێکۆڵینەوەی دۆسییەکە دەکات، کۆنووسەکە بەوەرگرتنی لێدوانی سلێمان ئەلحەلەبی دەست پێدەکات، لەوانە شاهێدەکانیش ئامادە دەبن، جۆزیف بیران کە یەکێک بوو لە سوارەکانی پاسەوانی ئەوو سوار رۆبرت کە سلێمانیان لەناو باخچەکەدا کە لەپشت دیوارەکە بەخوێنەکە

دۆزیــوەتەوە دەبــنە شــاهێدی دۆزەکە، کەســە تاوانبــارەکەش بەجلــی بەخــوێنەوە دەگیرێــت، ئەوان بەو شـێوەیەو بەو جـلەوە دەیگــرن، ئەوان پاش سـەعاتێک لەروودانــی تــاوانەکە دەیـدۆزنەوەو خەنجەرەکەشـی لەبـن خۆڵەوە دەردەهێنن، کە هێشتا خوێن بەجەوهەرەکەییەوە مابوو.

# لێکۆڵینەوە

لێکــۆڵەوەرەکە دەچێــتە مــاڵی ئەنــدازیار بروتــان ئەوەی لە کــاتی رووداوەکە لەگەڵ ژنەراڵ کلیبەربــوو، ئەویــش لەئەنجــامی برینــداربوونی لەسەر جێگا کەوتبوو، ئەو یەکەم شاهێدی حاڵی کوشتنەکە بووە، وتبووی من بەدارێک لە بکوژەکەم داوەو کۆششم کردووە لەژنەراڵی دووربخەمەوە، بەڵام ئەو زۆرتــر خــۆی پێــوە نووســاندەو منــی دایە بەر زەبــری زۆرتــری خەنـجەرەکەی، منـیش پـاش ئەو دەسـتکردنەوەو پێکـانەکەم بـوورامەوەو ئاگام لەخۆم نەما. بەڵام دیـارە پـاش ئەوەی ژنەراڵ بـانگی پاسـەوانەکانی دەکـاتو هـاواری لــێ هەڵدەسـتێت دە دەقەیەک پــاش رووداوەکە ئینجـا بەهانــای ئەو دەگەن، ئەو پاســەوانە بەبینینـــی بکـــوژەکە یەکســەر دەیناسێتەوە.

دیفــوجی ئەفســەر کە پــاوەری ژنەراڵ بــوو، ئیفــادەی ئەویـــش وەردەگیرێت، ئەو وتبووی ئەو رۆژە کە من هاوڕێیەتی ژنەراڵ کلیبەرم لە بارەگای سەرکردایەتی گشتی لە قاهیرە دەکرد هەستم دەکرد ئەو پیـاوە زۆر لەو نزیــک دەکەوتەوەو شــوێن پێــی ئــێمە دەکەوت، ئــێمە هەســتمان

دەکرد ئەو کرێکارێکی کارکەری نۆژەنکردنەوەی سەرایەکەیە، بۆیە زۆر گومانمان لەسەر نەبوو، بەڵام هەستمان دەکرد کە ژەنەراڵ لەباخچەکە دەردەچێتو روو لەماڵی داماسی سەرۆک ئەرکانی جەنگ دەکات، ئەو دوو بەدوویان دەهات، ئەو پرسیبووی چیت دەوێت...؟ بۆیە فەرمان دەدا ئەو پیاوە دەربکەن، خزمەتکارەکان سلێمان ئەلحەلەبی لەو ناوچەیە دەردەکەن، پاش دوو سەعات لەو پێشهاتە تاوانەکە دەکاتو کارەساتەکە دەقەومێت. دیفوج کە پشکنین لەچەند پارچە جلێکی پیاوە بکوژەکە دەکات کە لەشوێنی رووداوەکە بەدڕاوی هەڵدەگرنەوە، دڵنیا دەبێت کە ئەو کەسە بکوژەکەیە. لێکۆڵەوەرەکە دووبارە ئیفادەی سلێمان ئەلحەلەبی وەردەگرێتەوە، مسیو براسفیش کە گەورە وەرگێڕی سەرۆکایەتی ئەرکانی جەنگ بوو کاری وەرگێڕی بۆ ئەو دەکرد، تاوانبارەکە دووبارە هەمان دانپێدانانەکەی جاری پێشووی دەڵێتەوە، کە هەردوو ئەفسەری سوپای عوسمانی ئەحمەد ئاغاو یاسین ئاغا ئەویان هانداوە بۆ کوشتنی ژەنەراڵ کلیبەر، ئەحمەد ئاغا بۆیەش ئەوی هەڵبژاردووە، چونکە ماوەی سێ ساڵ لەقاهیرە ژیاوەو ئەو شارە باش شارەزایەو لەزانکۆی ئەلئەزهەر دەرسی خوێندووە، دووبارە دەڵێتەوە کە ئەو بەرنامەی کوشتنی ژەنەراڵ کلیبەری بەو چوار کەسە غەززەییەکە وتووە، ئەوەشی رۆژانە پێ وتوون، بەڵام ئەوان ئامۆژگاریان کردووە ئەو کارە نەکاتو لەو دەستدرێژییە پەشیمان بێتەوە، چونکە زۆر زەحمەتە ئەو کارەی بەسەرکەوتوویی پێ ئەنجام بدرێت. لێکۆڵەوەرەکە بڕیار دەدات تاوانبارەکە رووبەرووی هەر سێ پیاوە غەززەییەکان بکاتەوەو لەو بارەوە لێدوانیان لێوەرگرێت، مەبەستیش لەوە ئەوە بوو سەرە داوێک لەوە بدۆزنەوە ئەگەر شێخ ئەلشرقاوی شێخی

ئەلـئەزهەر دەسـتی لەو پـلانەدا هەبوویـت، بەلام لەکۆتاییـدا دەرچـوو شـێخەکەی ئەلـئەزهەر لەدوورو نـزیکەوە دەسـتی لەو کوشـتنەدا نەبـووەو بکوژەکەیان هان نەداوە ئەو کارە بکات.

## سزای مردن

لەئەنجامی لێکۆڵینەوەکانـدا دەرکەوت سـلێمان ئەلحەلەبـیو چـوار کەسـەکەی ئەلـئەزهەر رۆڵیـان لەو تـاوانەدا هەبـووە، هەروەهـا مەسـتەفا ئەفەنـدی ئەلبرسـلی کە سـلێمان لە یەکەم رۆژی گەیشـتنی بەقـاهیرە میوانی ئەو بووە، بۆیە ئەویش یەکێک بووە لە شەش کەسە تاوانبـارەکە، بەلام کەسی چوارەم لەبەرئەوەی را دەکـات، بـۆیە ئەو حـوکمی غیـابی بـۆ ئەویش دەردەکەن. لەبەرئەوەی تاوانبارەکان پـارێزەری تایبەتیـان نەبـووە تـا لەپێش دادگا بەرگرییـان لێ بکـات، بـۆیە دادگا وەرگێـرەکەی دادگا لۆماکا دەکاتە پارێزەری تاوانبارەکان.

دادگـا سـەربازییەکە لەرۆژی ١٦ی یونیـۆ دادەنیشـێت، لەوێ گـوێ لەلێـدوانی تاوانبارەکـانو داواکـاری تاوانبارەکـان دەگرێـت، بـۆیەش داواکـارەکە داوای سـزای پێویسـت بـۆ تاوانبارەکـان دەکـات، تـۆمەتەکە دەخـرێتە سـەر سـەدەری ئەلئەعـزەم یوسف پاشـا، ئەحمەد ئاغـاش بەوە تاوانبـار دەکرێـت کە هـانی سـلێمان ئەلحەلەبـی داوە بـۆ ئەنجامـدانی تاوانەکەی، ئەوەی وەزیرەکەیان نەفرەتی لێ دەکـات، کە لەو تـوورە بـوو بەوەش ویستوویەتی رەزاو متمانەی خۆی دووبارە بۆ وەزیرەکەیـان دووپـات

بکاتەوە، بۆیە تاوانبار ئەو تاوانەی کردووە. چوار شێخەکەی ئەلئەزهەریش بەوە تاوانبار دەکەن کە ئاگاداری پلانەکە بووینو کەسیان شکاتیان لێی نەکردووەو دەزگا بەرپرسەکانیان ئاگادار نەکردۆتەوە، بەوەش دەکرێ بەهاوبەش لەتاوانەکە بزانرێن، بەڵام مەستەفا ئەفەندی لەبەرئەوەی هیچ تاوانێکی لەسەر نابێتە ماڵ بۆیە ئەو ئازاد دەکرێت، تاوانبار سلێمان ئەلحەلەبیش بەوە سزا دەدرێت کە ئەو دەستەی تاوانەکەی پێ ئەنجامداوە بسوتێندرێتو پاشان لەسێدارە بدرێتو تەرمەکەشی داڵو زیندەوەر بیخۆن، هەروەها هەر چوار شێخەکەی ئەلئەزهەریش سەریان بپەڕێنن. کە دادگا بڕیارەکەی خۆی دەخوێنێتەوە داوا لەتاوانبارەکان دەکەن بەرگری لەخۆیان بکەن، بەڵام ئەوان هیچیان نەبوو بیڵێن، بۆیە تاوانبارەکان دەبەنەوە زیندانو هۆڵەکە چۆڵ دەکەن تا دوا دانوستانی خۆیان لەسەر بڕیارەکان بکەن. لەکۆتاییدا دادگا دوا بڕیاری پێویستی خۆی بەتاوانبارکردنی سلێمان ئەلحەلەبیو هەر چوار شێخەکەی ئەلئەزهەر دەردەکات، سەبارەت بەمەستەفا ئەفەندییش بێتاوان دەکرێت، کە بڕیارەکە دەردەچێت دەستی سلێمان دەسوتێننو پاش لەسێدارەدانی تەرمەکەی بۆ تەیرو داڵ جێدەهێڵن، لەبەر ئەوەی یەکێک لەتاوانبارەکان نەگیرابوو، بۆیە سێ تاوانبارەکەی تر سەریان دەبڕنو دەسوتێندرێن، سامانی کەسە هەڵاتووەکەش عەبدولقادر ئەلغەززییش دەستبەسەر دەکەن.

# ئەلجبرتی دەڵێت:

پاش سێ رۆژ لەجێبەجێکردنی سزای تاوانبارەکان هەموو لایەک دەکەونەخۆ بۆ بەرێکردنی تەرمی ژەنەراڵ کلیبەر، لەجیاتی ئەو (عەبدوڵلا جاک منو)یان دانابوو، رۆژی چوارەمی پاش کارەساتەکە دەکاتە رۆژی سێشەممەی بیستو پێنجی مانگی موحەرەم، ڕێکەوتی ١٨ ی مانگی یونیۆی ساڵی ١٨٩٩ی زایینی بڕیار دەدەن شارەکە خاوێن بکەنەوەو دەزگاکانی پۆلیس کەوتنەخۆ بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی جوانکردنی قاهیرە.

لەناو سەربازەکانیان لەتایفەی قبتییەکانو شوامەکان دەستەیەکیان لەسوارەو پیادە بۆ بەرێکردنی جەنازەکە دەستنیشان دەکەن، تەرمەکەش لەناو سەندوقێکی تەقەمەنی سەرداخراو دادەنێن، سەندوقەکەیان لەسەر گالیسکەیەک دادەنێن، کە بەقەدیفەی رەش پێچرابوو، لەتەنیشت ئەویشەوە کەرەستەکانی خۆیو شیرو ئەو خەنجەری پێیان کوشتبوو دادەنێن، چوار دەهۆڵ دەنگی دەهاتو سەربازەکانیانیش کە قۆڵیان بەنیشانەی رەش بەسترابوو، بۆ ڕێزگرتنی بەرێکردنی تەرمەکە چەکەکانیان نەوی کردبووو بەهێواشی دەرۆیشتن، کە جەنازەکە رادەکێشنە دەرەوە، دەنگی تۆپ هاویشتنو تفەنگ تەقاند دەبیسترا، لەماڵەکەی خۆی لەئەزبەکییە لەدەروازەی خولق هێنایانە دەرەوەو بەرەو کۆڵانی جمابیزو پاشان بەرەو ناسرییە تەرمەکەیان بەرێکرد تا گەیشتنە تەل ئەلعەقارب کە قەڵایەکیان تێدا دروستکردبوو، سلێمان ئەلحەلەبیو

سێ تاوانبارەکەی تریشیان راگرتبوو، تەرمەکەیان گەیاندە دەروازەی کۆشکی ئەلعەینی، تابووتەکە دادەگرنو، لەناو چوارچێوەیەکی داردا دایدەنێن، کە لەسەر بەرزاییەنی خۆڵ دانرابوو، بەداری سەرووو بەپەردەیەکی سپی دایانپۆشی، لەپێشەوەی دوو سەربازیش ئامادەباش وەستابوون، ئەوانە بەشەوو بەرۆژ بەدیار تابووتەکەوە وەستابوون. بەوەش پەیامە سەربازییەکەی دوماهی دێتو عەبدوڵڵا جاکی قائیمقامی کۆن ئەوەی گوایە بۆتە موسڵمانو ژنێکی موسڵمانیشی هێنابوو، جێگەی ئەوی گرتۆتەوە. لەودەمانەدا پرسیارێکی ئامادە هەبوو ئایا سلێمان ئەلحەلەبی بەراستی بکوژی بەکرێگیراو بوو، یان پاڵەوانێکی دژ بەداگیرکەری راستی بوو، ئەوەشیان تا ئیمڕۆ بەشاراوەیی ماوەتەوەو لەلایەن توێژەرەکانیش دیارو روون نییە، بەڵام ناوی ئەو پیاوە بووەتە بەشێک لەمێژووی میللەتانی عەرەبی.

# مارتن لۆسەر کینگ

گاندی زنجەکان، لەناو گۆڕەکەیدا
سەردەکەوێت...

# کوشتنی خەونەکە

لەڕۆژی ٤ ی مانگی ئەپریلی ساڵی ١٩٦٨ بەگوللەیەک کۆتایی بە ژیانی مارتن لۆسەر کینگ دەهێندرێت، ئەو پیاوە ئەندازیاری بزاڤی مافە مەدەنیەکان بۆ ناشتیو، سەرۆکو پێشەوای ئەو بزاڤە بوو لەولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە ئەو کوژراوە تەمەنی ٣٩ ساڵ بوو، ٢٠٠ هەزار کەس ئامادەی مەراسیمی ناشتنی تەرمەکەی بوون. لەو ڕۆژەی ئەو تیرۆرکرا، ئەو سەرپەرشتیو سەرکردایەتی هەڵمەتی هەژارەکانی ئەمریکای دەکرد، کە تێداو لەگەڵ ڕەشپێستەکاندا پاشماوەو زبڵەکانیان کۆ دەکردەوەو بەزۆری لەلایەن ئەوانیشەوە ئەو پاشماوانە فڕێ دەدرانە شوێنە گشتییو گەڕەکەکانەوە، ئەو لەو کۆبوونەوەیەدا وتەیەکی پێشکەشی ئامادەبووان کردبوو کە تێیدا وتبووی:

من تێناگەم لەوەمانە چ ڕوودەدات، ئێمە ڕۆژانی سەختمان لەپێش دایە، ئێستا ئەو مەسەلانە سەرقاڵم ناکات، چونکە من گەیشتوومەتە لووتکەی چیایەکەو مەسەلەکە ئاسایییە، منیش وەک هەموو کەسێک دەمەوێ ئاسوودە بژیمو ژیانێکی دوورودرێژ بەرێ بکەم، دیارە تەمەنی درێژیش شوێنی تایبەتیشی دەوێت.

لەو ساڵەدا ڕووداوی گەورە قەوماوە، پێشهاتی سیاسی سەرەنجراکێش بەرپابووە، لەئەمریکا سیناتۆر ڕۆبرت کەنەدی لەڕۆژی ٥ ی یونیۆی ساڵی ١٩٦٨ کوژراوە. ئەو کە وەزیری داد بووە بواری سازکردووە تا چالاکوانانی مافەکانی مرۆڤ کارگەرو بەپشتیوان بن. کە مارتن لۆسەر دەکوژرێت کاری

ئاشــوبەو ئــاڵۆزیی لەواشــنتۆنی پایتەخــت روو دەدات، لەوێشــەوە ئەو توندوتیژیانە دەگاتە زۆرتر لەسەد شاری تری ئەمریکا، ئەوەش مەترسی ئەوەی پەیــدا دەکــرد کە هەمــوو کۆششــەکانی ئاشــتیی ئەمریکــاییە ئەفریقییە رەشەکان بەفیرۆ بچێتو کاری توندکاریی جێگەی بگرێتەوەو شەڕی نەژادیی ســەخت بێتە ئــاراوە. دیــارە پێش رووداوەکەو لە پــاش کوشــتنەکەش دۆســتانو دەســتە نــزیکەکەی مــارتن لۆســەر هەســتیان بەگۆڕانێک دەکردو مەترسی تەقینەوەیان هەبوو.

## ژیاننامەی مارتن لۆسەر

مارتن لۆسەر لەرۆژی ١٥ ی یەنــایەری ســاڵی ١٩٢٩ لە شــاری ئەتلانتــای ئەمریکــی لەدایکبــووە، ئەویــش وەک رەشــە ئەمریکییەکــانی تــر بەرەچەڵەکەوە لەوڵاتــانی ئەفریقیــاوە لەرەگ هەڵکەنــدراوەو گەیشــتووتە ئەمریکا، لەوێش فرۆشراوەو کڕاوەتەوە. ئەوان جەستەیان دەبەخشــییە خزمەتکردنــی ئەمــریکییە سپیپێســتەکان. کینگــی بــاوک بۆچــوونی فرەرەهەندی هەبوو، ئەو رێبەرایەتی کەنیسەیەکی گچکە کردووە، زووتــر لە کۆلیژی مۆر هاوس خوێنــدوویەتی، کە خوێنــدنی تەواو کردووە لەمــاڵی ویلیــامزی زاوایانــدا ژیــاوە، کە ئەویــش لە خەبــاتەکەی بــۆ مــافی رەشپێستەکان هاوشانو هاوخەبــاتی بــووە. مــارتن لەو کــاروانەدا لەســەر رێ باوکو باپیری لەسەر ئەو خەباتە کارگەربووە، تا بووە بە کەسێکی ناودارو چالاک لەداواکردنی مافی مەدەنیی رەشپێستەکان لە ئەتلانتــا، کە هەمــوو

شێوەکانی نەژادپەرستی تێدا بەکارهاتووە، ئەو زۆرجار کە بۆی نەکراوە بەیەکسانی لەگەڵ رەگەزەکەی تردا یەکسان بێت، دایکەکان بواریان نەداوە منداڵەکانیان بەیەکەوە یاری بکەنو تێکەڵی یەکتربین، بۆیە ئەو بەناچاریی گریاوە. ئەودەمانە ئەو کورە باش لە ژیان تێگەیشتووەو دەیزانی بۆ کردەوەکان بەو شێوەیە رێ دەکات، بەڵام بەردەوام قسەکانی دایکی لەبیر ماوە کە وتوویەتی:

کورم زۆر بایەخ بەو مەسەلەیە مەدە با ئەوەیان کارت لێ نەکات، خۆت لەسپییەکان بەکەمتر مەزانە، تۆ لەهیچ کەسێکی تر کەمتر نیت.

ئەو سەردەمەش دەگوزەرێتو مارتن لەساڵی ۱۹۳۵ دەچێتە قوتابخانەی گشتی، لەوێشەوە دەچێتە کارگەی تایبەت لەزانکۆی ئەتلانتا، پاشان پەیوەندی بەقوتابخانەی بۆکری واشنتۆنەوە دەکات، لەوێش لە خوێندن لەسەر هاورێیەکانی پێشدەکەوێتو لە کۆتایی ساڵی ۱۹٤۲ دا دەچێتە زانکۆو لەکولێژی مۆر هاوس وەردەگیرێت، لەوێ بەباشی خودی خۆی دەدۆزێتەوەو تێدەگات ئەو دەکارێت بەو راژەیە بگاتە ئاستێکی باڵا بۆ خزمەتکردنی هەموو جیهان. ئەو لەساڵی ۱۹٤۷دا دەبێتە یاریدەری باوکی لەکەنیسەکەی ئەودا، لەساڵی ۱۹٤۸ بەکالۆریس لەئەدەب وەردەگرێت، کە تەمەنی هێشتا نەگەیشتبووە ۱۹ ساڵ، لەو تەمەنەدا کیژێکی رەشپێست بەناوی کۆریتا سکۆت دەناسێتو لەساڵی ۱۹۵۳ پرۆسەی هاوسەرگیریی دەکەن، لەسەر خوێندنەکەی بەردەوام دەبێت تا ئەوەی لەزانکۆی بۆستن دکتۆرا لەفەلسەفە وەردەگرێت. لەبەر رۆشنایییو شارەزابوونی رێنماییەکانی فەلسەفەکەی مەهماتا گاندی (۱۸٦۹_۱۹٤۸) کە بەفەلسەفەی ناتوندوتیژی دەناسرا، مارتن سەفەری هیند دەکات،

هەروەها لەسەر خوێندنەکەی بەردەوام دەبێتو لەسەر ڕێبازی ئاشتیانەو سەرسام بوونی بەگاندی بەردەوام دەبێت، بۆیەش لەپاشاندا ژنەکەی کۆریتا سکۆت کینگ وتبووی مارتن گاندی بەباوکی ڕۆحی سیاسیی خۆی دەزانی. نیلسۆن ماندیلا لەوتاری وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی لەساڵی ١٩٩٣دا ئاماژە بەرۆڵە گرینگەکەی ئەو دەدات، کە ئەو کۆششی زۆری کردووە بۆ بنبڕکردنی دیاردەی نەژادپەرستی بۆ بەرجەستەکردنو بەرقراربوونی کەرامەتی مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە.

# خاڵی وەرچەرخان

مارتن لۆسەر لەگەڵ هاوسەرەکەی لەمانگی سپتەمبەری ساڵی ١٩٥٤ دەچێتە شاری مۆنتیگۆمری کە پاشان دەبێتە مەیدانی خەباتەکەی. لەو شارەدا ڕەشەکان زۆر ستەمیان لێدەکرا، باریان گرانبوو، جۆرەها شێوەی ئەشکەنجەیان دەرهەق دەکرا، بەتایبەتی کۆمپانیای هێڵەکانی گواستنەوەی پاسەکان دژایەتی زۆری ڕەشپێستەکانی دەکرد، لەوێدا کورسییەکانی پێشەوە بۆ سپییەکانو بەشی دواوەی کورسییەکانیش تایبەت بووە بەرەشپێستەکان، بۆیە شوفێرەکان مافی ئەوەیان هەبوو نەفەرە ڕەشپێستەکان ڕەوانەی پشتەوەی پاسەکان بکەن، ئەگەر مەبەستیان بوایە کورسییەکانی پێشەوە بەکاربهێنن، زۆرجاریش شوفێرەکان گاڵتەیان پێدەکردن، چونکە ئەوان دەبووایە بێنە پێشەوەو لەلای شوفێرەکان پارەکانیان بدەن، کە پارەی پلیتیان داوە دووبارە

ڕەشەکان دەبووایە دابەزنو لەدەرگای پشتەوە سوار ببنەوە، چونکە بۆیان نەبووە بەپێش سپییەکاندا بچنە پشتەوە، لەودەمانەش زۆر لە شوفێرەکان کە ڕەشەکان پارەیان داوەو بۆ ئەوەی لە دەرگای پشتەوە سواربینەوە، بۆی دەرچوونو ئەفەرە ڕەشەکانیان لە ناوەندی شەقامەکاندا جێهێشتووەو گاڵتەیان پێکردوون. ئەو جۆرە ڕەفتارە تا مانگی دیسمبەری ساڵی ١٩٥٥ بەردەوامو پەیڕەو بووە، کە تێیدا ژنێکی ڕەشی تەونکەر ڕازی نەبووە شوێنەکەی خۆی لەبەشی ڕەشەکاندا بۆ پیاوێکی سپی چۆڵ بکات، کە پیاوە سپییەکە شوێنی بەتاڵ لە بەشی پێشەوەی تایبەتی بەسپییەکان نادۆزێتەوە، دەچێتە پشتەوەی بەشی ڕەشەکانو لەسەر ئەو ژنە ماندووە رادەوەستێتو داوای لێ دەکات شوێنەکەی بۆ چۆڵ بکات، بەڵام ژنەکە ڕازی نابێت، کە شوفێرەکە تێدەگات ژنێکی ڕەش لەبەشەکەی خۆیاندا ڕازی نابێت شوێنەکەی خۆی بۆ پیاوێکی سپیپێست چۆڵ بکات پاسەکە ڕادەگرێتو داوای پۆلیسی بۆ دەکات تا ناچاری بکات لە شوێنەکەی خۆی هەڵسێتەوەدو شوێنەکەی بداتە ئەو پیاوە سپییە تا لەسەری دابنیشێت. ئەو ڕووداوە گەورە دەبێتو دەبێتە سەرە داوی خەباتی کینگ بۆ یەکسانی ڕەشەکانی ئەمریکا.

## بەرگرییەکی سلبی

ئەو ڕووداوەو کاریگەرەکانی نیشانەی ئەوەی دەگەیاند کە توندوتیژی لێ دەکەوێتەوەو خوێنی تێدا دەڕژێت، بەڵام مارتن لۆسەر ئامادە دەبێتو

کۆشش دەکات خەباتەکەی بەرەو ئاقارێکی تر بباتو پەیڕەو بەرنامەی ئاشتیانە خۆی بکاتو خەڵکەکە لە توندوتیژیی دووربخاتەوە، بۆیەش داوای بەرگری دەکات لەسەر بنچینەی ناتوندوتیژیی، یان بەرگریی سلبی، لەو خەباتەشدا بەردەوام ئاماژەی بەفەرموودەکانی حەزرەتی مەسیح رەزای خودای لەسەر بێت دەدات کە فەرموویەتی:

دوژمنەکانتان خۆش بوێت، موبارەکی لەعنەتەکانیان بکەن، ئەوانەی خراپەتان لەگەڵدا دەکەن بەچاکە رەفتاریان لەگەڵدا بکەنەوە، نوێژ بۆ ئەو کەسانە بکەن کە ئازارتان دەدەنو لەماڵەکانتاندا دەرتاندەپەڕێنن.

ئەو هەڵمەتەی خەباتی مارتن لۆسەر بوژانەوەو سەردەمێکی نوێی لەژیانی رەشپێستەکاندا پەیداکردووە. مارتن لۆسەر لەسەرەتای خەباتەکەیدا داوای کردووە هەموو رەشەکان پاسی ئۆتۆپاسەکان بۆ گواستنەوە بۆ ماوەی یەک ساڵ بەکارنەهێنن، دیارە کە رێژەی بەکارهێنانی رەشەکان بۆ ئەو پاسی سەرجەم هێڵەکانی هاوتوچۆ دەگەیشتە ٧٠%، ئەوەشیان ژمارەیەکی بەرزو دیار بووە.

لە بەرامبەر خەباتی لۆسەر بەرووی نەیارەکانیدا کۆششیان دەکرد بیانوێک بدۆزنەوە تا مارتن لۆسەر زیندانیی بکەن، بەلام بیانوێکی بەرجەستەیان نەبوو تا ئەوە بکەن، بۆیە بەتۆمەتی ئەوەی کە ئەو ئۆتۆمبێلی بەخێرایی لەسی میل لە سەعاتێکدا لێخوڕیوە، کە دەبوایە خێراییەکەی تەنها بیستو پێنج میل بووایە لەسەعاتێکدا، دەسەلاتدارەکانی شارەکە مارتن دەگرن، کە مارتن دەگیرێت تا زۆرتر ئیهانەی بکەنو سووکی بکەن لەزینداندا دەخرێتە ژوورێکی پڕە لە

کەسانی گیراو لەسەر بەدمەستیو دزیو بەدکاری ناپەسندو بکوژان. بەو گرتنەی کە جاری یەکەمی بووە لە رووی نەفسییەوە زۆر کاریگەری نەگەتیڤی لەسەر دەکات، لەوێ لەناو زیندانەکەدا مامەڵەی نادروستی لەگەڵدا دەکەن، هەروەها لەناو زیندانەکەش کاری زۆر نارەوای نامرۆڤانەش دەبینێت، بەڵام ئەو بەکەفالەیو زەمانەتی تایبەتی ئازاد دەبێت.

چوار رۆژ پاش ئەو رووداوەو لەرۆژی ٢٠ ی مانگی یەنایەری ساڵی ١٩٥٦دا لەکاتێکدا ئەو وتاری بۆ هەوادارانی پێشکەش دەکرد، نارنجۆکێک دەخەنە ماڵەکەی، ئەو تەقینەوە زۆری نەمابوو هاوسەرەکەیو کورەکەی لەناوبچن، کە دەگاتە شوێنی رووداوەکە دەبینی دەستەیەک رەشپێستی چەکداری هەوادارانی ئەو کۆبوونەتەودو بەتوورەییەوە داواکارن بوار بدات تۆڵەی ئەو تەقینەوەیە بکەن، بەڵام ئەو بەرەوشتە نەرمەکەو بەرنامە تایبەتییە ئاشتیخوازییەکە هەڵچوونی خەڵکەکە سارد دەکاتەوەو شاری مۆنتیگۆمری لە تەقینەوەو کاولکارییەک دوور دەکاتەوە، لەوێدا بەئامادەبووان دەڵێت،

واز لەئاڵۆزی بهێنن، ئەوەی نارەحەتو بێزارتان دەکەن دووری بخەنەوە، ئێمە هەرگیز لەگەڵ توندوتیژیدا نابین.

ئەو لەگەڵ دەستەیەک لە هەڤاڵانی بەتۆمەتی پلاندانان بۆ بەربەستدانان لە راپەراندنی کارەکان بەبێ بوونی هیچ بیانووی یاسایی لە دەڤەرەکە دەگیرێت. مارتن دەگیرێت تا ئەودەمانەی چوار ژنی رەشپێست داوا لە دادگای یەکێتی دەکەن نەژادپەرستی لەناو پاسەکانی مۆنتیگۆمری هەڵگرن، تا چیتر بێرێزی لە رەشپێستەکان بەو پاسانە

نەکرێت، بۆیەش دادگا بڕیار دەدات ئەو نایاساییە نەمێنێت، بەوەش دووبارە پاسەکان لەلایەن ڕەشەکانەوە بەکاردەهێندرێتەوەو ئەویش لەزینداندا ئازاد دەکرێت.

## لەسەر ڕێبازی گاندییەوە

کینگ یەکێکە لە دامەزێنەرانی کۆنگرەی سەرکردایەتی کریستیانییەکانی خواروو کە لە ساڵی ۱۹۵۷ بەستراوە، ئەوەش هەڤاڵبەندییەک بوو لە نێوان پیاوە ئایینە ڕەشەکانو کەنیسەی ڕەشەکانە، مەبەستو بەرنامەشیان کارکردن بوو بۆ لابردنی کارەکانی نەژادپەرستی، سەرکردەکانی ئەو کۆنگرەیە هیواخوازبوون بتوانن رای گشتی بگۆڕنو بەڕووی ئەو بڕگە یاساییانە بوەستن کە داکۆکی لەنەژادپەرستی دەکات، کە کۆمەڵەی نەتەوەیی ڕەنگینەکان (ملەوەنەکان)ی بەرەو پێشەوەچوون دەبرد. کینگ هێزی سەرەکیی دینامیکی کۆنگرەکە بوو، ئەویش ببووە سەرچاوەی یەکەمو هاندەری باشی کۆکردنەوەی کۆمەکەکانو نەخشەسازی بالادەستی تەکتیک، ئەو توانیبووی هەڤاڵبەندیی لەگەڵ سپییەکان لە دەڤەرەکانی باکووردا بکات، تا لەگەڵ ڕەشەکاندا سۆزداربن.

لەساڵی ۱۹۵۱ دەچێتە وڵاتی هیندستانو لەوێ لەگەڵ هەوادارانی گاندی کۆدەبێتەوەو باس لەهەزرەکانی نارەزایی کۆمەلایەتی ئاشتیانەیان لەگەڵدا سازدەکات. لەمانگی یونیۆی ساڵی ۱۹٥٧و لەتەمەنی بیستو حەوت

ساڵیدا مارتن لۆسەر گچکەترین کەس‌و قەشە بووە کە مەدالیای سینگارنی وەرگرتووە، کە ساڵانە دەدرێتە ئەو کەسانەی لەبواری کارکردن بۆ بنبڕکردنی نەژادپەرستی چالاکن. لەو بۆنەیەداو لەپێش پەیکەری ئابراهام لینکۆڵن، مارتن کینگ وتارێک پێشکەش دەکات کە تێیدا هەردوو حزبە سەرەکییەکەی وڵات کۆماری‌و دیموکراسی شەرمەزار دەکات، لەوێش هاوارە بەناوبانگەکەی کە تێدا هاواری کردبوو، مافی دەنگدانم پێ رەوا ببینن دەکات، بەوەش ئەو توانیبووی پێنج ملیۆن کەسی رەشپێست لەخوارووەدا بۆ دەنگدان ناونووس بکات.

لەرۆژی ١٩ی سپتەمبەری هەمان ساڵدا مارتن لۆسەر لەناو بوتیکێکی سپیپێستێکدا لەناو جەرگەی شاری گراهارلمدا، ژنێکی سپی پڕ جنێوی دەکاتو لەعنەتی دەکات، بەوەش ناوەستێت ژنەکە زۆر تووڕە دەبێتو دەست دەداتە ئەو چەقۆ تیژەی نامەی پێدەکرێتەوەو بەرەو رووی مارتنی دەباتو لەسینگی گیر دەکاتو ئازاری دەدات، بۆیە لەبەر ترسناکی رەوشی تەندروستی ئەو بەخێرایی دەگەیەندرێتە نزیکترین نەخۆشخانە، پۆلیسیش لێکۆڵینەوە لەگەڵ ژنە دەستدرێژیکەرەکە دەکات، لەئەنجامدا ژنەکە رەوانەی نەخۆشخانەیەکی نەخۆشییە دەروونییەکان دەکەن.

مارتن لە خەباتەکەی بۆ مافی رەشپێستەکان کۆڵ نادات‌و بەردەوام دەبێت لەسەر خەباتە ئاشتییانەکەی، بەڵام رۆژێکیان لەناکاوو لەکردەوەیەکی چاوەڕواننەکراودا زەبرێکی کوشندەی بەردەکەوێت، ئەوەشیان هەنگاوەکانی دەشێوێنێتو خەباتەکەی دژ بەنەژادپەرستییەکەی شپرزە دەکات، کە لەرۆژی ١٧ی فبرایەری ساڵی ١٩٥٩ پۆلیس لەنووسینگەکەی خۆیدا لەئەتلانتا بەبیانووی ئەوەی گوایە

زانیارییەکانی پێشکەشی باجی داهاتی کردوون دەرکەوتووە ساختە بوونو بەو بیانوویە دەستگیری دەکەن، ئەویش بەو تۆمەتبارکردنە سەرسام دەبێتو بەتووڕەییەوە دەڵێت:

ئەگەر من بەمەزندەی ئێوە کەسێکی دروستو ساڵح نیم، بەلام تاکە فەزیلە کەمن زۆر پەیوەستم پێوەی هەیە ئەویش ئەمانەتە.

لەبەرئەوەی دۆزی ولایەتەکە زۆر لاوازو بێ بەڵگەبوون، بۆیە ئەو زوو بەکەفالەت ئازاد دەبێت.

## مانگرتنو ڕێپێوانەکان

کە جۆن کەنەدی پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار وەردەگرێت، مارتن لۆسەر خەباتەکەی گەرمترو بەجۆشتر دەکات تا حکومەتی فیدراڵ لە کێشەو ڕۆژەڤی خەباتەکەی لە پێناوی بنبڕکردنی نەژادپەرستی بەشدار بێت. بەلام کەنەدی زیرەکانە خۆی لەو داوەی مارتن لۆسەر دەرباز دەکات، کە حکومەتی بە لاواز لەو مەسەلەیە پێناسە دەکردو بەوەی کە ناتوانن ئەو مەسەلە چارەنووسسازانە بەیەکجاری ببڕنەوە.

لەوێیەوەو لەکۆتاییەکانی هاوینی ساڵی ١٩٦٢ەوە مارتن لۆسەر بڕیار دەدات لە شاری برمنگهام زنجیرەیەک خۆپیشاندان بۆ هاندانی هەستی کۆمەلایەتی بکات، کە لە شێوەی نمایشێکی نموونەیی بێتو لەسەر شەقامە سەرەکییەکانەوە بێت، بۆ بەیانییەکەی شەڕێک لە نێوان خۆپیشاندەرە ڕەشپێستەکانو پۆلیسە سپیپێستەکان دەقەومێت، کە

بەدارو سەگی پۆلیسی بەربوونەتە گیانی رەشەکان، لەکۆتاییدا بڕیار دەدرێت هەموو جۆرە نارەزاییو خۆپیشانو بایکۆتو مانگرتنێک قەدەغە بکرێت. لە پاش ئەو بڕیارە مارتن بۆ یەکەمجارو بەئاشکرا سەرپێچی حوکمێکی دادگا دەکاتو خۆپێشاندانێک ساز دەکاتو خۆی لەپێشیاندا دەڕواتو هەزارەها کەسی رەشپێستیش دەکەونە شوێنی، کە بەیەک دەنگ هاواریان دەکرد:

ئازادی لە برمنگهام سەریهەڵدا.

بە تەواوبوونی خۆپێشاندانەکە مارتن دەگیرێتو دەخرێتە ناو زیندانێکی تاکەکەسییەوە، لەوێیەوە پەیامە گرنگەکەی دەنووسێت کە پاشان دەبێتە سەرچاوەیەکی بایەخدار لەبزافەکانی مافی مەدەنی، لەنامەکەیدا ئەو جەختی لەسەر خەباتی مەدەنی دوور لە بەرنامەی توندوتیژیی دەکردەوە.

## منداڵان لەپێشەوە

کە مارتن لە زیندان ئازاد دەبێت ئەو راستەوخۆ رێبەرایەتی خۆپێشاندانەکان دەکاتو دەبێتە رابەری بزافەکە، لەودەمانەدا بیر لەوە دەکاتەوە لەو بزافەو لەو بوارە ئاشتیانەدا منداڵان بەکاربهێنێت، بەڵام کەم کەس هەبوو بەرگەی ئەو بەرپرسییەتیە بگرێت کە منداڵان لەو نارەزاییانەدا تێوەبگلێنێت نەوەک لەو چالاکییەدا یەکێکیان بکوژرێت، بەوەش مەسەلەکە ترسناکتر دەبێت، بەڵام ئەو سوور دەبێت لەسەر

بەرنامەکەی خۆی‌و بوار دەدات هەزارەها مندالٚ بەشداریی خۆپیشاندانەکان بکاتو لەریزی پیشەوەش بوەستن‌و رووبەرووی پیاوانی پۆلیس‌و پیاوانی ئاگرکوژینەرەوەکان‌و سەگە پۆلیسییە درندەکان ببنەوە.

لەخۆپیشاندانەکاندا پۆلیس هەلە مەزنەکەی خۆی دەکات، هیزو توندوتیژی زۆری بەرووی مندالٚەکان بەکارهینا، منداڵی تەمەنی شەش ساڵانەش کەوتنە بەر کەلبەی سەگە پۆلیسییە درەکان‌و کەوتنە بەر دارو دەستی گەورەی پۆلیسەکان، ئەو دیمەنانەش ملیۆنەها کەسیان لەو کردەوە درندانە بەئاگاهیناو وینەکان لەهەموو دونیا بلاوبوونەوە، بەوەش مارتن لۆسەر توانی تەنگژەیەک دروست بکات کە خۆی مەبەستی بوو، بەوەش فشارەکەی توندتر دەکاتو بەئاشکرا پییان دەلێت،

من ئامادەم دانوستان بکەم، بەلام وەک کەسێکی بەهێزو بەپشتیوان دێمە ئەو مەیدانە. هاولاتییە سپییەکان کەوتنەخۆ بۆ سازکردنی دانوستان لەگەلٚ سەرکردە رەشەکان، دانوستانەکان بەگرانی‌و بەسەختی دەرۆیشت، لەئەنجامدا بریار وەردەگرن بەرنامەکانی نەژادپەرستی‌و جیاکردنەوەکان لاببەن، سیستەمێکی یەکسان پەسند بکەن‌و گیراوەکانی خۆپیشاندانەکانیش بەناچاری ئازاد دەکەن. بەلام هەندێک لەسپییە داخ لەدلٚەکان بەو بەرنامە رازی نابن، نارنجۆک لەمالٚی سەرکردە رەشەکان دەگرن‌و دەیان ئۆتۆمبێل دەسوتێنن‌و هەندێک لەکۆگاکانیشیان دەسوتێنن، بۆیەش سەرۆک جۆن کەنەدی بەناچاری حالٚەتی ئامادەباشی سەربازی رادەگەیەنێتو هێزەکانی سوپا دەهێنێتە خوارەوە، بەلام مارتن لۆسەر خەلٚکەکە سارد دەکاتەوە. زۆربەی ئەوانەی پێشەنگی ئەو بزافە بوون ئەندامان‌و هەلٚسوڕێنەرانی بزافی برمنگهام بوون، بۆیەش ئەو

چەندین سەردانی سەركەوتووی ئەنجامدا، تێدا هەستی كرد ئەو خەڵكە لەچ هەڵچوونو كوڵانێكی گەرمنو، تووڕەییە سەد ساڵییەكەیان چەند كوشندەیە.

## تووڕەیی ڕەشپێستەكان

ئەو ڕووداوو پێشهاتانە ڕێخۆشكەر بوو ڕەشپێستەكانی ئەمریكا لەساڵی ١٩٦٣ گەورەترین ڕێپێوان بۆ بەردەم پەیكەری ئابراهام لینكۆڵن بكەن، لە ژمارەو جۆری پرۆسەكە نمونەی نەبووە، كە تێدا ٢٥٠ هەزار كەس تێدا بەشدار دەبن، لەوانە ٦٠ هەزاریان ئەمریكییە سپییەكان بوون، ئەوەش مەزنترین پرۆسە بوو لەمێژووی خەباتی بەرقەرارکردنی مافە مەدەنییەكان، لەوێ مارتن لۆسەر وتارە بەنرخەكەی بەناوی (من خەون دەبینم) دەخوێنێتەوە، كە تێدا وتبووی:

من خەون بەوە دەبینم ڕۆژێ دێ هەر چوار منداڵەكەم لەرەوشێكدا دەژین، لەناو میللەتێكدا دەژین كەس لەسەر ڕەنگی پێستەكەی حوكمی لەسەر ناكرێت، بەڵكو بڕیارەكان لەسەر ڕەوشتەكانی وەردەگیرێت، نەك لەبەر ڕەنگەكەی.

هەروەها مارتن لۆسەر لەو كۆبوونەوەیەدا بەئامادەبووانی ڕێپێوانەكەی وتبوو:

وادەزانم ئەو خەڵكە بۆ ئەوە كۆبوونەتەوە تا قەرزێكی موستەحەق وەرگرنەوە، كە ئەمریكا قەرزارەو نەیداوەتەوە، لە جیاتی ئەوەی

پەیمانەکەی بەرامبەر رەشپێستەکان جێبەجێ بکات. ئەو چەکێکی بێ رەسیدو سەرمایەی پێ داون، لەسەر چەکەکەش بۆیان نووسیون رەسیدتان نییەو بۆیەش ناکرێ چەکەکەتان سەرف بکرێت.

لەو دیمانە جەماوەرییە مەزنەدا دڵەکان بەگەرمی لێدەدرانو هەموو ئامادەبووان دەلەرزین، بەڵام هەست دەکرا زەنگەکانی ئازادی لێدەدرا، پاش ١٨ رۆژ لەو رووداوە، مارتن لۆسەرو ملیۆنەها کەس لە ئەمریکا گوێیان لە هەواڵێکی وەحشیانە بوو، ئەویش فرێدانی نارنجۆکێک بوو بۆ ناو کەنیسەی مەعمەدانی، لەو کاتەدا لەناو کەنیسەکەدا چەندین قوتابی رەشپێست لە رۆژی یەکشەممەی رەشپێستیەکان کۆببوونەوە، بۆیەش دووبارە خەڵکەکە لە شاری برمنگهام بەتووڕەییەوە دەرژێنەوە ناو شەقامەکان، دووبارە وەرزێکی تری توندوتیژی هەڵدەگیرسێتەوە.

## خەڵاتی نۆبل

لەهەمان ساڵدا گۆڤاری تایم ناو لەمارتن لۆسەر دەنێت (پیاوی ساڵەکە)، ئەوەش یەکەمجارە ئەو نازناوە بەر پیاوێکی رەشپێست دەکەوێت، تا ساڵی ١٩٦٤ لەبەر خەباتە بەردەوامە شێلگیرانەکەی بۆ ئاشتیو ئاسوودەیی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی بەردەکەوێت، بەوەش ئەو گچکەترین کەسە ئەو خەڵاتە وەردەگرێت، مارتن لەو ساڵەدا تەمەنی تەنها ٣٥ ساڵان بوو. لەپاش وەرگرتنی ئەو خەڵاتە لۆسەر لەسەر خەباتەکەی بۆ یەکسانی بەردەوام دەبێت، ئەو جارە داوا دەکات

دابەشکردنی دلهاتی رەشو سپییەکان یەکسان بێت، چونکە بێکاری لەناو رەشەکاندا زۆر دەبێت، باج وەرگرەکان کە ساڵانە باج وەردەگرن هیچیان لەناو رەشەکاندا پێ پەیدا نابێت، هەروەها کۆمپانیاکانی ئەمویلیش دووچاری شکانی مانگانەو هەفتانە لەسەر دەستی نانەواو گۆشتفرۆشەکان دەبنەوە، تا شکانو زیانەکان دەگاتە دیوارە لارە رووخاوەکانو کەرەستەی توالێتە تێکچووەکانو مشکو جرجو ئەسپێیەکانیش..

## کوشتنەکەی مارتن لۆسەر

لەرۆژی ١٤ ی فبرایەری ساڵی ١٩٦٨ مارتن لۆسەر کینگ لەگەڵ خەونەکانیدا تیرۆر دەکرێت، پیاوێکی توندڕەوی سپیپێست بەناوی (جیمس ئارل رای) بەگوللەی تفەنگەکەی دەیکوژێت، کە لەودەمانە سەرقاڵی پێشەوایەتیکردنی رێپێوانێکی رەشپێستەکان بوو بۆ پشتیوانکردنی مانگرتنی کرێکارە پاککەرەوەکان، کە بڕیاربوو لەسەد شاری ئەمریکی ساز بکرێت. بکوژەکە دەگیرێتو لەدادگادا زیندانی ٩٩ ساڵی بۆ دەبڕنەوە، دەنگۆی ئەوەش هەبوو گوایە کوشتنەکە بەبەرنامەو پلان بووەو بکوژەکە تەنها کەسێکی بەکرێگیراوو ئالەتێک بووەو بەس!

ئەگەرچی مارتن لۆسەر تیرۆرکرا، بەڵام بەرنامەو مەبەستەکانی هاتنە دی، لەولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەموو جۆرەکانی ئەژادپەرستی هەڵدەگیرێت، تاکی رەشپێست دەبێتە خاوەن هەموو

مافەکانی هاولاتیبوون، بۆیەش چەند کەسیان پۆستی بالاش لە حکومەتی فیدرالی وەردەگرن، لەوانە (کۆلن پاول) کە کرابووە سەرۆکی هەیئەتی ئەرکانی سوپای ئەمریکیو پاشان دەبێتە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا.

(کۆندالیزا رایس)ی وەزیری دەرەوەی پێشوو، ئێستاش ٥٠ ئەندامی کۆنگرێس بەرەچەلەک ئەفریقینو هەموویان دەسەلاتی سیاسی مەزنو دیاریشیان هەیە، لەوانە سەرۆکایەتی لیژنەی دارایش لەکۆنگرێس دەکەن، نەک هەر ئەوانەو بەس، مەسەلەکە لەو رۆژانە گەیشتە سەرۆک کۆمارو دەسەلاتی بالای ئەمریکاش کە لەکەسایەتی (باراک ئوباما)وە دیارە، ئەویش لەرەچەلەکی ئەو رەشانەیەو باپیرانی ئەوانەش بەدەستی سپییەکان جەلدەیان خواردووەو بەزنجیرەوە کەلەپچەکراونو کڕینو فرۆشتنیان لەسەر کراوە.

سالی ٢٠٠٨ کۆنگرێسی ئەمریکی لە یادی چل سالەی تیرۆرکردنی مارتن لۆسەری بەرگریکەر لە مافی ئەفریقییەکانی ناو ئەمریکا بۆنەیەکی تایبەت ساز دەکەن. ئەوەش بە رێپێوانێکی جەماوەریی بووە کە هەزارەها کەس لە شاری مەمفیسی ئەمریکی لەبەر لێزمەی باراندا مۆمیان بۆ رۆحی پاکی ئەو داگیرساندبوو، کە خەباتی بێ وچانیی بۆ مافی رەشەکانی ئەمریکا کردبوو. ئەمریکییەکان سالانە لە رۆژی ٢ی یەنایەردا یادی ژیانو کارنامەی مارتن لۆسەر کینگی قەشە دەکەنەوەو لە مەلبەندو زانکۆکانی ئەمریکی چەندین بڕوانامەو مۆلەتی رەسمیش دابەش دەکەن.

## لەقسەکانی مارتن لۆسەری خەباتگێڕدا:

❖ هەندێ کەس وادەزانن ئەو شێوە خەباتەی ئێمە شێوازی کەسانی ترسنۆکە، بەڵام لەراستییدا ئەو بەرگرییە ئاشتیانە فاکتەرێکە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هەموو شێوەکانی شەڕو خراپەکاری، ئێمە بۆ وەرگرتنی مافەکانمان توندوتیژیی بەرەوا نازانین، چونکە توندوتیژی جەستەیی رەق دروست دەکاتو درێژەش بەکارە توندەکان دەداتو کەمی ناکاتەوە، بەرنامەکانی توندڕەوییش بەبێ دەسکەوت بەردەوام دەبێت، ئێمە پشتمان بەئاوەزو هەستە مرۆییەکان بەستووەو دەمانەوێ بەرامبەرەکەمان رازی بکەین کە ئەوە هەڵەیە، بەوەش بەزمانی مرۆیانە قسەیان لەگەڵدا دەکەین نەک بەشێوەیەکی وەحشیانە، کۆشش دەکەین بەرۆح بگەینە یەک، ئەو شێوەیەش لە رووی جەستەییەوە سلبییە، بەڵام کاریگەریی رۆحانی دەبێت.

❖ بەربەرەکانێی ئاشتیانە هەرگیز بۆ شکانو نسکۆی بەرامبەرو رەزیلکردنی نەیارەکەت نییە، بەڵکو بۆ وەرگرتنەوەو دۆستایەتی پەیداکردن دەبێت، بایکۆتو یارمەتی نەدانیش شێوەیەکە لە شێوەکانی ئاشتیانەی بەرگری تا نەیارەکەت ناچار بکەیتو هوشیاری بکەیتەوە تا وەک مرۆڤێک هەست بەشەرمکردن بکات.

❖ ئێمە کەسانی سپیپێستمان وەک خۆمان خۆشدەوێت، رقمان لەو رەگەزە نییە، تەنها ئێمە دژایەتی شەڕو خراپەکارییەکانی ئەوان

دەکەین، نەک کەسەکان، کۆشش دەکەین بۆ رووخاندنو شکاندنی شەڕو بەدکاریی، بۆ قوربانیدانی زۆر کار ناکەین، بەربەرەکانێیەکان لە نێوان رەشپێستو سپیپێستدا نییە، ململانێیەکە لە نێوان دادپەروەریو ستەمە دایە، سەرکەوتن بۆ رەشەکان مسۆگەر نییە بەسەر سپییەکان، سەرکەوتنەکان مسۆگەرە بۆ حەقو شکانی جۆرەکانی ستەمو زوڵم.

❖ ئەگەر خۆت پشتت نەوی نەبێت، کەس ناتوانێت سواری پشتت بێت.

❖ کارەسات لە زوڵمو دەستدرێژیی بەدکاراندا نییە، بەڵکو کارەساتەکە لە وەدایە کە تاکە باشەکان بێدەنگن.

# گاندی

کوشتنی گاندی کوشتنی رۆحێکی پیرۆز بوو
هەتا کوژرا ئەو بۆ خۆشەویستی و ئاشتی دەژیا

موهنداس کارامشند گاندی لەرۆژی ٢ ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٨٦٩ لەشاری پوربندر لەدایکبووە، تا تەمەنی حەوت ساڵی ئەو لەو شارەدا دەمینێتەوە، ئەو کوڕی گچکەی باوکی بووە لە ژنی چوارەمییەوە، کە بەرەگەز دەگەڕێتەوە سەر تیرەی بانیا. بۆ تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ گاندی دەچێتە زانکۆی سامالداس لەبهافناجار، بەڵام لەوێ ژیانی مسۆگەر نابێتو نارەحەت دەبێت، بۆیە دەگەڕێتەوە ماڵەوە، بۆیەش هاوڕێیەکانی هانی دەدەن بۆ خوێندن بچێتە لەندەنو لەوێ بابەتی یاسا بخوێنێت، پاش ماوەیەک دوودڵی لەمانگی سپتەمبەری ساڵی ١٨٨٧ لەشاری بۆمباوە بەرەو لەندەن بەڕێدەکەوێت، پاش چوار ساڵو تەواوکردنی خوێندنی یاسا دەگەڕێتەوە هیندستانو لەوێ نووسینگەی پارێزەریی دەکاتەوە، بەڵام لەو کارەدا سەرناکەوێت. کۆمپانیایەکی بازرگانی کە شارەکەیان بنکە سەرەکییەکەیان لەخوارووی ئەفریقیا دەبێت بانگهێشتی ئەو دەکات بچێتە ئەو وڵاتە تا لەوێ لە دۆزی دۆسیەیەکی لقەکەیان بەرگریی بکات، بۆیەش ئەو داواکە قبووڵ دەکاتو لە مانگی ئەپریلی ساڵی ١٨٩٣ سەفەری وڵاتی خوارووی ئەفریقیا دەکات، تا دۆزەکە تەواو دەبێت ساڵێک لەوێ دەمینێتەوە، بەڵام ئەو پاش تەواوبوونی دۆزەکە ناگەڕێتەوەو مانەوەکەی ماوەی بیست ساڵ دەخایەنێت.

لەخوارووی ئەفریقیا گاندی هەست بەدیاردەی نەژادپەرستی بەشێوەیەکی ناشیرین دەکات، لەوێ هەستدەکات چۆن سپییەکان مامەڵە لەگەڵ رەشپێستەکان دەکەن، بەتایبەتی هیندییەکان، چۆن ئیهانەو سووکایەتیان پێ دەکەن. کە دەچێتە دادگا لەوێ قازییەکە داوای لێدەکات سەرپۆشەکەی داگرێت، بەڵام ئەو رازی نابێت، بۆیە زووری

دادگاکە جێدەهێڵێت.

پاش چەند رۆژێک گاندی بۆ سەردانی بریتۆریا سواری شەمەندەفەر دەبێت، لەئیستگەکە پلیتی پلەی یەکەمی پێشەوە دەبڕێت، بۆیەش دەچێتە بەشی پێشەوەی شەمەندەفەرەکە، بەڵام کە پشکێنەری پلیتەکە ئەو لەو پلەیەدا دەبینێت داوای لێ دەکات شوێنەکەی بگوازێتەوە شوێنی پلەی دووەم کە تایبەتە بەکەسی ملەوەنەکان، هەروەها پلیتبڕەکەش ئیهانەی دەکاتو سووکایەتی پێدەکات، بەناوی (ساتی) بانگی دەکات، ئەو زاراوەیەش وشەیەکە وەک سووکایەتی لەوڵاتی خوارووی ئەفریقیا کارمەندانی شەمەندەفەرەکان بەرەوەندی هیندییەکان دەڵێنەوە، لەوێش هیندییەکانیان بەناوی (کولی) بانگ دەکرد، ئەوەش لەهیند مانای کۆڵهەڵگر دەگەیەنێت، بۆیە بەگاندی پارێزەریان دەوت کولی، لەوێ گاندی لەنزیکەوە هەست بەچەوسانەوەو سووکایەتیکردن لە کۆمەڵگای خوارووی ئەفریقیا دەکات.

کە لەساڵی ١٩٠١ شەڕی بویر تەواو دەبێت گاندی دەگەڕێتەوە بۆمبای تا کاری پارێزگاری بکات، بەڵام تەنها چەند هەفتەیەک ئەو کارە دەکاتو لەسەر داوای رەوەندی هیندی لەکۆتایی ساڵی ١٩٠٢ دووبارە دەگەڕێتەوە وڵاتی خوارووی ئەفریقیا. گاندی دەبینێت ردوشو گوزەرانی هیندییەکانی هەرێمی ترسفال کە ببووە کۆلۆنیلێکی بەریتانی بەرەو خراپی دەچێت، مەرجو کۆتەکانی سەر کەسە ملەوەنەکان توندترو ناخۆشتر دەبێت، چاودێری لەسەر کۆچکردنیان توندتر دەبێت، تا دەنگی هیندیی دیارو بیستراو بێت گاندی لەساڵی ١٩٠٣ رۆژنامەیەکی هەفتانە بەناوی (رامانی هیندی) دەردەکات، لەوێدا باس لەکێشەو گرفتی زۆری هیندییەکان

دەکـات، پـاش مـاوەیەک بڕیـاردەدات بـۆ نیشـتەجێبوونی مـاڵەکەی بگوازێتەوە جوهانسبرگ.

* * *

حکـومەتی هەرێمـی ترسـڤال لەسـاڵی ١٩٠٦ کـار بـۆ ئەوە دەکـات یاساییەک دەربکات کە تێدا چاودێری بخرێتە سەر گواستنەوەو گەڕان بەناو خاکی خوارووی ئەفریقیادا، ئەوەی شایانی باسە لەبڕگەکانی ئەو یاساییەدا هاتووە کە هەموو هیندییەکی تەمەن هەشت ساڵانەو بەسەرەوە دەبێ پەنجەمۆری هەبێت، ئەوەی لەو بڕیارەش دوا بکەوێتو سەرپێچی بنوێنێت سزا دەدرێت، هەروەها مافـو بواریش درابوو پیاوانی ئاسایش بـۆ گەڕانو دۆزیـنەوەی ئەو کەسـانەی پەنجەمۆریـان نەکـردووە بچـنە نـاو ماڵەکانیان، بۆیەش هەزارەها هاوڵاتی هیندی بۆ ناڕەزایی دەربڕین لەسەر ئەو یاسایە دەڕژێنە شـەقامەکان، ناویـان لەیاساکەش نـابوو (تەشـریعی رەشەکان)، هەموویان سوێند دەخۆن تـا دوا هەناسە دژایەتـی ئەو یاسـایە بکەنو کار بـۆ سـەرنەگرتنی بـکەن، رۆژنـامەکەی گاندی رامانی هینـدی وزەو هێـزی بەرگـریو بەرهەڵسـتیەکەی توندو قـایمتر دەکـرد، بەوەش هیندییەکان پشتیان ئەستوور دەبێت، بڕیار دەدەن بزاڤی (ساتیا جراها) دامەزرێـنن، نـاوەکەش پابەنـدبوون بەهێـزی راسـتی دەگەیانـد. دژایەتیکردنی یاسایە تایبەتییەکە بەهیندییەکان تـا ئۆکتـۆبەری سـاڵی ١٩٠٦ بەردەوام بـوو، گانـدی سـەرۆکایەتی وەفـدێکی دەکـرد بـۆ دیمـانەی وەزیـری مسـتعمراتی بەریتـانیو وەزیـری هینـد، هێشـتا وەفـدەکە لەنـاو پاپۆڕی گەڕانەوەیاندا بوون حکومەتی بەریتانی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی

یاساکە رادەگەیەنێتو لەبەیانەکەدا رادەگەیەنێت کە بەریتانیا بەهیچ شێوەیەک بوار نادات ئەو جۆرە یاسایانە تێبپەڕێت، بەڵام کە وەفدەکە دەگاتەوە کیپ تاون، حکومەتی ترنسفال پەسندکردنی یاساکە رادەگەیەنێت، بۆیەش لە مانگی مایوی ساڵی ١٩٠٦ یاساکە رادەگەیەندرێت.

پاش دەرچوونی ئەو یاسایە حکومەتی ترنسفال بڕیار دەدات ئاسیاییەکان بۆیان نییە پێ لەناو خاکی حکومەتی ئەوان دابنێن، بەرنامە نەژادپەرستییەکان بەردەوام دەبێت تا رۆژێکیان دادگای باڵا لە خوارووی ئەفریقیا بڕیارێک دەردەکات کە ئەوان لە خوارووی ئەفریقیا تەنها دان بەو هاوسەرگیریە دەنێن کە لە نێوان دوو تاکی کریستیانی ناونووسکراوی بڕواپێکراو دەبەسترێت، دیارە ئەو بڕیارە لەلایەن رەوەندی هیندییەوە زۆر بەتووڕەییەوە وەردەگیردرێت. لەوەدەمانەش حکومەت داوا لەو هیندیانە دەکات ئەوانەی مۆڵەتی کاریان لەکانەکاندا تەواو بووەو دەیانەوێ لەهەرێمەکە بمێننەوە دەبێ باجێکی ساڵانە بە بەهای سێ پاوەندی ئیسترلینی بدەن، دیارە ئەو پارەیەش بۆ داهاتی کەسێکی کرێکاری هیندی زۆر بووە، ئەوەش پلانێک بووە تا کرێکارەکان ناچار بکەن بۆنەدەکانی کارکردنیان مۆر بکەنەوە، ئەگەرچی رۆژانەکانیشیان لەچاو کارە قورسەکانیانو مەترسییە دژوارەکانیان سەریان کەم بووە. بەڵام هێزە چەکدارەکانی حکومەت بەتوندیو بەچەک وەڵامی نارەزاییەکانیان داوەتەوە، هەمووشیان ناچار کردبوو بگەڕێنەوە سەر کارەکانیان لەکانەکاندا، پۆلیس بەقامچیو بەچەکەکانیانەوە وەک کۆیلەکان خەڵکەکەیان دەدایە پێش خۆیانەوە، لەو رۆژانەو لەکاریگەری

ئەو رەوشەش گاندی ماوەی دوو مانگ دەکەوێتە زیندانەوە. بەڵام گاندی بۆ مافی رەوای هیندییەکان کۆڵ ناداتو بەردەوام خەبات دەکات، تا لەمانگی یەنایەری ساڵی ١٩١٤ لەگەڵ دەسەڵاتداران دەگەنە رێکەوتنێک کە تێیدا باجەکان هەڵدەگرنو ناچار دەبن رازی بن هیندییەکانیش بەپێی دابونەریتو رێنماییە ئاینەکانیان پرۆسەی هاوسەگیری بکەن، ئەوەش یەکەم سەرکەوتنی گاندی بوو لەکۆششو بزاڤەکانیدا.

## موستەعمەرەیەکی نوێ

لەرۆژانی جەنگی یەکەم جیهانیدا گاندی بەدرێژیو بەپانی لەناو وڵاتی هیندستان دەگەڕاو بەچاوی خۆی دیمەنەکانی دەبینیو هەواڵەکانی دەبیست، کە دیمەنە جەرگبڕەکانی برسیەتیو دواکەوتووی میللەتەکەی دەبینێت دڵی توند دەبێت، لەساڵی ١٩١٥ بڕیار دەدات لەشاری ئەحمەد ئاباد بژیت، لەوێش نووسینگەیەک دەکاتەوە، لەو شارەدا یەکەم کۆلۆنێلی گچکە بەناوی (ساتیا جراها ئاشرام) کە ماناکەی دەکاتە کۆلۆنێلێک دوور لەکردەوەی توندوتیژیو پشت ئەستوور بەراستییەکان رادەگەیەنێت، دانیشتووانی ئەو هەوارە، یان ئەندامەکانی سەرەتا تەنها بیستو پێنج کەسی نێرو مێو تەمەنی جیاواز بوون، بەڵێن دەدەن ئیلتزام بەراستییەکان بکەن، دادپەروەری بکەنە بەرنامە، بڕیار دەدەن ژن نەهێنن، دەستدرێژی نەکەن، ئاشتی پەیامو بەرنامەیان بێت، بەهیچ شێوەیەک دزی نەکەن، هیچ موڵکوماڵیان نەوێت، خواردن زۆر

سەرف نەکەن، کارکەری خەڵکەکە بزو بەس و چاویان لەهیچ خۆشییەکی دونیا نەبێت. ئەو لە ساڵی ۱۹۱٦ پێشەوایەتی هەڵمەتێک دەکات دژ بەناردنی کرێکاری هیندی بۆ هەموو وڵاتانی مستعمرەی بەریتانی، پاش خەباتو کۆششێکی بێوچان لەو هەڵمەتەدا سەردەکەوێتو حکومەتی بەریتانی واز لەو بەرنامەیە دەهێنێت.

لەساڵی ۱۹۱۷ گاندی لەسەر داوای جوتیاران کە بێکاریی بەخۆراییان بۆ سەرمایەدارە ئەوروپییەکان بەزەبری یاساو توندوتیژی پێدەکەن دەچێتە ولایەتی بیهار، لەوێ خاوەن کێڵگەکانو دەسەڵاتدارەکان بەتوندی دژایەتی دەکەن، بەڵام ئەو لەسەر خەباتی ئاشتیانەی خۆی بەردەوام دەبێت تا لەدۆزەکەی سەردەکەوێتو مەسەلەکە لەبەرژەوەندی هیندییەکان دەباتەوە. گاندی لەشامبارانەوە دەچێتە خیدا لەولایەتی جوجارت بۆ یارمەتیدانی جوتیارەکان بۆ کەمکردنەوەی ئەو باجەی حکومەت بۆیانی بڕیونەتەوە، لەوێ بەجوتیارەکان دەڵێت کەستان باج مەدەن، تا حکومەت ناچاردەبێت پارەکە کەم دەکاتەوە، بۆیەش حکومەت بەناچاری باجەکەی سەریان کەم دەکاتەوە.

## داوای دڵخوازکار

لەبەرئەوەی کەسایەتی گاندی دەبێتە واقیعێک ناکرێ گوێی لێ رانەگیرێت، بۆیە جێگری پاشا لەبەستنی کۆنگرەی حزب کە لەساڵی ۱۹۱۸ لەنیودەلهی دەبەسترێت داوەتی دەکات، لەوێ پرسی ئەوەی پێ

دەکەن بۆ بەشداریی هیندییەکان لەخزمەتی سەربازیی‌و دڵخوازکار لەدەرەوەی هیند، دیارە کە ئەو مەسەلەکە بەئەرێی دەزانێت، بۆیە رازی دەبێت، بەڵام هیندییەکان بیرۆکەکەی رەت دەکەنەوەو نارەزایی توندی لێ دەکەوێتەوە.

گاندی‌و ئازادیخوازانی هەموو هیند پەرۆش بوون بەریتانیا جەنگەکە بباتەوەو تا میللەتی هیندیش ئازادییەکانی دەست بکەوێت، لەبەرامبەر ئەو هیواو ئاواتانە حکومەتی بەریتانی پرۆژەی یاساییەکی بەناوی (قانون رولات)ی پێشکەش ئەنجوومەنی یاسادانانی هیندی کردبوو، کە لەبرگەکانیدا چەندین بەربەستو کۆت لەپێش ئازادیيە گشتییەکان دادەنێت، دەسەڵاتی رەهاش دەداتە دەسەڵاتی جێبەجێکردن بۆ گرتن‌و زیندانی بێ دادگایکردنێکی باوەرپێکراو، کە تێدا بۆ یەکەمجار گاندی لەدانووستانەکانی ئەنجوومەنی یاسادانان بەئامادەبوونی جێگری پاشا ئامادە دەبێت، کە گاندی لەو دانیشتنە دەردەچێت بڕیار دەدات بەتوندی بەرهەڵستی حوکمی بەریتانی بکات، ئەو خەباتو بەرگرییەش لەساڵی ١٩١٩ دەست پێدەکات تا سەربەخۆیی هیند لەساڵی ١٩٤٨ درێژەی دەبێت. گاندی دەست دەکات بەخەباتێکی ئاشتیانەو لەناو وڵاتەکەی بۆ گەیاندنی پەیامەکەی بۆ سەربەخۆیی هیند دەسووڕێتەوە، تا رۆژێکیان بڕیار دەدات مانگرتنی سەرتاسەری رابگەیەندرێت، ئەوەش هەمووڵایەک پەسەندی دەکات، لەرۆژی ٣٠ مارس‌و لەرۆژی ٦ ی ئەپریل ئەو بەرنامەیە جێبەجێ دەکرێت، بەوەش هەموو کارەکان لەناو هیندا دەوەستێت، ئەوەش حکومەتی هیندی باش نیگەران‌و سەرسام کردبوو کە چۆن ملیۆنەها کەس لەو وڵاتە گوێرایەڵی ئەو پیاوە دەبن، کە ماوەیەک وەک

چاوێشرو خزمەتكارێكی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی سەیریان كردووە، چۆن بووە ئەو كەسە قارەمانە، چۆن بەرووپاندا راوەستاوە...؟ بۆیە حكومەت بەناچاری لەویلایەتی پەنجاب باری نائاسایی رادەگەیەنێت، بواریش لەسەفەرەكانی گاندی دەگرن.

## كۆمەڵكوژییەكەی ئامریتسار

لەرۆژی ۱۳ ی ئەپریلی ساڵی ۱۹۱۹ ژەنەراڵ دایەر سەركردەی سەربازگەی بەریتانی لەئامریتسار فەرمان دەدات تەقە لەهەموو كەسێك بكەن، دەست لە گوللەبارانی خەڵكەكە نەپارێزن، ژن و منداڵ و پیر بكوژن، ئەوانەی لەباخچەیەكی شوورەدار بەبۆنەی سەرە ساڵی هیندی كۆبوونەتەوەو كەسیان دەرباز نەكەن، بۆیەش رووی تۆپەكانیان لە دەروازەی باخچەكە دەكەن، تەقە لەخەڵكی ناو باخچەكە دەكەن، لەبەرئەوەی دیوارو شوورەی باخچەكە ئەوەندە بەرزبووە، خەڵكەكە بۆیان نەكراوە بەسەر دیوارەكە هەڵبگەڕێن و دەربازیان بێت، لەو كارەساتەدا خەڵكێكی زۆری تێدا كوژرا، وەك ئەوە بوو كە چۆن چەند مشكێك بەتەڵەوە بوو و رووبەڕوو تەقەیان لێ بكریت، دیمەنەكە لەو شێوەیە بوو، لەو رووداوە خوێناوییەدا چوار سەد كەس كوژران و هەزارەها كەسیش بریندار بوون.

كۆمەڵكوژییەكەی رۆژی ۱۳ ی ئەپریلی ساڵی ۱۹۱۹ بۆ گاندی هەموو رامانەكانی بۆ ئیمپراتۆریەتی بەریتانی دەگۆڕێت، سیاسەتمدارەكانی

بەریتانی ئەو ڕۆژەیان بەڕۆژێکی ڕەش لە مێژووی هیند ناوبرد، ئەوەش بووە دابڕانو لێکترازنێکی ترسناک لەجەستەی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی لە هیند، گاندی تا ڕۆژی پێش ئەو ڕووداوە خویناوییە هەڵوێستێکی ئارامی بەرامبەر بەریتانیا هەبوو، بەڵام لەو ڕۆژەوە تێگەیشت ئەوان شەڕو بەدکاری بۆ هیند دەخوازێتو مەبەستیان بەرژەوەندی هیند نییە، بۆیە ناچار دەبن کار بۆ ئۆتۆنۆمی بکەن لەناو چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتەکەو لەدەرەوەش، لەبەر بوونی ناکۆکیو ململانێیش لەنێوان هاوڵاتییە هیندییە موسڵمانەکانو هیندۆسەکان، بۆیە نەدەکرا کار بۆ سەربەخۆیی هیند بکرێت، دەبوواپە بەرنامەی نزیکبوونەوەیان بۆ ساز بکرێتو لەو لایەنە کۆک بن تا بوار خۆش بێت بۆ سەربەخۆیی هیند لەناو چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیدا.

گاندی بەرنامەی پرۆژەیەکی خستەکار بۆ بایکۆتیکردنی هەموو دەزگا حکومییەکان، وازهێنانو دەست لەکارکێشانەوەی هەموو فەرمانبەرو کرێکارەکان لە هەموو پۆستەکانیاندا، چیتر پارێزەرەکان بەشداریی دانیشتنەکانی دادگا نەکەن، خوێندکارەکان نەچنە ئامۆژگاکان، هەموو کەرەستەکانی بێگانە لەوانە بەرهەمەکانی ڕستنو چنینی بێگانەو هاوردەکانیش نەکڕن، بەوەش دەستکەوتی باش بەر بەرهەمە میللیو دەستییەکان دەکەوێتو قازانجەکەش بۆ میللەت دەگەڕێتەوە. ئەو بزافەو بەرنامەیە گەیشتە چەند هەرێمێک، هەموولایەک جلوبەرگە بێگانەکانیان لەسەر شەقامەکانو لەگۆڕەپانەکاندا دەسوتاند، لەماڵەکان تەشیو ڕستنو چنینی قوماشی هیندی پەیدابوو، بۆ یەکەم جاریش ژنان هاوشانی پیاوان کەوتنە ناو کاروانی خەباتو کارکردن بۆ سەرکەوتنی

بزاڤەکە، لەوەدەمانەشدا گاندی گوند بەگوندو لەشارەکاندا دەگەڕاو وتاری پێشکەش دەکردو بەرنامەکەی شرۆڤە دەکرد، داوای هەڵسانەوەو وریایی لە هیندییەکان دەکرد، بەردەوامیش وتاری لەرۆژنامەکاندا دەنووسی، حکومەتیش هەزارەها کەسی دەگرت، بەردەوام کۆششی دەکرد بەرنامەکەی ئەو پووچەڵ بکاتەوە.

لەمانگی فبرایەری ساڵی ۱۹۲۲دا لەگەرمەی بایکۆتکردنی کەرەستەی بێگانەو باش بەرێکردنی بەرنامەکانی گاندی بۆ دژایەتیکردنی دەسەلاتی بەریتانی لەشارۆچکەی شوری شورای باکووری هیند چەند کارێکی توندوتیژی دەتەقێتەوە، کە تێدا هێرش دەکرێتە سەر چەند بنکەو مەڵبەندێکی پۆلیس، تێدا چەند پۆلیسێك دەکوژرێت، بارەگاکان دەسوتێنن، ئاگر لەزۆر شوێن بەردەدەن، ئەو کارانەش گاندی زۆر تووڕە دەکات، بۆیەش بریار دەدات چەند بەرنامەیەکی بایکۆتییەکە سووک بکات، دەستی یارمەتییەکان درێژ بکاتەوە، ئەو کارە توندوتیژانە بوار ساز دەکات حکومەت گاندی بگرێتو رەوانەی دادگای بکات، لەوێش قازییەکی ئینگلیز بریاری حەوت ساڵ زیندانی بۆ گاندی دەبرێتەوە، بەلام ئەو لەیەنایەری ساڵی ۱۹۲٤ ئازاد دەبێت، دووبارە کار دەکاتەوە بۆ یەکریزیو یەك هەڵوێستیی موسڵمانو هیندۆسەکان، چونکە دەیزانی یەکێتیو یەکریزی هەموو ئاینیەکانو مەزهەبەکان دەبێتە بەردیی گۆشەی سەربەخۆیی بۆ وڵاتی هیند.

لەوەدەمانەدا رەوشی وڵاتەکە ئاڵۆز ببوو، هزری هاوڵاتیانی ناو هەموو توێژەکان زۆر دەکرێتەوەو هوشیاریان زۆرتر دەبێت، لەوەدەمانە گەنجەکانیش دەکەونە خۆو یاخیبوونی جوتیارەکان توند دەبێت،

بەئاشکرا نارەزاییەکانیان پەرە دەستێنێت، لەهەندێ هەرێمەکانیش نارەزاییەکان کاری زۆر توندی لێ دەکەوێتەوە، لەو رەوشە نوێیەدا دەستەیەک کەسانی مارکسیش پەیدابوون، بۆیە بارەکە گونجاو بوو هەمووڵایەک حزبی کۆنگرە لەساڵی ۱۹۲۹ دامەزرێنن، کە گاندیش دەبێتە پێشەوای ئەو حزبە نوێیە. لە رۆژی ۲۷ ی یەنایەری ساڵی ۱۹۲۰ گاندی وەک رێبەری حزبەسیاسییەکە رادەگەیەنێت کە سەربەخۆیی هیند لەسەر هەموو ئاستەکان مەبەستو هیوای سیاسی نیشتیمانی هیندە، بەوەش گاندی دەبێتە سەرۆکی ئەو میللەتەو دژایەتی حاکمی بەریتانی دەکات، ئەوەش دەبێتە دەستپێکی مێژوویی سەربەخۆیی هیند.

# کاروانی خوێ

لە رۆژی ۱۲ ی مارسی ساڵی ۱۹۲۰ گاندی کاروانە پیادەییە هەشتاو حەوت کیلۆمەترییەکەی لەگەڵ دۆستو هەوادارانی بەرەو کەناری دەریا لە داندی دەست پێدەکاتو بەماوەی ۲٤ رۆژ دەگەنە شوێنەکە، مەبەست لەو کاروانە پیادەییەش دژایەتیکردنی یاسای خوێیەکە بوو، کە تێیدا نەدەکراو قەدەغەبوو هیندییەکان خوێ دەربهێننو تاکی هیندی بۆی نەبوو خوێ بەدەستی خۆی بەرهەم بهێنن.

لە بەیانی رۆژی ٦ ی مانگی ئەپریلدا گاندی دەگاتە داندیو یەکسەر روو لە کەناری دەریا دەکات، لەوێ دەست دەگەیەنێتە مشتە خوێیەکو هەڵیدەگرێتەوە، ئەوەش تەحەدایەک دەبێت کە هاوڵاتیان دژی یاسای

خۆی دەبن و کاری پێ ناکەن، بۆیەش دەسەڵاتداران بەرووی ئەو کاروانە دەستەوەستان نابن، درندانە دەجولێنەوەو رەشبگیری دەکەن و ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان لە پاش کاروانەکە دەگرن کە ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی سەد هەزار کەس.

## دانووستان

لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٢٠ حکومەتی حزبی کرێکارانی بەریتانی بە سەرۆکایەتی رامسی ماکدونالدز داوای کۆبوونەوەیەک لەسەر خوانێکی چوارگۆشەیی دەکات، کە تێیدا باس لە دوارۆژی دەستووری هیندی بکەن، لەودەمانە گاندی لە زیندان دەبێت، بۆیەش بۆ نارەزایی گیرانی ئەو کەسە لە حزبەکەیان حزبی کۆنگرەی هیندی بەشداری دانیشتنەکەی حزبی کرێکارانی بەریتانی ناکەن، بۆیەش سەرۆکی حکومەت هیوای خواست لە دانیشتنی تری چوار گۆشەییدا ئەو حزبە بەشدار ببێت.

لەرۆژی ٢٩ ی ئۆگستی ساڵی ١٩٢١ گاندی بۆ بەشداری دانیشتنی دووەمی چوار گۆشەییەکە بەرێگای دەریاوە وەک تاکە نوێنەری حزبی کۆنگرەی هیندی دەگاتە لەندەن، پاش مانەوەی سێ مانگ لەبەریتانیا دەگەڕێتەوە هیند بەبێ ئەوەی هیچ دەستکەوتێکی دەستووریی بەرچاوی بۆ هیند دەستبەر کردبێت، پاش گەڕانەوەی و لە دوای یەک هەفتە گاندی دەگیرێتەوەو بەبێ دادگاییکردن دەخرێتەوە زیندان، تا مانگی

ئۆگستى ساڵى ١٩٣٢ لە زيندان دەمينێتەوە. كە لە زيندان ئازاد دەبێت دەچێتە ئەحمەد ئابادو لە شارۆچكەى واردا لە ناوەڕاستى هيند نيشتەجێ دەبێت، لەوێ لەناو كوخێكى سادەى لەقوڕ دروستكراودا دەژيت، بەڵام ئەو ببووە سەرچاوەو لێزانى هەموو سياسييەكانى هيند وەك پێشەوايەكى مەزنى هيند سەيريان دەكردو رێنماييەكانى ئەويان وەردەگرت.

لەساڵى ١٩٣٩ جەنگى دووەمى جيهان هەڵدەگيرسێت، كە تێدا بەريتانيا لەو شەڕەدا بەشدارو بەلايەن بوو، ژمارەيەك لە ئەندامانى حزبى كۆنگرەى هيندى ئەوە بەدەرفەتێكى باش دەزانن بۆ ئەوەى زەبرێك لەبەريتانيا بدەن، بەڵام گاندى دژى بۆچوونو بەرنامەى ئەو دەستەيە دەوەستێت، ئەوە بەرەوشتێكى ناپەسند دەزانێتو لەگەڵ پرنسيپەكانى حزبى كۆنگرەى هيندى ناگونجێت، بۆيە ناكرێ بير لەو كارە بكرێتەوە. لەودەمانەشدا هێشتا حكومەتى بەريتانى نەگەيشتبوو بڕيارێكى كۆتايى بۆ دوارۆژو چارەنووسى هيند، سەرۆك وەزيرانيش ونستون چەرچل بەئاشكرا رقو كينەى دڵى خۆى بەرووى گاندى نەدەشاردەوەو بەئاشكرا بە چاوێكى بێزێزى سەيرى كردووە، بۆيە وەفدێك بۆ دانوستان رەوانە هيند دەكات، كە لەگەڵ كەسێكى وەك ئەهرۆ كۆ ببنەوە، بەڵام كۆبونەوەكە هيچ بەرهەمى نابێتو رێكەوتنى لێ ناكەوێتەوە.

سەلاح ئەلئیمام

# هیندستان جێدەهێڵن

لەودەمـانەی سـوپای ژاپـۆنی دەگـاتە سـەر سـنووری دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریەتی هیندو بەرنامەسازیی دەکات بۆ هێرش بـردنە سەر وڵاتی هیند، لەو رەوشە ناوخۆیی و دەرەکییەدا رابیتەی ئیسلامی لە هیند داوای دەوڵەتێکی ئیسلامی سـەربەخۆی سـەروەر دەکـات، بـۆیە گانـدی ئەوە بەباش دەزانێت لەو رەوشـەدا بەریتانییەکـان ناشتیانە وڵاتەکەیـان چـۆڵ بکەن و دەربچن.

لە رۆژی ٧ی مـانگی ئۆگسـتی سـاڵی ١٩٤٢دا بڕیـارە مێـژووییەکەی بەنـاوی (هینـد جێبهـێڵن) دەردەکـات، لەوێـدا گانـدی سـەبارەت بەفاکتەری سەرەکی ئەو بڕیارە وتبووی:

گەلی هیندی جیاوازی لەنێوان ئیستعماری بەریتانی و گەلی بەریتانی نابینێت، ئەوان رێکەوتنەکە لەگەڵ ئەو دوو لایەنە بەیەک چـاو دەبینـن، من وادەزانم ئەو رقەی گەلی هیندی بۆ گەلی بەریتـانی هەڵیانگرتووە، وا دەکـات بەگەرمـی پێشـوازی لە ژاپۆنییەکـان بـکەن، کە ئەوان رزگاریـان نەبوو، لە کۆلۆنی بەریتانی بەرەو کۆلۆنییەکی نوێ ژاپۆنی هەنگاو دەنـێن، ئەوان بەو دەوڵەتە نوێیە دەگۆڕنەوە.

لە بەیـانی رۆژی ٩ی مـانگی ئۆگسـتی سـاڵی ١٩٤٢ گانـدی دیسـان دەگیرێتەوە، بەڵام ئەوجارە چەند ئەنـدامێکی حزبی کۆنگرەی هینـدی لەگەڵـدا دەگیرێـت، هەموویـان لەژووری تاکەکەسـی و لە زینـدانی دوورو لاچەپو لەبەر چـــاودێری زۆر وردەوە دەبەســـتن، کە بەیـــانییەکەی هاوڵاتیـان دەزانـن گانـدی گیـراوە، خەڵـکەکە زۆر تـووڕە دەبـن، لە هەمـوو

گۆشەیەکی وڵات کاری توندوتیژیی‌و ئاژاوە هەڵدەگیرسێت، لەزیندانەوە گاندیش دەست بەمانگرتن لەخواردن دەکات، تا رادەی ئەوەی تەندروستی بەردو خراپی دەچێت، بەڵام حکومەت گوێ بەوە نادات. پاش ئەوەی ماوەی ٦٢ ساڵ بەیەکەوە بوون لەمانگی فبرایەری ساڵی ١٩٤٤دا کاستوریای هاوسەری گاندی دەمرێت، ئەویش تەندروستی تێکدەچێت، چونکە لەودەمانە تەمەنی گەیشتبووە ٧٥ ساڵ، لەزینداندا تووشی نەخۆشی ملاریا دەبێت بۆیەش لەرۆژی ٦ ی مانگی مایوی ساڵی ١٩٤٤ لەزیندان ئازادی دەکەن. لەمانگی سپتەمبەری ساڵی ١٩٤٤ گاندی چەند جار لەگەڵ محەمەد جناح کۆدەبێتەوەو زۆر کۆششی لەگەڵدا دەکات کار بۆ دابەشکردنی وڵاتی هیند نەکات، با وڵاتەکە بەیەکپارچەیی بمێنێتەوە، بەڵام ئەو هیوایەی جێبەجێ نابێت، بۆیەش هەرێمی پاکستان لەوڵاتی هیند جیادەبێتەوەو لەساڵی ١٩٤٧ دەبێتە وڵاتێکی سەربەخۆ، محەمەد جناحیش دەبێتە یەکەم سەرۆک کۆماری پاکستان.

لە ساڵی ١٩٤٥ هەموولایەک دەزانن هێزەکانی هاوپەیمانان لەشەڕەکە بەسەرکەوتوویی دەردەچن، سەرکردایەتی حزبی کۆنگرەش لەناو زیندانەکاندا تووشی بێزاریی دەبن، گەلی هیندیش ورەیان نامێنێت‌و گیانیان سست دەبێت، چونکە ئەو شەڕە باندۆری زۆری لەسەر وڵاتەکەیان هەبووە، لە رووی ئابوورییەوە شەکەتی کردبوو، ولایەتی پەنجاب دووچاری برسیەتییەکی بێ وێنەو ترسناک دەبێت، هەروەها ولایەتەکانی تریش برسیەتی هەڕەشەیان لێ دەکات، وڵاتەکەش دەبێتە بارگرانی لەسەر ئیمپراتۆریەتی بەریتانی، ئەو گەوهەرە نازدارو دەگمەنەی تاجی بەریتانی بۆ بەریتانیا دەبێتە درکێکی زیانبەخشی ژەهراوی. لە مانگی

مارسی ساڵی ١٩٤٦ دا وەفدێکی بەریتانی پێکهاتوو لەسێ وەزیری بەدەسەڵات دەگەنە هیند، ئەوان کار دەکەن بەئاسانیو بەهێمنی هەنگاوو مەرجەکانی پێدانی دەسەڵاتەکە بەهیندییەکان باس بکەن، کار دەکەن بۆ دانانی دەستوورێک بۆ هیندو گەڕانەوەی دەسەڵاتەکە بەهیندییەکان، خۆیان ئیدارەی وڵاتەکەیان بکەن. ئەوان لەدابەشنەبوونی وڵاتەکە بۆ بەشێکی موسڵمانو بەشێکی هیندۆس کار دەکەن، دەخوازن وڵاتەکە وەک خۆی بێت، بەڵام دوو ئیدارەی هەبێت، ئەگەرچی سەرۆکی حزبی کۆنگرە کەسێکی موسڵمانیش بوو، بەڵام محەممەد جناح سوور دەبێت لەسەر جیاکردنەوەی بەشە موسڵمانییەکەیو سەربەخۆیی بەشە موسلمانییەکەی هیند.

لە رۆژی ١٢ ی مانگی ئۆگستییدا داوا لە جواهر لال نەهرۆ کرا حکومەت پێکبهێنێت، بەڵام محەممەد جناح لەرۆژی ١٦ ی هەمان مانگدا داوای لەموسڵمانان کردبوو کار بکەن بۆ راگەیاندنی وڵاتێکی سەربەخۆ بۆ موسلمانی هیند، بۆیەش شەڕێکی دژواری خوێناوی لەنێوان موسڵمانەکانو هیندۆسەکان دەقەومێت، لەودەمانەدا گاندی تەمەنی گەیشتبووە ٧٧ ساڵ، جەستەی پەکی کەوتبوو، باش هیلاک ببوو، بەڵام دەستەوەستان نابێتو بەپێخاوسی لەگوندەکاندا دەگەڕا، داوای لەخەڵکەکە دەکرد شەڕەکە راگرن، بەسە شەڕی ناوخۆ، کە بەرنامەو بانگەوازەکەی سوودی نابێتو تەندروستی بەرەو تێکچوون دەچێت. لەرۆژی ٢٠ ی مانگی فبرایەری ساڵی ١٩٤٧ حکومەتی بەریتانی بڕیار دەدات هیند بەجێبهێڵێت، پێشنیار دەکات دەسەڵاتەکە رادەستی ولایەتە هیندییەکان بکات، یان هەر دەسەڵاتێکی تر، بۆیەش لە رۆژی ٢ ی

مانگی یونیۆی ساڵی ١٩٤٧ دەوڵەتی هیندیو هاوکات دەوڵەتی ئیسلامیش لە پاکستان رادەگەیەندرێت، بەڵام دووبارە شەڕەکە نوێ دەبێتەوەو وڵاتەکە دەکەوێتەوە ناو گۆمی خوێن، بۆیەش بەناچاری کۆچبەرو پەنابەرەکان کە ژمارەیان چەندین ملیۆن کەس دەبوو لەو شوێنەوە دەگوازنەوە شوێنی ترو ئارامیان نامێنێت، هیندۆسەکان دەگەڕێنەوە ناو هیندو موسڵمانەکانیش دەچنە ناو وڵاتە نوێیەکەیان پاکستانی ئیسلامی.

لە رۆژی ١٢ ی مانگی یەنایەری ساڵی ١٩٤٨ گاندی بڕیار دەدات تا مردن مان لە خواردن بگرێت، ئەگەر ئەو شەڕە خوێناوییە ناوخۆییە نەوەستندرێت، بۆیەش لەو هەڕەشەیەدا گاندی سەردەکەوێت، بەوەشو لەسەر داوای گاندی شەڕە ناوخۆییەکە رادەوەستێت، کۆمەڵکوژییەکەی نێوان مەزهەبەکان نامێنێت، دەوڵەتە نوێیەکەش بەشی خۆی لەمیزانیەی هیند وەردەگرێت.

## تیرۆرکردنەکە

لە رۆژی ٢٠ ی مانگی یەنایەری ساڵی ١٩٤٨ لەکاتێکدا گاندی لەگەڵ هاوڵاتیان کۆدەبێتەوە، لەدووری چەند مەترێک لەشوێنی دانیشتنەکەی نارنجۆکێک دەتەقێت، کابرا زوو دەگیرێت، ئەو دان بەوەدا دەنێت کە مەبەستی تیرۆرکردنی خودی گاندی بووە. لە رۆژی ٣٠ ی مانگی یەنایەری هەمان ساڵ لەکاتێکدا گاندی قورسایی خۆی خستبووە سەر گۆچانەکەی دەستیو دەچێتە ناو خەڵکەکە، ئەو سەرقاڵی پێشوازی خەڵکەکە

دەبێـت، گەنجێکـی هەنـدام گەورەو بەهێـز (کە کەسـێکی تونـدڕەوی هیندۆس دەبێت) بەرەو رووی دەچێـتو پاڵ بە کچەزاکەیەوە دەنێـتو لە گاندی دووری دەخاتەوە، گەنجەکە وەک ئەوەی کرنۆشی بۆ دەباتو سڵاوو رێـزی پێشکەش دەکـات، لەوەدەمـانەدا دەمـانچەکەی دەسـتی لەسـینگی دەداتو سـێ گـوللەی لێـدەدات، دوو گوللەیـان بەر سـینگی دەکەوێـتو سـینگی کـون دەکـات، سێیەمیشـیان لەنـاو سـیپەلکی جێگیـر دەبێـت، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی یەکسەر گیـانی لە دەسـت بـداتو بمرێـت. بـۆ بەیانییەکەی لە دەردوەی نیودەلهی تەرمەکەی لەناو لێشاوی ئامادەبووان دەسوتێنن، بەپێی سرووتی تایبەتی هندۆسییەکان سێزدە رۆژ پرسەکەی رادەگەیـنـدرێت، لەرۆژی ١٢ ی مـانگی فبـرایەری سـاڵی ١٩٤٨ خۆڵەمێشـی تەرمەکەیان بەناو حەوت رووباری پیرۆزی هیند داداوە.

# ئەبو جیهادی سەرکردەی فەڵەستینی

## نهێنییەکانی تیرۆرکردنی ئەبو جیهادی سەرکردەی فەڵەستینی

لە دووری بیست كیلۆمەتر لە تونسی پایتەختی تونس، لە ناوچەی حەمام ئەلشەت، كە گوندێكی ئارام‌و جوانەو دەڕوانێتە سەر كەنداوی تونس، ئەو شوێنەی كە لەساڵی ١٩٨٢ەوە، دەبێتە بارەگای سەردكی ڕێكخراوی رزگاریخوازی فەلەستینی (PLO)، تێیدا كارو چالاكییە سیاسیی‌و سەربازییەكانیان تێدا ئەنجام دەدا، ئەوەش پاش ئەوە هات كە سوپای ئیسرائیلی پاش شەڕێكی دژوارو سەخت لەو ساڵە لە بەیروت بارەگاكەی ئەوان گەمارۆ دەدات، ئەوانیش لەسەر پێشنیارو داوای سەرۆكی پێشووی تونسی ئەلحەبیب بورقیبە ڕێكخراوەكە هەموو دەزگاكانی بەیەكجاری دەگوازنەوە ئەو شوێنە لاچەپە ئارامە. لەشەوێكی هێمندا ئەو هەوارەش بۆ فەلەستینییەكان ئاڵۆز دەبێت، دەستەیەك لە كۆماندۆزی ئیسرائیل دەستیان دەگاتە ئەو هەوارە جوانەو لەوێ كەسی دووەمی دەسەلاتداری ناو ڕێكخراوی رزگاریخوازی فەلەستینی (خەلیل ئیبراهیم مەحمود)ی ناسراو بەئەبو جیهاد لەدووری ٢٥٠٠ كیلۆمەترەوە دەكوژن، بەوەش ئیسرائیلییەكان بەهەموو جیهان رادەگەیەنن كە دەستیان دەگاتە هەر شوێنێك مەبەستیان بێت، هەر چەندە شوێنەكە لاچەپو پارێزراویش بێت. لەبەر چەندین هۆكار چارەنووسی ئەبو جیهاد وای بەسەر هات. لەوانە ئەو رۆڵێكی بەرچاوی لەسەرهەڵدانی فەلەستینی گێراوەو ئەو ئەندازیارو ڕێبەری بووە، بۆیەش موخابەراتی ئیسرائیل دەزانێت كەسێك هەیە سەرپەرشتی چالاكییەكان لەكەناری خۆرئاواو غەزە دەكات، لەدووردوە بانگەوازو ڕێنماییەكان بەهۆی دائیرەیەكی جیهانی گەیاندن لەژنێف‌و شارەكانی تری ئەورووپییەوە ئاراستەی فیدائییە فەلەستینییەكان دەكات، بەوەش دەیەوێت سەرچاوەو گۆشەی

ئاراستەکردنەکە گوم بکات.

ئەبو جیهاد ئەلقەی پەیوەندیی نێوان سەرکردایەتی ڕێکخراوەکەو هەڵسوڕێنەری سەرهەڵدانەکە بوو لەناو وڵاتدا، ئەو بەرپرس‌و هەڵسوڕێنەری ڕووداوەکانی ١٥ ساڵی فەڵەستین بووە، هەموو گەنجەکانی سەرهەڵدان گوێیان لە ڕاسپاردەکانی ئەو گرتووە، ئەو ڕاستەوخۆ دژایەتی‌و شەڕی ئیسرائیلی کردووە، ئەوەش بەپێچەوانەی کەسایەتی یاسر عەرەفات‌و ئەبو ئەیادو ئەبو لوتف‌و ئەوانی تریش بووە... بەپێی زانیارییەکانی موخابەراتی ئیسرائیل ئەبو جیهاد بەرنامەڕێژی بۆ قۆناخی دووەم‌و سێیەمی ئەو شۆڕشە دەکرد، واتە مەبەستی دامەزراندنی حکومەتی سێبەر بوو لەسەر خاکی داگیرکراوی فەڵەستین تا دەسەڵاتی کەناری خۆرئاواو غەزە بگرنە دەست‌و حوکمڕانی ڕاستەوخۆی بکەن.

خەلیل ئەلوەزیر لەساڵی ١٩٣٦ لەناو خێزانێکی دەوڵەمەندی ڕامەڵڵا لەدایکبووە ئەودەمانەی فەڵەستین لەژێر وەسایەتی بەریتانیدا بوو، کە لەساڵی ١٩٤٨ دەوڵەتی ئیسرائیل دادەمەزرێت بنەماڵەکەی ئەو لەشاری ڕامەڵڵا بەرەو غەزە دووردەخرێنەوە، ئەویش لەوێ خوێندن تەواو دەکات، لەوێشەوە دەچێتە میسر و لەتەمەنی بیست ساڵییدا دەچێتە زانکۆی قاهیرە، کە تێیدا یاسر عەرەفات دەناسێت، دۆستایەتییەکەیان تەنها مردن بوو لەیەکتری جیاکردنەوە. کە خوێندنی زانکۆ تەواو دەکات لەوڵاتی کوێت جێگیر دەبێت، لەوێ وەک مامۆستا کار دەکات، پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵ (ئینتسار)ی ئامۆزای دەکات کە پاشان بەئوم جیهاد دەناسرێت، کە لەڕێکخراوەکە دەبێتە بەرپرسی سندووقی شەهیدەکان. کە ڕێکخراوی فەتح لەساڵی ١٩٦٤ دادەمەزرێت ئەو دەچێتە دیمشق لەوێ

دەبێتە بەرپرسی داراییانو نازناوی ئەبو جیهاد وەردەگرێت.

ئەبو جیهاد لە سوریا دەگیرێتو لەوێ ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری دەدەن، پیاوانی موخابەراتی سووریی لەبەر چاوی خۆیدا (نیزال)ی کوڕی لە نهۆمی پێنجەمی باڵەخانەکەوە فڕێ دەدەنە خواردووە دەیکوژن. کە لە زیندانی سوریا دەربازی دەبێت دەچێتە ئوردن، لەوێ هاوکاری دەنوێنێت بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوی فەڵەستینی ئەلفەتح، ڕۆڵی زۆری لە گەشەکردنو سازبوونی دەبێت، کە ڕێکخراوەکە لە ڕووداوەکانی ئەیلولی ڕەشدا لە ئوردن دەردەکرێت ئەبو جیهاد دەبێتە سەرکردەی گشتی ڕێکخستنەکانو چالاکییە سەربازییەکانی ڕێکخراوەکە، بەتایبەتی دەستە تایبەتییەکانی کە لەدەرەوەی ڕێکخراوەکە بوون. لیستی ئەو چالاکییە تایبەتیانەی لەو چەند ساڵەدا کە ئەبو جیهاد دژ بەئیسرائیل سەرپەرشتی کردوون زۆرە، ئەو بەرپرسی تەقاندنەوەی تانکی زوهر بوو لەساڵی ١٩٦٥و تەقاندنەوەی هێڵەکانی سەرەکی ئاو لەهەمان ساڵدا، کارەکان زۆرن لەوانە:

- ❖ ئەبەردییەکەی هوتێلی سافوای لەتەلئەبیب کە تێیدا ١٠ ئیسرائیلی لەساڵی ١٩٧٥ دەکوژرێت.
- ❖ تیرۆرکردنی ئالبرت لیفی گەورە پسپۆر لەبواری تەقینەوەو یاریدەرەکەی لەنابلس لەساڵی ١٩٧٦.
- ❖ ئەبەردییەکەی دەلال مەغریبی لەساڵی ١٩٧٨دا کە تێیدا ١٢٧ ئیسرائیلی دەکوژرێت.
- ❖ بەرنامەی بۆردمانکردنی بەندەری ئیلات بەسێ ڕاجیمەی قورس لەسەر پاپۆڕێکی بازرگانییەوە لەساڵی ١٩٧٩دا.

❖ ئەبەردییەکەی دبویا لەساڵی ١٩٨٠ لەناوچەی ئەلخەلیلدا کە تێدا شەش کەس دەکوژرێنو ١٦ کەسیش بریندار دەبن.

❖ بۆردمانکردنی هەوارە نیشتەجێیە ئیسرائیلییەکان لەباکووری ئیسرائیل لەساڵی ١٩٨١ دا لەناو فەڵەستینی داگیرکراودا.

❖ بەدیلگرتنی هەشت سەربازی ئیسرائیلی لەرۆژی ٤ ی سپتەمبەری ساڵی ١٩٨٢ لەکاتێکدا سوپای ئیسرائیل خوارووی لوبنانی داگیرکردبوو، ئەو هەشت سەربازەش بەپێنج هەزار گیراوی فەڵەستینیو لوبنانیی لەشاری تەرابولسی لوبنانی گۆڕدرانەوە.

❖ هێرشکردنی سەر بارەگای حاکمی سەربازی ئیسرائیلی لە شاری سوورو تەقاندنەوەی لەرۆژی ١٠ ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٨٢و کوشتنی ٧٦ ئەفسەرو سەربازی ئیسرائیل لەهێزەکانی سوپای ئیسرائیلی، لەوانە ١٢ ئەفسەریان پلەی بەرزیان هەبوو.

❖ سەرپەرشتی شەڕی ماندووکردنو ئەبەردییەکانی فەڵەستینی لوبنانی هاوبەش دژ بەسوپا داگیرکەرەکە لەلوبنان لەساڵی ١٩٨٢ تا ساڵی ١٩٨٤.

ئەبو جیهاد سەرپەرشتی هێرشکردنەکەی سەر وەزارەتی بەرگری ئیسرائیلی کردبوو کە لەجەزائیرەوە لە رۆژی ٢١ ی مانگی ئەپریلی ساڵی ١٩٨٥ەوە، بەرنامەی بۆ کرابوو، تیمە فەڵەستینییەکە کە لە٢٠ فیدائی خۆبەختکەر پێکهاتبوو دەچنە ناو پاپۆڕێکی بازرگانی، کە لەکەنارەکانی تەلئەبیب دادەبەزن لەوێشەوە بەرەو بارەگای وەزارەتی بەرگری ئیسرائیل لەهاکریایە بەڕێدەکەون، دەچنە ناو بارەگەکەو ژمارەیەک ئەفسەرو پلەداری ناو وەزارەتەکە دەگرن لەوانە ئیسحاق رابین کە وەزیری بەرگری

بوو، ئەگەرچی چالاکییەکە سەرناکەوێت، بەڵام بۆ سەرکردایەتی سوپای ئیسرائیل زەنگێکی ترسناک لێدەدات، ئەوەش لاوازیی بنکەکانی ئەوان نیشاندەدات، کە ئەوان دەتوانن بگەنە ریزی پێشەوەی سەرکردەکانیان.

لەگەڵ ئەوەی ئەو سەرپەرشتی راستەوخۆی ئەو چالاکیانەی کردووە، ئەو لەگەڵ یەکەم مەشخەڵی سەرهەڵدانە میللییەکەی ناو خاکی داگیرکراو بوو کە لەرۆژی ٩ ی سپتەمبەری ساڵی ١٩٨٧ هەڵگیرساوە، کە لەرۆژی ٢٠ هەمان مانگدا یەکەم چالاکی لەبەر رۆشناییەکانی ئەو لەدە خاڵدا لەسەر ئاستی رێکخستن‌و سیاسییەوە دەستی پێکردووە. پەیامەکانی ئەو بەرادیۆی دەنگی شۆرش لە بەغداو بەرۆژنامەو ئاژانسەکانی دەنگوباس‌و ئامێرەکانی فاکس‌و تەلەفۆن‌و هەموو بوارەکانی تری گەیاندن دەگەیشتە ناو جەماوەرەکەی فەلەستین، بۆیەش دەسەڵاتدارانی ئیسرائیل ئەوە باش دەزانن ئەبو جیهاد مەترسی هەیەو کارو چالاکییەکانی زەبرێک لەوان دەدات، چونکە بەرنامەکانی راپەرین‌و سەرهەڵدانەکە دەستوپەنجەی ئەوی پێوە دیاربوو، هەموو کارەکانیان بەئامۆژگاری‌و رێنماییەکانی ئەو دەکرا، لە راپۆرتەکانی ئیسرائیل ئەوە دەخوێندرایەوە کە رەنگە ئەو راپەرینە ببێتە شەرێکی درێژخایەنی بێزارکەرو زیانبەخش کە چەندین ساڵ بخایەنێت.

# ئەفسانەی دەیمونا

بەلێزانیو شاردزایی فەرەنسییەکان لە کۆتایی ساڵانی پەنجاکاندا، سەرەتاکانی بنکە ناودکییە ئیسرائیلیەکە دادەمەزرێندرێت، کە لەساڵی ۱۹٦٤ تەواو دەکرێت، لەساڵی ۱۹٦٦ەوە هەواڵی وا ئاشکرا دەبوو کە ئیسرائیل خەریکە بۆمبە ئۆتۆمییەکەی تەواو دەبێت، ڕۆژانە چیرۆکو قسەی زۆر دەگوترا، کە لە بیابانی ئەلنەقەبو لەژێر خاکی شاری دەیمونا کارگە ئۆتۆمییەکە کاری لەسەر دەکرێت، بۆیەش ئەو شارەو ئەو کارگەیە وەک ئەفسانەیەک باس دەکرا، ئەوەش وای کردبوو دۆسییەکە لەبەردەم ئەبو جیهاد گەورەو مەزنتر بێت. لەناو دۆسیەکەی پێش ئەو، هەواڵی وا هەبوو کە میسر لە سەردەمی سەرۆکایەتی جەمال عەبدولناسر خەریکی بەرنامەی هێرشێکی هەمەلایەنی بەکۆدی ئەلفەجری لەبەر دەستە، کە هێرش بکەنە سەر ناوچەی ئەلنەقەبی ئیسرائیلیو بەنداوی ئیلاتو جیاکردنەوەی ناوچەکانی خوارووی لەبەشەکانی ترو هەروەها لێدانی بنکە ناوەکییەکانیان لەو دەڤەرەدا، بۆیەش میسرییەکان بۆ جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیە سوپایەکی زەبلاحیان سازکربوو، کە پێکهاتبوو لەلیوایەکی پیادەو لیوایەکی تری پیادەی سەربەخۆو لیوایەکی تۆپکارو تۆپکاری مەیدانیو زرێپۆشو کەتیبەیەکی هاونو کەتیبەیەکی دژە دەبابەو سریەیەک ئەندازیارو سریێک لەفڕۆکەی بۆمباهاوێژو سریەیەک لەکیمیازانان، ئەو هێزانەش لەلایەن هێزەکانی ئاسمانییەوە کە بریتی بوو لەنۆ دەرچوونی فڕۆکەی بۆمباهاوێژو دەرچوونی سریێکی ترو

سربێکی سووکی بۆمباهاوێژ بەرنامەرێژی بۆ کرابوو، لەگەڵ ئەو پۆشینە فرە تەونە ئاسمانییەدا، سوپای دەریاوانییش بەچڕیو بەمووشەکەوە کار دەکات تۆپکارییەکان بشکێنێتو کۆگاکانی سوتەمەنییان خاپوور بکاتو دامەزراوەی بەنداوەکانیش بڕوخێنن، بڕیاریش وابوو هێرشەکان سێ رۆژ بخایەنێت، بەڵام پێشهاتەکان بەپێچەوانەی بیرکردنەو بەرنامەرێژی سەرکردایەتی میسری کەوتەوە، چونکە شەڕەکەی یونیۆ هەمووی لەباربرد.

ئەبو جیهاد دۆسیەی دەیموناشی پێ سپێردرابوو، ئەو بەرنامەیەی کە چاودێری ئەمریکی لەسەر بەرنامەکە لەساڵی ١٩٦٩ تەواو دەبێت، وەک لەمانگی یەنایەری ساڵی ١٩٧٦ ئاژانسی موخابەرات رایگەیاندووە کە ئیسرائیل لەساڵی ١٩٧٤ەوە بۆمبی ئەتۆمی هەیەو ئامادەیە. بەڵام ئەو گومانە نامێنێت کە رۆژنامەی سەندای تایمز لەرۆژی ٥ ی مانگی ئوکتۆبەر ساڵی ١٩٨٦ لەسەر زاری پسپۆری ناوەکی ئیسرائیل مۆردخای فانونو وتبووی ئێستا ئیسرائیل نزیکەی ٢٠٠ بۆمبی ناوەکی هەیە، دیارە کە ئەو پسپۆرە ئەو هەواڵەی بەدیمەنو بەبەڵگە نیشاندابوو، بۆیەش مەسەلەی دوودڵیو دڵەڕاوکێی نامێنێتو دەبێتە راستییەکی حاشا هەڵنەگر.

ئەبو جیهاد دوو هەزار دۆسیەو ئەرکی لەپێشدابوو، یەکێک لەو فەرمانو دۆسیەی ئاڵۆزو گرانەش دۆسیەی چەکە ناوەکییەکانی ئیسرائیل بوو، کە یەکێک بوو لەنهێنییەکانی دەوڵەتی ئیسرائیل، دیارە لەبەر ترسناکییەکەی ئەو دۆسیە هێڵێکی سووریش بوو، بۆیەش ببووە قەڵایەکی قایم کە هەرگیز زانیاری لێوە دەرنەدەچوو، مەڵبەندەکە ببووە گەنجینەیەکی شکۆداری دەسەڵاتدارەکانی بنەماڵەی سەهیۆنیزمو

جوولەکەی هەموو جیهانیش، بۆیەش گەیشتن بەو مەبەستەو زانیارییەکانی ئەو دەیمونایە زۆر ئەستەم بوو. دیارە لەبەر ترسناکیو بایەخدارییەکەی ببووە پارێزگارکراوترین شوێنو پێگە لەهەموو جیهاندا، دیارە باڵندەش بۆیان نەبووە بەسەر ئاسمانەکەیدا ردت بن. مەڵبەندەکە یازنەییەو تیرەکەی پەنجا کیلۆمەترەو شووردیەکی ئەمنی بتەوی چاکی هەیە، باڵەخانەکەی بەکۆنکریتی بەناسن دارێژراوی پتەوەو بەرگەی بۆمبی ئاسمانیش دەگریت، هەموو بەشەکانی کە لەشەش نهۆم پێکهاتووە لەبن ئەرز توندکراوە.

ئاسمانی دەیمونا بەردەوام بەتۆڕێکی زۆر تۆکمەی رادارو بەرگری ئاسمانیو مووشەکیو تۆپکارییەوە دەپارێزرێت، چەندین پێگەی مووشەکی هۆکی تێدا دامەزراوە، تۆپی فڕۆکەشکێنی ٤٠ ملم بۆ دانراوە، لەگەڵ ئەوانەشدا تۆپی ٢٠ ملمیش سازکراوە، بەردەوام ژمارەیەک فڕۆکەی ئامادەو سازیش ئامادەن کە لەماوەی چەند چرکەیەک دەفڕن، هەمووشیان لەفڕۆکەخانەی دەیمونای سەربازی نزیک بنکەکە سازکراوون، لەنزیک ئەوانەشەوە ئەمریکا سێ فڕۆکەخانەی بۆ پارێزگاری ئەو بنکە ئەتۆمییە لەبیابانی ئەلنەقەب بۆ ئیسرائیل سازکردووە، هەروەها ئاسمانی دەیموناش بەفڕۆکەی ئینزاری پێشوەختو دووربینەوە لەوێیە، کە ماوەی چوار سەعات دەتوانن لەئاسمان بمێننەوەو بەردەوامیش بوونیان هەبووە، دیارە کە رادارەکانیش زۆر دووربینن، دەتوانن لەدووری ٢٦٠ کیلۆمەترەوە هەست بەمەترسی بکەنو لەهەر چوار لاوەش دەبینن و لەهەموو بەرزییەکەوە هەستیارن.

ئەوەو لەسەر ئەرزیش سیستەمێکی بەربەستی فرەئالۆزیش دانراوە،

كە تێدا تۆڕێك راداری تێدایەو هەموو جوولەی خەڵكو ماشینێك زوو هەست پێدەكات، بێجگە لەو پێگەو بەربەستە دامەزراوانە چەندین بازنەی گەڕۆكیش لە هەموو گۆشەیەكەوە دەوری دەیمونایان داوە، ئەوانیش هەموو جووڵەی خەڵكو ماشینەكان دەبینن، لەو مەڵبەندەش ئامێری تایبەتی جیوفۆن دانراوە كە هەست بە لەرینەوەی ئەرز دەكەن ئەگەر خشیەی خەڵكو جوولەی هەر جۆرە ئامێرێك هەست پێ دەكەن، ئەوەو چەندین ئامێری بۆنكردن هەیە كە لە دوورەوە هەوای ناوچە نزیكەكە هەڵدەمژن، بە ئاوێتەی شیمیایی شرۆڤەی دەكەن بەوەش هەر بۆنێكی جەستەیی دەربچێت یان هەر دەرچوونێك لە جەستەیەك هەبێت زوو ئەو ئامێرە بۆنی دەكات.

بێجگە لەو ئامێرو رادارانە ئامێری ئاگاداركردنەوەی بە تیشكی ژێر سووریش هەیە، كە هەموو گەرماییەك لەو دەزگایە نزیك ببێتەوە هەستی پێدەكات، جا گەرماییەكە لەجەستەی ئادەمیزادەوە بێت یان كە هەر ماشینێك یان هەر ئامێرێكەوە بێت، هەروەها دەزگا ئەتۆمییە ئیسرائیلییەكە لە دەیمونا بەبازنەیەكی داخراوی ئینزاری موگناتیسیەوە دەپارێزرێت، لەو دەزگایانەوە هەموو جەكو تەقینەوەیەك دەدۆزێتەوە. دەزگاكە بەتۆڕێكی وایەری ئەلكترۆنی زۆر هەستیاری ورد دەوری دراوە، كە لەچەشنی داوی جاڵجاڵۆكەیەو بەچاویش نابینرێت، بەڵام بەشڵقاندنی ئەو تۆڕە بەهەر جەستەیەك بێت دەنگی دێتو زەنگ لێدەدات،

دەزگاکانو ئامێرەکانی چاودێریو پاراستنەکان هەموو بەژوورێکی مەرکەزی بۆ دەست پێراگەیشتنو چاودێریو شرۆڤەکردنو ئاگادارنەوە بەستراوەتەوە.

# جوانووە شینەکە

لەبەر گرینگی ئەو دەزگایە ئەبو جیهاد پێکانی دەزگاکە دەکاتە بەرنامەو مەبەست، بەڵام ئەو باش دەیزانی دەزگاکە بەچەندین شێوە پارێزراوەو نزیکبوونەوە لەو دەزگایە مەترسی زۆری لەسەرە، رەنگە ئەو هەموو دەزگاو شێوەکانی پاراستنەکانیشی نەزانێت، زۆریشیان هەر باس نەکراون، یان نەزاندراون. دەزگای دەیمونا بۆ هەموولایەک شوێنێکی قەدەغەکراو بوو، لەوانە گەورە ئەفسەرەکانی سوپای ئیسرائیلیو گەورە سیاسەتمەدارەکان، گەورە حاخامەکان، کە هەموو دەرگایەکیان بۆ خراوەتە سەر پشت تەنها ئەو دەزگایە نەبێت، کەتە دەیمونا هەموو دەروازەکانی بەرووی هەموولایەک داخراوە.

ئەبو جیهاد بۆ لێدانی ئەو دەزگایە مەبەستی نەبوو فڕۆکەو مووشەکو تۆپ بەکاربهێنێت، ئەو پشتی تەنها بەشەش کەسی بوێر بەستبوو، لەوانە سێ کەسیان دەکرا بەهاوکاری سێ هاورێیەکانیان بچنە ناو قوڵایی دەزگایەکەو هەموو دەروازە بەستراوە ئەفسووناوییەکان ببەزێنن، ئەو جوانووییەی رۆژانە ئەو سوارانەی دەبردنە سەر پشتی پاسێکی جۆری ڤالڤۆی شین بوو، بەیانیان کارمەندەکانی دەیمونا کە

لەبیرئەلسبع کۆدەبوونەوە سواری دەبوون تا بنکەی دەیمونای دەبردن، لەوێشەوە بەئۆتۆمبێلی تایبەتییەوە دەگەیەندرانە شوێنەکانی کارکردنیان، هەر ژمارەیەکیان دەچوونە بەشە تایبەتییەکانیان، دیارە ئەوانەش هەموو خاڵەکانی پشکنینیان دەبڕی ئنجا دەگەیشتە شوێنەکانی کارکردنیان. بەیانیان ئەفسەرێکی ئاسایش پێش دەرچوونی ئۆتۆمبێلەکە لە کارمەندەکان دڵنیادەبوو، رۆژانە هەموویان ورد پشکنینی وردیان بۆ دەکرا، ئەو ئەفسەرەش بەئۆتۆمبێلێکی جۆری جێبی سەربازی بەپێشیان دەکەوت، بەناو بیابانی ئەلنەقەبدا دەڕۆیشتن، هەموو بەرنامەکان وردو باش کۆنترۆڵ دەکرا، چونکە دەیمونا گەنجینەیەکی گرانبەهای ئیسرائیلی تێدایەو مانەوەی دەوڵەتەکەیان بەو دەزگایەوە بەستراوەتەوە.

پلانەکەی ئەبو جیهاد ئاسانو سادە بوو، بەڵام زۆر باش شرۆڤە کرابوو، دیارە کە زۆریش بەترس بوو، چونکە ئاسان نییە کەسانێک نەکرێ بچنەوە ناو وڵاتەکەیان، بۆیان نەبێت سنوور ببەزێنن ئەو کەسانە بگەنە دەزگا ترسناکە ئۆتۆمییە ئیسرائیلییەکە. دەستە فیدائییەکە سێ تفەنگی رەشاشیان پێبوو، یەکێکیان جۆری کارل گوستافی دروستکراوی میسری بوو، دوو کەسەکەی تریان کلاشینکۆفیان پێبوو، ئەو دەستەیە ٢٠ نارنجۆکی دەستیان هەڵگرتبوو، هەر فیدائییەک چوار مەخزەنی یەدەگیان پێبوو، جانتایەکی تریان هەڵگرتبوو کە چەند پێویستی تری تێدابوو. دەستەکە پاش ئەوەی چەندین خاڵی پشکنینی سەرسنووریان دەبڕن، لەژمارەیەک نۆرینگی ئیسرائیلی ئامادەو وریاو سازکار خۆیان دەربازدەکەن، چونکە سەردەمی سەرهەڵدان بوو، بۆیە سوپای

ئیسرائیلی لە ئامادەباشی تەواو دابوون. لەسەعات شەش و پێنج دەقەی بەیانی رۆژی دووشەممەی رێکەوتی ٧ ی مارسی ساڵی ١٩٨٨ فیدایییەکان پاش ئەوەی رێگایەکی سەختی بیابان بەزەحمەتی دەبڕن دەگەنە رێگای دەیمونا.

کە دەستەکە دەگەنە ناوچەکە یەکێکیان خۆی دەگەیەنێتە سەر رێگا قیرەکەو لەوێیەوە ئیشارەت دەداتە هاورێیەکانی کە ئۆتۆمبێلێکی سەربازی ئیسرائیلی کە لەگەڵ پاسەکە بەرێوەیە دەرکەوت، ئەو زوو نارنجۆکێک دەخاتە بەردەم ئۆتۆمبێلەکە، بەوەش سێ فیدایییەکە دەتوانن ئۆتۆمبێلەکە کۆنترۆل بکەن. ئەو فیدایییەی کە ناوی (عەبدولا خەلەف) بوو دەکەوێتە پێش سوکانی ئۆتۆمبێلە سەربازییەکە کە مارکەی رینۆ بوو، هاورێیەکەی کە ناوی (محەمەد عەبدولقادر) بوو دەکەوێتە تەنیشتی، لەسەر تەختەی پشتەوەی هاورێیەکەیان (محەمەد ئەلحەنەفی) دادەنیشێت، ئەو سێ کەسە لەکاتی دیاریکراودا دەگەنە سێرپانی عەرعەر دەیمونا. ئەوان دەتوانن بەربەستی پۆلیسی ئیسرائیلی لەو سێرپانەدا ببڕن. بەپێی زانیارییەکان ئەو ئۆتۆمبێلە دەستەیەک لەپسپۆڕو کارمەندانی دەزگا ناوەکییەیان هەڵگرتبوو، کە لەسەعات حەوت و نیوی بەیانیان لەبازگەیەک دەوەستان. عەبدولاو دەستە فیدایییەکە بەئۆتۆمبێلە رینۆیە سەربازییەکە لەگەڵ زەمەن پێشبڕکێیان بوو تا لەکاتی دیارکراودا بگەنە سێرپانی عەرعەر دەیمونا، خۆشبەختانە لەدوورەوە جوانەوە شینەکە دەردەکەوێت، بەوەش دەگەیشتە خاڵە دیاریکراوەکەیان، ئەوەش پاسە شینەکە بوو کەمیانیان کارمەندەکانی دەگەیاند. فیدایییەکان هێرشیان بردە سەر بازگەکەو بەچڕی گوللەبارانی

سەربازەکانیان کردبوو، ئینجا لەئۆتۆمبێلەکەیان دادەبەزن و چاوەڕوانی گەیشتنی جوانووە شینەکە دەبن، لەهەردوولای شەقامەکە سێرەیان گرتبوو، ئامادەو سازبوون. لەو دەمانە ئۆتۆمبێلێکی سەربازی دەگاتە پێش جوانووەکەو ڕووی لە فیدائییەکان گوم دەکات، بۆیە عەبدوڵا تەقە لەئۆتۆمبێلەکە دەکات، بۆیەش پاسەکەی پشتەوە لەناکاودا دەوەستێت، بەوەش فیدائییەکان دەتوانن بچنە ناو پاسەکە، بەزەبری چەکەکانیانەوە پاسەکەیان ناچار دەکەن بەرەو دەزگاکە بڕوات. دیارە سەربازەکانی بازگەکە ئاگاداری سەرووی خۆیان دەکەنەوە کە پاسەکە ڕفێنراوەو تەقەش لەوان کراوە، بەو هەواڵە زەنگەکانی ئینزار لەنووسینگەکان لێدەدەن، لەناو ماڵەکان و لەناو ئۆتۆمبێلە سەربازییەکان دەبێتە بانگەوازو داواکردن، قیامەت لەناو ئیسرائیل هەڵدەستێت، لە ئاسمانی ناوچەکە چەندین کۆپتەر دەبینرێت، سەدان سەرباز بەپەرەشوتەوە دادەبەزن، هەموویان مەشقیان لەو جۆرە ڕووداوو هێرشە کتوپڕیان کردبوو، لەسەر ئەرزیش سەدان ئۆتۆمبێلی سەربازی و پۆلیس و پاسەوانی سنوور دەکەونەخۆ، هەموو دەکەونە دوای ئۆتۆمبێلە شینەکە، کە تەنها حەوت کیلۆمەتری مابوو بگاتە دەزگاکەی دەیمونا، بۆیەش سەربازەکان تەقەیان لەتایەکانی دەکەن و لەڕۆیشتنی یەکی دەخەن، بەوەش ئۆتۆمبێلەکە دەبێتە لاشەیەکی مردووو جووڵەی لێ دەبڕێت.

پاسە شینەکە دەبێتە نێچیرێکی زامدارو پەککەوتوو، کە بەژمارەیەک گورگی دڕ دەوری درابوو، چەندین فڕۆکە وەک بازو قەل لەئاسمانەوە لەسەری دەسوڕانەوە، کەشە هێمن و ئاسۆ بەرینەکەی بیابانی نەقەبیان ئاڵۆزکردبوو، کە تەنها حەوت کیلۆمەتر لەدیمەنەکە دوور

بوون، دیمەنی رۆژی قیامەت، بەپێی بەرنامەکەی ئەبو جیهاد دەستە فیدائییەکە ئەفەرەکانی ناو پاسەکە بکەنە سێ بەش، هەر یەکێک لەفیدائییەکان پاسەوانی دەستەیەک بکەن، ئەوانەش بەزەبری چەک دیل بکەنو تا بەو دیلانە دەتوانن ناچاریان بکەن بچنە ناو دەزگاکە. هەر چەند کاتەکە دەڕۆیشت زۆرتر سوپاو هێز لەپاسەکە کۆ دەکرایەوە فڕۆکەی کۆپتەر زۆرتر دەبوون، هەندێک بەئاسمانەوە بوون ژمارەیەکیش دەنیشتن، سەدان ئەفسەرو کۆماندۆز ئامادەبوون، هەموویان لە بازنەی پاسە شینەکە دەخولانەوە. دانوستانو خۆگرتنەکە ٤٥ دەقەی ویست، تا وەزیری بەرگری ئەودەمانە ئیسحاق رابینو سەرۆکی هەیئەی ئەرکان دان شەمرونو سەرکردەی ناوچەی باشووری سەربازی ئیسحاق موردخای دەگەنە شوێنەکە. عەبدوڵا عەبدولمەجید بەهۆی بڵندگۆیەک داوای لەئامادەبووان کردبوو نوێنەری خاچی سوور بگاتە شوێنەکە، ئەو لەگەڵ ئەواندا دانوستان دەکات، تا داوای ئازادکردنی گیراوەکانی رۆژانەی سەرهەڵدانیان لێ بکات، کە ژمارەیان دەگەیشتە نۆ هەزار کەسو فیدائییەک. بەردەوام داواکەی بۆ ئیسرائیلییەکان دەگووتەوە، هەروەها هەڕەشەیان دەکرد ئەگەر داواکانیان جێبەجێ نەکەن هەموو دیلەکان لەناو دەبەن.

پێش ئەوەی ماوەی دیاریکراوی دانوستانەکە کۆتایی بێت، پاسەکە درایە بەرلێزمەی قەناسەکان، شەڕەکە قەومـا سێ فیدایی لەگەڵ سوپایەکی پڕ چەک لەو شوێنە چۆڵەدا، کە تەنها حەوت کیلۆمەتر لەشوێنە ئەفسوناوییەکەی ئیسرائیل دوور بوو دەبێتە شەڕێکی دژوار، لەو ماوەیەدا دەسەڵاتی ئیسرائیل بواری نەدا هەواڵەکان بڵاوبێتەوە، هیچ

جۆرە راگەياندنێک دەرنەچوو ئيسرائيلييەكان داوايان كرد تەنها قسەو لێدوان لەپەيڤداری ردسمی ئيسرائيل وەردەگرن هەر ئەوەش بڵاودەبێتەوە. دەزگا رەسمييە ئيسرائيلييەكان رايگەياندبوو كە سێ كەس لە كارمەندانی دەزگا ئوتۆمبيلەكە كوژراوە، ئەوەش بەپێچەوانەی ژمارەی بريندارەكان بوو، لەلايەن خۆشييەوە پيريز وتبووی:

ئێمە رووبەرووی دوژمنێک بووينەتەوە لەئوسلوبەكانياندا هيچ جياوازی ناكەن، ئامادەن هەموو شتێک بكەن تا بگەنە هەر پێگەيەكی ئيسرائيلی. لەهەمان رۆژيش بڕيار دەدرێت ئەنجوومەنی جەنگی ئيسرائيل كۆببێتەوە.

پاش چەند سەعاتێک لەرووداوو هێرشە فيداييەكەی دەيمونا كە دەوڵەتی ئيسرائيلی بە هەموو دەزگاكانييەوە هەژاندبوو، لە رۆژی ٧ ی مانگی مارسی ساڵی ١٩٨٨ بڕياردەدەن ئەبو جيهاد لەناوببەن، ئەوەش لەكۆبوونەوەی ئەنجوومەنی جەنگی ئيسرائيلی بڕياری لەسەر دەردەچێت، كە تێدا سەرۆكی حكومەت ئيسحاق شاميرو وەزيری بەرگری ئيسحاق رابينو وەزيری دەرەوە شيمون پيريزو سەرۆكی ئەركان دان شەمرون يارپدەرەكەی ئيهود باراک (ئەوەی لەساڵی ٢٠٠١ پۆستی سەرۆكايەتی حكومەتی ئيسرائيلی وەردەگرێت)و سەرۆكی دەزگای مۆساد نەعوم ئادمونیو سەرۆكی موخابەراتی سەربازی ژەنەراڵ ئامتۆن شاحكو چەندين گەورە ئەفسەرانی سوپای ئيسرائيلی تێدا بەشدار دەبن،

بەرەزامەنـدیو راسـپاردەی هەمـوولایەک بڕیـاری پێویسـت دەدەن بـۆ لەنـاوبردنی ئەبـو جیهـاد، بـۆیەش ئامـادەیی دابینکردنـی هەمـوو پێویستییەکانی سەرگرتنی ئەو پلانە دەکەن.

هەمـوولایەک بەشـێوەیەکی زۆر خێـرا بـۆ جێبەجێکردنـی ئەو کـارە دەکەونە ئامادەسـازی، سـەرکردایەتی سـەربازیی بەو کـارە رادەسـپێرن، پەیوەندی بەبەکرێگیراوەکانیـان لەنـاو وڵاتـی تـونس دەکەن کە ژمارەیـان زۆربوو، بۆیەش سەرۆکایەتی ئەرکانو بەهاوکاری موخـابەراتی ئیسـرائیلی بەرنامەرێژی بۆ کوشتنی ئەبو جیهاد لەناو وڵاتی تونس دادەرێژن.

بۆ کوشـتنی ئەبـو جیهـاد پێویسـتیان بەسازکردنی هێزێکی سـازکارو زۆرتـرین ئیمکانیـاتی نائاسـایی دەبێـت، دەبـووایە ئەو شـارەی ئەو تێـدا دەژیـا زۆر بەدروسـتی کـۆنترۆڵ بـکەن، دیـارە کـارەکە لە کوشـتنی تـاکە کەسـێک گەورەتـر بـوو، تـیمە راسـپێردراوەکە پێویسـتی بەچـوار بەلەمـی جۆری کورفیتـو دوو بەلەمی تری جـۆری زار ٥، ٤و دوو بەلەمـی تـری جـۆری زار ٤ دەبێت، کە تیمەکە بۆ هێرشبردنەکە بگەیەنێتە نـاو وڵاتـی تـونس، ئەو سازکارییەش ئامادەیی هەبێت بەخێرایی لەکاتی تەواوکردنی کارەکە تیمەکە لە شـوێنەکە دوور بخـاتەوە، بەلەمەکـان کـۆپتەری جـۆری ٢٠٦یـان هەڵگرتبـوو، کە بتوانێـت کە یەکێـک برینـدار دەبێـت بەزوورتـرین کـات فریــاگوزاری پێشــکەش بکرێــت، هەروەهــا بەلەمێکــی تریــان نەخۆشـخانەیەکی تەواوی بـارکردبوو، کە جۆرەهـا ئـامێرو ئیمکانیـاتی نەشتەرگەرییان لەبن دەستدا بوو، دوو دکتۆری زۆر شارەزای ئیسـرائیلیش بەشـدار دەبێـت، کە یەکێکیـان نەشـتەرگەرو ئەوی تریـان بـۆ کاروبـاری سڕکردن دانرابوو.

ئیهود باراك راستەوخۆ سەرپەرشتى جێبەجێكردنى بەرنامەكەى دەكرد، ئەو دەمانە ئەو جێگرى سەرۆكى ئەركانى سوپا بوو، هەروەها جێگرى سەرۆكى مۆسادو سەرۆكى چالاكییەكانى دەریاوانى لەسوپاى ئیسرائیلى بەردەوام پەیوەندى بەچەكى دەریاوانى ئیسرائیلى هەبوو، دەستەكە یەكێك لەكەشتییەكانى دەكاتە بارەگاى سەرپەرشتى چالاكییەكە. بەرنامەكە ئیعتیماد دەكاتە سەر یەكەى سیارە متقال و فلوتیلا ١٣، تیمە كۆماندۆزەكە لەدەریاوە دەگوازنەوە شوێنێكى تایبەتى لەسەر كەنارو نزیك لە شوێنەوارى قرتاجەى كەڤنارى مێژوویى، لەوێش دەستەى بەكرێگیراوانى مۆساد لەخزمەتیاندا دەبن، كە كەنارەكەیان بۆ دابیندەكەن و هەموو پێویستییەكانیان بۆ ساز دەكەن.

دیارە كە چالاكییەكە پێویستى بەدوو فڕۆكەى جۆرى بۆینگ ٧٠٧ دەبوو، كە یەكێكیان بكرێتە مەڵبەندى سەركردایەتى ئاسمانى و فڕۆكەكەى دى بكرێتە مەڵبەندى پەیوەندیى ئەلكترۆنى زۆر پێشكەوتوو، لەیەكەمینیاندا سەرۆكى فڕۆكەى سەربازیى ئیسرائیلیەكە ژەنەراڵ ئافیهوبنن بۆ بەردەوامى پەیوەندیى لەگەڵ باراك و سەركردایەتى سەربازى فڕۆكەى كاركەربوو، لە فڕۆكەكەى تریان سەرۆكى مۆسادو سەرۆكى موخابەراتى سەربازییش هەموو وردەكاریەكان دەداتە زۆرى عەملیاتى سەرەكى تایبەت بەسوپاى ئیسرائیل لەتەلەئەبیب، بەوەش زۆرى عەمەلیاتەكە راستەوخۆ پەیوەندى بەتیمە كۆماندۆزەكەى سیارە متقال دەبێت، كە رۆڵى سەرەكى و كاریگەریان لەچالاكییەدا دەگێڕا.

لەسەر ئاوى دەوڵى دەریاى ناوەڕاست، دوو فڕۆكەى بارهەڵگرى سوتەمەنى بۆ دابینكردنى سووتەمەنى بۆ فڕۆكەكانى ئەو كارە

ئامـــادەبوون، لەگەڵ ئەوانەشـــدا چـــوار فـــرۆکەی جەنگـــی ئیـــف ١٥ بـــۆ مسۆگەرکردنی سـەلامەتی فڕۆکەکـانی بوینـگ ٧٠٧و ئەنـدامانی تیمەکەی سـەر ئەرز ئامـــادەبوون. ئیســـرائیل بـــۆ ئەو کـــارە ســـوپایەکی تەواوی سازکردبوو، چونکە بە هەموو شێوەیەک ئامادەیی هەبوو کارەکە بکات، چـونکە ئەو هـێڵە سـووردکانی بەزانـدبوو، چالاکییەکـانی بەرگـری زۆر کردبـوو. ئەو تـیمە تـایبەتییە دەسـتەیەکی چـالاکی هەڵبـژاردراو بـوو، یەکەکەیـان نـاوی سیارە متقال بـوو لە ناوەنـدی پەنجاکـانەوە بەنهێنـی دامەزرابوو، تا ئیمڕۆش ئەو تیمە هەر بەنهێنیو بەدزی کارەکـانی دەکـات، ئەوانە بەردەوام کـاری لەو جۆرەیـان پـێ سـپێردراوە، کـاری ناسـکو مەترسیدار ئەنجام دەدەن، ئەوان لەناو خاکی نەیارەکەیانو لەپشتەوەی بەرەکـانەوە کـاری خۆیـان دەکەن، لەوێـیەوە زانیـاری کۆدەکەنەوەو تـۆڕی ئیسـتخباراتی بـڵاودەکەنەوە، لەنـزیکەوە لەگەڵ موخـابەراتی سـەربازیو مۆساد کـاردەکەن، ئەوان پەیوەنـدییان راسـتەوخۆ بەسـەرۆکی ئەرکـانەوە دەبێـتو گەیاندنی زانیارییەکـان لەلای ئەوانەوە پـلە بەپـلە سـەرناکەوێت بەڵکو یەکسەرو راستەوخۆ دەبێت.

ئەوەی زانراوە کە ئەو سریە چەقۆی تیژەو دەکارێت ئەشتەرگەرییە وردو زەحمەتەکان بـۆ ئیسرائیل بکـات، بەتـایبەتی لەکـاتی ئاشتی زۆرتـر کاردەکەن نەک لەکـاتی شـەڕەکاندا، ئەنـدامەکانی ئەو دەسـتەیە دەمـاری ئەعســابی پۆڵاییـــان هەیە، هەموویـــان لەرووی جەســـتەو فـــۆرمەوە پـــڕو تەواون، لەهەموو چەکەکان پسـپۆڕو شـارەزان، هەر یەک لەوانە دەتوانێـت بەتەنهاو دوور لەهاوڕێیەکانی لەتیمەکە چالاکییەک ئەنجام بدات.

شەوی ١٦ ی ئەپریل ئەو تیمە تایبەتییە جلی رەشی دژ بەسوتانیان

لەبەردابوو، پێڵاوەکانیان لەپلاتینیۆمو جلی ژێرەوەیان دژی گوللەی بوو، هەر یەکێک لەوانە ئامێرێکی پەیوەندی بەئامێری ناردنو سەماعەی میکرفۆنیان پێبوو، ئامێرێکیان پێ بوو ئەگەر یەکێکیان لەدەستەکە داببرێت یەکسەر زەنگی بۆ لێدەدات، سەرکردایەتیش تۆڕێکی بۆ دەستەکە سازکردبوو کە بتوانێت جوولەو چالاکییەکانیان بزانێت، تا لەکاتی پێویستو تەنگانەدا زوو دەستی یارمەتییان راستەوخۆ بگاتێ، ئەوەی شایانی باسە هەموو چەکەکان دروستکراوی ئیسرائیلی بوون، تا چەکەکانو کەرەستەکان نەناسرێنەوە سەرچاوەکانی دروستکردنو بەرهەمهێنانیان لەسەر لابردبوون.

هەردوو تیمی یەکەمو دووەم چەکی ئۆتۆماتیکیان پێ بوو کە مارکەکەی OZI بوون، دەکرا بەبێ دەنگی بتەقن، بێجگە لەوەش هاونی سووکو نارنجۆکیان لەلابوو. ئەو تیمە دوو هەفتە لەشوێنێکدا مەشقیان کردبوو، کەلەشوێنی چالاکییەکە دەچوو، شوێنەکە لەشاری حەیفا نزیک بوو، پسپۆڕەکان خانووێکیان لەسەر نەخشەی خانووەکەی ئەبو جیهاد لە تونس لەگەڕەکی ئەلبو سەعید لەو شوێنە بۆ مەشقی تیمەکە سازکردبوو، وەک خانووەکەی ئەوو لەسەر کەناربوو، تا خانووەکە باش لەو گەڕەکو ناوچەکەی ئەبو جیهاد بچێت، کۆڵانێکیان لەشوێنی مەشقکردنەکە دروستکرد، شێوازە خانووەکانی بەخانووەکەی ئەبو جیهاد دەچوو لە تونس، ئەوان مەشقەکانیان لەو کاتانەدا دەکرد کە چاوو زوومی کامیرەکانی مانگە دەستکردەکانی ئاسمانی ئەمریکیو سۆڤیەتی لەناوچەی حەیفا دووربن، نەوەک دیمەنی مەشقەکان بگرنو تۆماری بکەن. لە رۆژانەی مەشقەکەدا تیمی یەکەم دەرگای خانووەکە دەروخێنن،

تا، بتوانن لەماوەی تەنها ؟؟ چرکە ئەبو جیهاد بکوژنو بۆی دەربچن.

هەفـتەیەک پـێش رۆژی چـالاکییەکە تیمێکـی تـایبەت بەمۆسـاد دەگەنە ناو تونس، کە بریتی بوون لەشەش پیاوو ژنێک، ئەوان بەناوی سەردانێکی بزنسمان بەناسنامەی تەزویـری زۆر بـاش سازکراو گەیشتنە ئەو وڵاتە، سـەرۆکی تیمی سـیارە متقـال لەرۆمـاوە بەپاسـپۆرتی خـۆیەوەو بەنـاوی کـاری بازرگـانی گەیشـتە تـونس، لەوێ پیـاوانی مۆسـاد لە فرۆکەخانە لەپێشوازییدا بـوون، سـەرۆک تیمەکەیـان تـا مـاڵەکەی ئەبـو جیهـاد دەبەن، رێگـاکەی سـەر دەریـای پـێ نیشـاندەدەن و بەیەکەوە رووماڵێکی باشی رێگاکەو ناوچەکەیان کردبوو، تێبینییەکانیان وردو جوان تۆمارکرد، کە کارەکانی تەواوکـرد بـۆ بەیـانییەکەی سـەرکردە سـەربازییە ئیسـرائیلییەکە گەڕاوەتەوە ئیسـرائیل، لەوێ دەگـاتە لای ئەنـدامانی تیمەکەی کە لەناو بەلەمێکدا لەناو دەریا چاوەڕوانیان دەکردو مووشەکیان هەڵگرتبوو.

سێ کەس لەتیمەکەی مۆساد کە پاسـپۆرتی لوبنانیـان بـۆ چێکـراوو لەتـونس ئۆتـۆمبێلێکی جـۆری بیجۆی ۳۰۵و دوو ئۆتـۆمبێلی جـۆری مینـی بوسـی فـۆکس ڤـالگۆن بەکـرێ دەگرێـت، لەلایەکـی تریشـەوە پیاوەکـانی مۆساد ماڵەکەی ئەبو جیهادیان باش کۆنترۆڵ کردبوو، دەیانویست بـاش لەبەرنامەو کارنامەکانی حاڵی بن، ئەوەک گۆڕانێکی تێدا روو بدات، باش کاتی پاسەوانەکانیان حیسابکردبوو، سێ رۆژ پـێش چـالاکییەکە دەروازەی

شــەقامەکانی ناوچەکەیــان رووماڵکردبوو، ئەو پاســەوانانە لەکێــوە دەردەچــن، چــۆن دەگەرێــنەوە، هەروەهــا هەمــوو هێڵــی تەلەفۆنەکــانی نــاوچەکە دەخەنە بــن دەســتیان بەوەش وردو بــاش کــۆنترۆڵی پەیوەندییەکانیان کردبوو.

پێش کاتی دیاریکراوی چالاکییەکە موخابەراتی ئیسرائیلی هەستی بەوە کردبوو کە فەرەنسییەکان بۆنی ئەو چالاکیانەی کردووە، بۆیەش زوو بەخێرایی هوشیاریان دابوو سەرکردایەتی فەلەستینی کە ئیسرائیل بەنیازی کارێکی لەو جۆرەن، بەڵام ژەنەراڵ باراک سەرکردەی چالاکییەکە لەبڕیــارەکەی خــۆیو لەکــاتی دیــاریکراودا پەشــیمان نــابێتەوە، پشــتی بەســتیو خەمساردی فەلەستینییەکان دەبەستێتو لەسەر بەرنامەکەی خۆی بەردەوام دەبێت.

دەســتەی بەلەمەکــان (فلــوتیلا) لە کەنارەکــانی تــونس نزیــک دەبنەوە، شوێنەکەیان لە زوومی رادارەکان دووربوو، فڕۆکە میراجەکە کە بەباشترین مەڵبەنــدی گەیانــدنەوە ســازکرابوو کە لەبــنکە ئاســمانییە ئیسرائیلییەکە هەڵدەستێت، کــار بــۆ ئەوە دەکــات ناوچەکەیــان بــۆ ئــارام بکاتو پارێزگاریان مسۆگەر بکــات تــا دەستەکان بەهــیچ جۆرێــک نیگایــان لەسەر نەبێــت، لە نزیــک کەنارەکــانی تونسیش فــڕۆکە جەنگییەکــانی جــۆری ئیــف ١٥ بەســووتەمەنی پێویســتەوە دەفــڕین، ئەوانــیش فــڕۆکە بۆینگەکەیان دەپاراست، دەیتوانی هەموو پێویستیو پارمەتییەکانیان بــۆ دابــین بکــات. هەمــوو کارەکــان ســازبوون، بــۆیە بەلەمە مووشــەکییەکان گەیشتنە ناو ئــاوی تــونس، لەدووری چەنــد کیلــۆمەترەوە دەستەی پیــاوە بۆقییەکــان دادەبەزنە نــاو ئــاوەکەو بەمەلەکــردن بەرەو کەنــارە چــۆڵەکە

دەڕۆن، لەوێ دەستەیەک لەپیاوانی مۆساد چاوەڕوانیان دەکردن، بەوەش چالاکییەکە دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە.

کە فەرمانەکە دەردەچێت لەماوەی پێنج چرکەدا چەکدارەکان لەئاوەکە دووردەکەونەوەو دەگەنە سەر کەنارە ئارامەکە، بەخێرایی سواری ئۆتۆمبێلەکان دەبن کە زووتر بۆیان بەکرێ گیرابوو، بەرەو ماڵەکەی ئەبو جیهاد بۆی دەردەچن، کە دەکەوتە سەرگردێکی نزیک دەریا، کە تەنها پێنج کیلۆمەتر لەشوێنی دابەزینی تیمەکەوە دوور بوو. ئەوەدەمانە کات کەمێکی مابوو بۆ یەکی بەیانی، ماڵەکەی ئەبو جیهاد کە لە(ئەلبو سەعید) بوو باش لێومیان دیاربوو، ناوچەکە ئارام بوو، بەرپرسانی چالاکییەکە ئەوەیان باش دەزانی کە ناوچەکە باش کۆنترۆڵکراوە بەجۆرەها چەکدارو پاسەوان دەوری گیراوەو چەکداری مەشقداری زۆر باشیان لەگەڵدایە، سەرۆکی موخابەراتی فەلەستینی ئەبو هۆل ماڵەکەی لەو ناوچەیە بوو، ماڵی ئەبو مازنیش هەر لەو ناوچەیەدا بوو، ئەوانەو چەند بەرپرسی تری فەلەستینی ماڵیان لەو ناوچەیەدا بوو.

دەستەکە لە چواردەوەرەی ماڵەکە شوێنی خۆیان دەگرن، لەناو تاریکەکەدا خۆیان گووم دەکەن، چاویلکەی تاریکی لەچاو دەکەن، دەستەیەکیش رێگای گەڕانەوە دابین دەکەنو شەقامەکانی ناوچەکە دەپشکنن، دەستەیەکیان تەلەفۆنەکان لەکار دەخەن، دیارە فڕۆکە بۆینگەکە کە جۆرەها ئامێری پێشکەوتووی ئەلکترۆنی لەناودابوو ئەو کارەی دەکردو دەیتوانی هەموو ئامێرەکانی بێتەل لەکار بخات، تا بۆیان نەبێت هیچ جۆرە ئینزارێک بنێرنو هەموو دەزگاکانی ئینزار پەک بخەن.

لەودەمانەدا ئەبو جیهاد لەماڵەوە نابێت لەگەڵ (فاروق قەدومی) بەرپرسی کاروباری دەرەوەی ڕێکخراوەکەیان کۆبوونەوەی دەبێت، لەو کۆبوونەوەیەدا ئەو دوو سەرکردەیە باسی ئەوەیان دەکرد کە ئەمریکا بڕیارێکی دوژمنانەی دەرکردووە بۆ داخستنی نووسینگەی نێردراوی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. دەستە هێرشبەرەکە کە دەزانن ئەبو جیهاد لەماڵەوە نییە دەشێوێن، بەڵام ئەو لەسەعات یەک و نیوی بەیانی دەگەڕێتەوە ماڵەوە، کە ئۆتۆمبێلەکەی دەگاتەوە ماڵەوە ئەوان شوێنەکانیان دەگرن.

لەسەعات دووو نیوی شەو ڕووناکییەکانی ژووری نووسینگەکەی لەنهۆمی خوارەوە دەکوژێتەوە، پاش ساتێکی کەم ڕووناکی ژووری نووستنەکەی لەنهۆمی دووەم دادەگیرسێت، کاتەکان بۆ دەستەکە هێدی هێدی دەڕۆیشت، پیاوە چەکدارەکان چاوەڕوانی کوژانەوەی ڕووناکییەکانی ئەو ژوورە بوون تا بگەنە ئامانجی خۆیان، زۆری نەخایاندو مەرامەکەیان هاتۆتە دی، شوێنەکە دەبێتە تاریکستان و سەعاتی سفر دەست پێدەکات.

چەکدارەکان سەماعەی گوێیان پێ دەبێت، بەو سەماعانەوە چاوەڕوانی فەرمانی دەستپێکردنیان دەکرد، فەرمانەکەیان بۆ دەردەچێت، تیمی یەکەم لەدەروازەی یەکەمەوە دەچنە پێشەوە، تیمی دووەمیش لەدەروازەی دووەمەوە دەچنە پێشەوە، تیمی سێیەمیان لەپشتەوەو لەپێشەوە شوێنی خۆیان بۆ یارمەتیدان لەکاتی پێویستدا دەگرن، ئەگەر ئەوان ئاگری زۆر چڕتریان پێویست بوو، تیمی چوارەمیش لەدوورەوە چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کەس لەو ناوچەیە نزیک نەبێتەوەو ڕێگا لە کەسانی نوێ بگرن بگەنە ناوچەکە.

تیمی یەکەم بەنەرمی دەستی بەکارکردنەکەی خۆی دەکات، ئەوان دەگەنە ناو ئۆتۆمبێلەکەی ئەبو جیهاد، شوفێرەکە لەناو ئۆتۆمبێلەکە خەوی لێ کەوتبوو، بەیەک گوللەی بێدەنگ کۆتایی بەژیانی دەهێنن. هەردوو دەروازە گەورەکەی پێشەوەو پشتەوەی ماڵەکە بەداری ئەستوور دروستکرابوون، بەڵام بەئاسانی بەهێز داپۆشرابوون، بەکارێکی تەکنەلۆژی زۆر پێشکەوتوو دەتوانن دەرگاکە بەبێ دەنگ بشکێنن‌و بچنە ژوورەوە، یەکێکیان دەچێتە ناو ماڵەکەی ئەو، تیمی دووەمیش دەروازەکەو نهۆمی یەکەمی دەپاراست، تیمی یەکەم دەچنە نهۆمی سەرەوەی ماڵەکە، کە مەستەفای پاسەوانەکەیان دەکوژن، بەئاسانی دەگەنە ژوورەکەی نووستنی ئەبو جیهاد، تیمی دووەمیش پاسەوانێکی تری دەکوژێت کە لەماڵەکەدا کارکەر بوو.

ئەبو جیهاد لەناو ژووری نووستنەکەی خۆیدا هەستی بەجووڵەیەکی نائاسایی لەنهۆمی یەکەم دەکات، بەڵام کاتەکە تێپەڕیبوو، چەکدارەکان لەسەر سەری وەستابوون، لوولەی تفەنگەکانیان لەسینگی کردبوو، بەگوللەکان ژوورەکەیان کردە نوێژی نیوەڕۆ، ٧٤ گوللە بەجەستەی دەکەوێت، ژنەکەی وەک ئەوەی بورابێتەوە لەتەنیشتییەوە بوو، بەڵام دەستیان لەو نەدابوو. دەستە چەکدارە ئیسرائیلییەکان وەک چۆن بەخێرایی گەیشتبوونە ناو ماڵەکە، پاش تەواوکردنی کاردەکەیان بەهەمان خێراییەوە لەناو ماڵەکەدا دەردەچن، چالاکییەکە لەو دەمەی چوونە ژوورەوەو کوشتنی ئەبو جیهاد تا دەرچوونیان تەنها ١٣ چرکەی ویستبوو، ئۆتۆمبێلەکان لەدەرەوە چاوەڕوانیان دەکردن، ئۆتۆمبێلەکان بەخێرایی هەمووی گەیاندەوە شوێنی کۆبوونەوەکەیان‌و گەیشتنە سەر

كەنارەكە، لەوێ پياوەكانى دەستەى فلوتيلا ١٢ چاوەڕوانى گەڕانەوەى ئەوانيان دەكردن، هەمووليەك بەسەلامەتى گەيشتنەوە ناو بەلەمەكانيان، لەوێشەوە تا بەلەمە مووشەكدارەكانيان ڕۆيشتن، گەشتەكەيان لەئيسرائيلەوەو تا ئەنجامدانى چالاكييەكەو گەڕانەوەيان چوار ڕۆژى خاياند بوو.

# ئەميرى جيهاد

بەيانى هەموو ڕۆژنامەكانو هەموو دەزگا ڕاگەياندنە عەرەبييەكان بۆ گيانى ئەبو جيهاد، بۆ سونبلى فيدائيەتى مەزن گريان، مانشێتەكان بەو جۆرانە نوسرابوون:

- سەركردەى سونبل... سەركردەى ميللەت.
- فيدائى پاك ئەبو جيهاد.
- باوكى نەوە شۆڕشگێڕەكانى ئەوانەى بەردەوام هەڵدەچن، شەهيدى شەهيدەكان.
- ئەو شەهيدەى لەمردن جوانترە... ئەوەى بێدەنگييەكەى لێدوانى بەتوانابوو.
- ئەبو جيهاد ناوێك نەبوو... ئەو وشەى نهێنى بوو.
- لەناو ژيانى ئەودا ميللەتێك بوونى هەبوو.
- هيچ كونە درزييەك لەناو شۆڕشى فەلەستيندا نييە ئەبو جيهادى تێدا نەبێت.

❖ ئەو ئــــاوزەی بیرکـــــردنەوەو دەســـــتی زۆر گەورەو داهێنـــــانو دەستکەوتەکانی شۆڕشی فەلەستینی بوو.

❖ ئەو قەڵاتی شەڕی چەکداری بوو.

❖ ئەو پاڵەوانێکی شۆڕشگێربوو، لەبەر ئەوەی عاشقی شەهیدبوون بوو، بۆیەش شەهیدبوو.

❖ تۆماری ئیسرائیلییەکان لە کوشتنی سونبلەکانی فەڵەستینی

❖ لەناو لیستی کوشتنی فەڵەستینییەکاندا ریزەکان زۆر درێژە، کە لە ساڵی ۱۹۷۲ ەوە، دەستیان کردووە بەکوشتنی فەڵەستینییەکان، لەوانە بەرپرسی راگەیاندنی بەرەی میللی غەسان کەنەفانی کە مۆساد لە رۆژی ۷ ی مانگی ئۆگستی ساڵی ۱۹۷۲ تیرۆری کردووە، لیستەکە درێژە ئەوەش تۆمارێکی لیستەکەیە:

❖ لە رۆژی ۱۷ ی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ۱۹۷۲ لە رۆما وائیل زعیتری بەرپرسی بزاڤی ئەلفەتحیان کوشتووە.

❖ لە رۆژی ۸ ی مـــانگی دیـسـمبەری ســاڵی ۱۹۷۸ لە پـاریس دکتـۆر مەحمود ئەلهەمشەری نوێنەری رێکخراوەکەیان لەپاریس کوشتووە.

❖ لە رۆژی ۲۵ ی مـانگی یەنـایەری ســاڵی ۱۹۷۳ لە قـوبرس حوسـێن بەشیر ئەلخیری نوێنەری رێکخراوەکەیان کوشتووە.

❖ لە رۆژی ٦ ی مانگی ئەپریلی ساڵی ۱۹۷۳ لە پـاریس دکتـۆر باسل ئەلقبیسییان کوشتووەکە، کە یەکێک بووە لە سەرکردایەتی بەرەی میللی فەڵەستینی.

❖ لەرۆژی ٢٨ ی مـانگی یونیـۆی سـاڵی ١٩٧٣ لەپـایتەختی نەرویـژ هاوڵاتی مەغریبی ئەحمەد بوشیکییان بەهەڵە کوشتووە وایانزانیبوو کە ئەو ئەبو (حەسەن سەلامە)یە.

❖ لە رۆژی ١٠ ی مـانگی نیسـانی سـاڵی ١٩٧٣ لە بەیـروت شـاعیرو شۆڕشـگێر کەمـال ناسـری ئەنـدامی لیـژنەی تەنفیزییـان بەلێـدانی دە گوللەلەنـاو دەمییـەوە کوشـتووە، کە پاشـان ئەو چـالاکییە بەکـارەکەی (فردان) ناسرا. کە ئەبو یوسف ئەلنجارو کەمال عەدوانی لەگەڵدا بوو.

❖ لە رۆژی ٢ ی مانگی فبـرایەری سـاڵی ١٩٧٧ مەحمود ودلیـد سـاڵح نوێنەری بزافی ئەلفەتحیان لەپاریس کوشتووە.

❖ لە رۆژی ٤ ی فبرایەری ساڵی ١٩٧٨ لەلەندەن (سـەعید حەمـامی) یان کوشتووە کە کە نوێنەری ڕێکخراوەکەیان بووە لەکوێت.

❖ لە رۆژی ١٥ ی مانگی یەنایەری سـاڵی ١٩٧٨ لە کوێـت عەلـی ناسـر یاسین بەڕێوەبەری ڕێکخراوەکەیان لەکوێت کوشتووە.

❖ لە رۆژی ٢٢ ی یەنـایەری سـاڵی ١٩٧٩ عەلـی حەسـەن سـلامەی سەرۆکی دەزگای ئیستخبارارت فەلەستینیان لەبەیروت کوشتووە.

❖ لەرۆژی ٢٥ ی مـانگی یولیـۆی سـاڵی ١٩٧٩ لەفەرەنسـا زوهێـر عەبدولعەزیزی بەرپرسی کۆمەڵەی ساعیقەی فەلەستینیان کوشتووە.

❖ لە رۆژی ١٥ ی مـانگی دیسـمبەری سـاڵی ١٩٧٩ ئیبـراهیم عەبدولعەزیزی بەرپرسی لیژنەی خەلیلی بزافی ئەلفەتحیان لەقوبرس کوشتووە.

❖ لە رۆژی ٢٥ ی مـانگی دیسـمبەری سـاڵی ١٩٧٩ لە قـوبرس رائیـد سـەمیر عـزەت تۆقـانی جێگـری دووەمـی سـەرۆکی بزاڤـی ئەلفەتحـی قوبروسیان کوشتووە.

❖ لە رۆژی ١٠ ی مـانگی یولیـۆی سـاڵی ١٩٨١ نەعـیم خەزیەیـری نوێنەری رێکخراوکەیان لەبەلژیکا کوشتووە.

❖ لە رۆژی ٩ ی مانگی ئۆکتـۆبەری ساڵی ١٩٨١ لە رۆما ماجید ئەبـو شـەرارەی ئەنـدامی لیـژنەی ناوەنـدی بزاڤـی ئەلفەتـح و بەرپرسـی راگەیاندنی یەکگرتوویان کوشتووە.

❖ لە رۆژی ١٧ ی مانگی یونیۆی ساڵی ١٩٨٢ لە رۆما موحەمەد تەها ئەفسەر لەئاسایشی بزاڤی ئەلفەتحیان کوشتووە.

❖ لە رۆژی ١٦ ی مـانگی یولیـۆی سـاڵی ١٩٨٢ لە ئەنـقەرە مەحمـود عیسا قەدومی سەرۆکی گشتی یەکێتی خوێنـدکارانی گشتی فەڵەستینیان کوشتووە.

❖ لە رۆژی ١٧ ی مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩٨٢ لە رۆما کەمال حەسەنی کادری بزاڤی ئەلفەتحیان کوشتووە.

❖ لە رۆژی ٢٢ ی یولیۆی ساڵی ١٩٨٢ لە هەرێمی بقاع لەلوبنـان لیوا سـەعد سـاییل ئەنـدامی لیـژنەی ناوەنـدیو سـەرۆکی ژووری عەملیـات لەرێکخراوەکەیان کوشتووە.

❖ لە رۆژی ١١ ی ئەپریلی ساڵی ١٩٨٣ لە لەشبونەی ئەسپانیا دکتـۆر عسام سەرتاوی ئەندامی لیژنەی ناوەندییان کوشتووە.

❖ لە رۆژی ٢٢ ی مـانگی دیسمبەری سـاڵی ١٩٨٣ لە ئەسـینای یونـان مـوقەددەم مـائمون مریشـی سـەرکردەی بزاڤـی ئەلفەتـح لەگەڵ جەمیـل عەبدولقادری کادری ئەلفەتحیان بەیەکەوە کوشتووە.

❖ لە رۆژی ٢٣ ی مـانگی مـایوی سـاڵی ١٩٨٤ لە نیقۆسـیای قـوبرس حەنا مقبلی ئەمینی یەکێتی نووسەرانو رۆژنالیستانی عەرەبیان کوشتووە.

❖ لەرۆژی ١٥ ی دیسـمبەری سـاڵی ١٩٨٤ لەرۆمـا رائیـد ئیسـماعیلی سەرکردە لەبزاڤی ئەلفەتحیان کوشتووە.

❖ لیسـتەکە دوورودرێـژە تـا دەگـاتە شـێخ ئەحـمەد یاسـینی دامەزرێـنەری بزاڤـی حەمـاسو سـەرکردە رۆحییەکەیـان لە رۆژی ٢٢ ی مانگی مارسی ساڵی ٢٠٠٤ کوشتووە، پاش ئەویش سەرکردەی هەمان بـزاڤ عەبـدولعەزیز ئەلرنتیسـی لەرۆژی ١٧ ی مـانگی ئەپریلـی هەمـان سـاڵ کوشتووە.

ئیبراهام لینکۆڵن لەڕۆژی ١٢ ی مانگی فبرایەری ساڵی ١٨٠٩ لەولایەتی هاردین ئوکنتاکی لەدایکبووە، باوکی تۆماس لینکۆڵن دارفرۆش بووە، بۆ ئەو کاسبییە زۆر گەڕاوەو داری بڕیوەتەوەو ڕاوی کردووە، لینکۆڵن منداڵ بووە کە دایکی دەمرێت، بۆیە باوکی ژنێکی تر دەهێنێتەوە. باوکی حەزی نەدەکرد منداڵەکانی بچنە بەر خوێندن بۆیە بوار بۆ ئیبراهام ساز نەدەبوو بچێتە بەر خوێندن، بەڵام ژنە نوێیەکی سوور دەبێت لەسەر چوونی منداڵەکان بۆ مەکتەب، چونکە ئەو وایدەزانی ئیبراهام دوارۆژێکی پرشنگداری دەبێت. ئەو کوڕە گەنجە بەدرێژیو بەڕەوشتی بەرز بەناوبانگ دەبێت، هەرگیز حەزی لەقومارکردن نەکردووەو جگەرەی نەکێشاوەو هەر کتێبێکی دەست کەوتبووایە دەیخوێندەوە، خوێندەوارێکی بەتارەزوو بووە.

کە پیاوێکی جووتیار داوای لێ دەکات بەبەلەم بەرهەمەکەی لەکێڵگەکەیەوە بەڕووباری ئۆهایۆو ڕووباری مسیسیپی بۆ بگەیەنێتە نیوئۆرلیانز ئەو لەساڵی ١٨٢٨ بوارێکی بۆ ساز دەبێت بچێتە شوێنێکی دوور لەبازنە داخراوەکەی خۆیو شوێنی نوێ ببینێت، ئەو لەوێ لەو شوێنە نوێیەداو لەنیوئۆرلیانز بەچاوی خۆی ئەشکەنجەو کارکردنی ڕەشپێستەکان دەبینێت کە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن، ئەو ئەوە دەبینێت چۆن سپییە گەورەکانیان ئەو ڕەشانە بەزنجیر دەبەستنەوەو کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو کێڵگەکانیانو کارکردنیان دەبەن، لەسەر شەقامەکانو لەسەر دیوارەکان دەبینێت کە چۆن تابلۆی فرۆشتنو کڕینی ڕەشەکان هەڵواسراوەو مامەڵەیان پێدەکەن، ئەو تۆخمە مرۆڤانە چەند بەدڕندەیی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکەن، کە ئەو لەسەفەرەدا

دەگەڕێتەوە هەست دەکات ماندوو بووەو حەز دەکات ئەو جۆرە کارانەو ئەو بازرگانییە بەیەکجاری نەمێنێت. پاش ئەو سەفەرە ئیبراهام زۆر خوو بەکتێبو خوێندنەوە دەگرێت، بەردەوام کتێبی لەدەستدا دەبێت تا لەکاتی کارکردنیش بەردەوام خەریکی خوێندنەوە بووە. کە ئەو کارێک لەدەزگای کارکردنەکاندا کاری نووسینو سازکردنی لیستەکانی دەنگدانی هەڵبژاردنە ناوخۆییەکان پەیدا دەکات، لەوێیەوەو لەو رۆژە لینکۆڵن خەریکی سیاسەت دەبێت، بایەخ بەمەسەلە سیاسییەکان دەدات، بەڵام ئەو شوێنەی ئەو کاری تێدا دەکرد ئیفلاس دەکات بۆیە ئیبراهام لینکۆڵن بێکار دەمێنێتەوە.

## لەنێوان سیاسەتو یاسادا

لە ساڵی ١٨٣٢ لینکۆڵن بۆ ئەنجوومەنی ئالینوی خۆی کاندید دەکات، بەڵام ئەو لەهەڵبژاردنەکەدا دەرناچێت، بۆیە بەبەشداری کەسێکی تر شوێنێکی بازرگانی دەکاتەوە، لەبەر کارەکانی شەریکەکەی لەو کارەش قازانج ناکات، بۆیە لینکۆڵن دەبێتە نمایندەی نووسینگەی پۆست، پێش ئەوەی رۆژنامەکان دابەش بکات ئەو خۆی رۆژنامەکانی دەخوێندەوە، لەوێیەوە کاری رووپێوی دەکاتو لەرووکاری زەوی کاردەکات، لەمانگی نۆڤمبەری ساڵی ١٨٣٤ دووبارە خۆی بۆ ئەنجوومەنەکە کاندید دەکاتەوە، ئەوجارەیان لەهەڵبژاردنەکەدا دەردەچێت. ئەو لەو ماوەیەدا یاسا دەخوێنێتو لەساڵی ١٨٣٧ لەگەڵ (جۆن ستیوارت) نووسینگەکەیەک

دەکاتەوەو تا مانگی ئەپریل ١٨٤١ کار بەیەکەوە دەکەن، بەڵام لەساڵی ١٨٤٢ کەسێکی تر دەکاتە هاوپشکی خۆی.

لەساڵی ١٨٣٨ دووبارە لینکۆڵن بۆ ئەندامیەتی ئەنجومەنی یاسادانانی ولایەتی ئالینوی دەردەچێتەوەو لەساڵی ١٨٤٠ بۆ جاری سێیەمیش لەو هەڵبژاردنەدا دەردەچێتەوە.

ئەو لەگەڵ کیژی بنەماڵەیەکی ئورستوکراتی پەیوەندی دەکاتو پرۆسەی هاوسەرگیری دەکات، هەر لەبەر ئەوەش بوو خۆی بۆ کۆنگرێس کاندید دەکات، لە رۆژی ٢ ی مانگی ئۆگستی ساڵی ١٨٤٦ دەبێتە ئەندامی کۆنگرێس. لەو دەمانەدا لەبەر ئەوەی نیشتەجێکراوانی ئەمریکا بۆ دلگیر کردنی چەند پارچە زەوییەکی نوێ هێرش دەبەنە سەر مەکسیک، شەڕی نێوان ولایەتە ئەمریکییەکانو مەکسیک هەڵدەگیرسێت، لینکۆڵن بەتوندی ئەو پەلاماردانە شەرمەزار دەکاتو بەهیچ جۆرێ پشتیوانی لەو ئاژاوەیە ناکات.

## لینکۆڵنو کۆیلەکان

بازرگانی کۆیلەکان بەگەرمی دەچێتە ناو بیری ئیبراهام لینکۆڵن ، لەخولی دووەمی ئەنجومەنی کۆنگرێس پرۆژەی یاسای هەڵوەشاندنەوەی بازرگانی کۆیلەکانی لە ولایەتی کۆلۆمبیا دەخاتە بەردەم کۆنگرێس، دیمەنی کۆتکردنی ئەو کۆیلانە بەزنجیرو بردنیان بۆ کێڵگەکانی کارکردنو رۆیشتنیان بەناو شەقامەکانی واشنتۆن بەشەرمەزارییەکی

گەورە دەزانێت، چونکە ئەو وادەزانێت ئەوانەش مرۆڤن بۆچی بەو شێوەیە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکرێت، ئەو لە پرۆژە یاساییەکەیدا داوا دەکات حکومەتی ولایەتی ئەمریکا قەرەبوویان بکاتەوەو لە دەستی خاوەنەکانیان رزگاریان بکەن.

* * *

لە پاش دامەزراندنی یەکێتی فیدراڵی ئەمریکی لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەمەوە ئەمریکا بەرەو پیشەسازیی هەنگاوی دەنا، بۆیەش ئەمریکا زۆرتر کاریان بە کشتوکاڵ بە پلەی یەکەم نامێنێتو ئەوەش وا دەکات کرێکارو کاری دەستیان وەک جاران مەبەست نەبێت، بەڵام نیشتەجێکراوە ئەوروپییەکان زۆرتر دەستی کاریان پێویست دەبوو، ئەوەشیان بەو کۆیلە رەشانە بۆ مەیسەر دەبوو، کە بازرگانی ئەو کرێکارە رەشانەش نەمێنێت ئەوا ئەوان زەرەرمەند دەبن، چونکە لە دەستووری ئەمریکی ساڵی ١٧٧٥ دا بازرگانی کۆیلەکان بەیاسا مەشروع بووە، هەروەها لەساڵی ١٨٥٠ یاسای کۆیلەی هەڵاتووش دەردەچێت کە هەر کۆیلەیەک را بکات، خاوەنەکەی مافی هەیە سۆراخی بکاتو بیدۆزێتەوەو بیگێڕێتەوە جا ئەگەر کەسە کۆیلەکە چووبێتە ولایەتێکی تری ئەمریکاش کە تێیدا بازرگانی کۆیلەی تێدا قەدەغە بێت.

ژمارەی کۆیلەکانی ناو هەموو ولایەتە ئەمریکییەکان دەگەیشتە چوار ملیۆن کەس، وەک مێگەل دەکڕانو دەفرۆشران، ئەو ولایەتانەی ئەو بازرگانییەیان بەرەوا دەبینیو کاریان پێدەکردو دەیانویست ئەو

سیستەمە لەسەر ولایەتە ئازادەکانیش پەیڕەو بکەن. لەودەمانەدا دوو ڕەوتی بیرکردنەوەو دیتن لەسەر ئەو مەسەلەیە دژ بەیەکە هەبوون، یەکەمیان داوای دەکرد ئەو بازرگانییە بەیەکجاری قەدەغەو حەرام بکرێت، ڕەوتی دووەمیش داواکاربوون ئەو کارە زۆر سەربەستانە بمێنێتو کاری پێ بکرێت، کەوتە ولایەتەکانی باکوور بازرگانی کۆیلەیان بەکارێکی زۆر شەرمەزارانە دەزانی، ولایەتەکانی باشووریش ئەوەیان بە ئاسایی دەبینی، لایان باش بوو یاساکە هەر وەک خۆی بمێنێتەوە.

لەساڵی ١٨٥٤ بۆ چارەسەرکردنی دۆسیەی کۆیلەکان ئەو دەگەڕێتەوە سەر یاسا، لەوێیدا داوا دەکاتو دەڵێت ناکرێ میللەتی ئەمریکی لەو مەسەلەیە دوو بۆچوونی جیاوازی هەبێت، نیوەیان داوا بکات کۆیلەکان ئازاد بکرێنو نیوەکەی تریش دژایەتی ئەو بۆچوونە بکات، لەودەمانەشدا حزبی ئازادەکان بەرەو هەڵوەشانەوەو لەناوچوون دەچوو، بۆیەش دەبوایە لەسەر پاشماوەو لەناو کۆنە هەوادارەکانییدا حزبێکی نوێ دروست بکرێت کە بتوانێت ڕکابەرایەتی حزبی دیموکراسی بکات کە تازە (ستیڤن دوگلاس) یان بەسەرۆکی حزبەکە هەڵبژاردبوو، بۆیە حزبە نوێیەکە هاتە دامەزراندنو ناویان ناو حزبی کۆماریی.

لەڕۆژی ١٧ ی مانگی یونیۆی ساڵی ١٨٥٦ لەولایەتی فیلادیڤیا کۆنگرەی دامەزراندنی یەکەمی حزبی کۆماری لەسەر ئاستی یەکێتی فیدراڵی دەبەسترێت، تێدا هاوڕێیەکانی لینکۆڵن دەخوازن ئەو پۆستی جێگری سەرۆکی بەربکەوێت، بەڵام ئەو لەگەڵ بەرامبەرەکەی دەدۆڕێنێت کاندیدەکەی تر دەنگی زۆرتر دەبێت بۆ ئەو پۆستە.

لەکۆبوونەوەی حزبی کۆمارییدا بڕیارێک وەردەگیرێت کە

دەسەڵاتدارانی کۆنگرێس‌و یان دەسەڵاتدارانی ئەنجوومەنەکانی یاسادانان لەولایەتە یەکگرتووەکان ناکرێ دەسەڵاتی ڕەهایان لەسەر مەسەلەکانی کۆیلەدا لەهیچ لەولایەتەکانی یەکێتییەکەدا هەبێت، ئەگەرچی دەستوور دەسەڵاتی دابووە کۆنگرێس بۆ حکومی ڕەهای هەموو مەسەلەکان لەسەر خاکی یەکێتییەکەدا، هەروەها دەسەڵاتی ئەوەشیان هەبوو کە بازرگانی بەکۆیلەکان لەسەر ئەو خاکەدا بکەن، چونکە ئەوانە پاشماوەی بەربەرییەتی کۆنن.

لەپرۆسەی هەڵبژاردنی ساڵی ١٨٥٦ لینکۆڵن کۆششی زۆری کرد تا کاندیدی حزبەکەیان حزبی کۆماری پۆستی سەرۆکی کۆماری بباتەوە، لەکاتی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنەکاندا وتاری جوانی دژ بە بازرگانی کۆیلەکان لە ئەمریکا پێشکەش کردبوو، بەڵام دەرئەنجام بردنەوەکە دەبێتە بەختی حزبی دیموکراسی، چونکە ئەو ولایەتانەی دژی ئازادکردنی کۆیلەکان بوو دەنگیان بە حزبەکەی لینکۆڵن نەدابوو، کە ژمارەیان زۆرتربوو، ئەو ولایەتانەی لەگەڵ ئازادکردنی کۆیلەکان بوون کە ژمارەیان تەنها پێنج ولایەتە بووەو بازرگانی کۆیلەی تێدا نەبوو، بۆیە کۆمارییەکان کۆی دەنگەکانیان ١١٤ بوو، بەرامبەر ١٧٤ بۆ بەرژەوەندی دیموکراسییەکان. لەو ڕۆژەوە هەموولایەک لینکۆڵن یان دەناسن، ئەو دەبێتە ئەو پیاوەی داکۆکی لە مافی کۆیلەکان دەکات، ئەوانەی خۆشیان دەویست ژمارەیان زۆرتر بوو لەوانەی دژایەتیان دەکرد، بۆیەش لە ولایەتەکانی باکوور بۆ پێشکەشکردنی وتارەکانی داوەتیان دەکرد.

# لینکۆڵنی سەرۆک

لە زستانی ساڵی ١٨٥٩ دا لینکۆڵن لەسەر چەندین سەکۆدا وتاری پێشکەش دەکرد، لەساڵی ١٨٦٠ داوەت دەکرێت لە گەورەترین کۆبوونەوەی رووناکبیرانو نووسەرانو رۆشنبیران لە نیۆیۆرک وتارێک پێشکەش بکات، وتارەکەی ئەو بۆ ئەو دەستە هەڵبژێردراوە رۆشنبیرە دەبێتەوە جێگای پرسیارو رامان، گۆڕانێکی مەزنی لەسەر مەسەلەکان دەکاتو چەندین برگەی قسەکانی ئەو لە رۆژنامەکان بڵاودەکرێنەوەو ئاماژەی پێدەکرێتو بەنرخەوە باسیان لێوە دەکرا، بۆیەش حزبی کۆماری وتارەکەی ئەوەی وەک بەڵگەیەکی حزبی دەناسێتو بەشانازییەوە پەسەندی دەکات، لەو رۆژەوە ئیبراهام لینکۆڵن وەک سیاسەتمەدارێکی بەرێزو بەهرەمەند سەیری دەکرێتو لەو خانەدا پۆلین دەکرێت.

لە رۆژی ١٩ ی مانگی مایوی ساڵی ١٨٦٠ کۆمارییەکان لە ولایەتی ئالینوی کۆنگرەی ناوچەیی ساڵانەی خۆیان بەستا، لەوێ بەرێزێکی گەورەو میهرەبانییەوە پێشوازییان لە لینکۆڵن کردبوو، لەوێ چەند کەسێکی ئامادەبووی کۆنگرەکە داوایان کردبوو کە لینکۆڵن لەهەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆماری داهاتووی ساڵی ١٨٦٠ ببێتە کاندیدی حزبەکەیان. لەرۆژی ١٧ ی مانگی یونیۆی ساڵی ١٨٦٠ کۆنگرەی حزبی کۆماری لە شیکاغۆ بەسترا بۆ دەستنیشانکردنی کاندیدی حزبەکەیان بۆ پۆستی سەرۆکایەتی ولایەتە یەکگرتووەکان، پاش سێ جار دەنگدان لینکۆڵن زۆرینەی دەنگەکان بەدەست دەهێنێت، لەو کاتەوە دەکەوێتە ناو بازنەو

ململانێی نــارەوای دیموکراســییەکان، کە بەناونــاوی (خۆشەویســتی ڕەشپێستەکان) ناویان دەبرد، یان پێیــان دەوت کۆمارییە ڕەشــەکە، بەڵام هەمــوو کۆشــش‌و بەرنامەکــانی حزبــی دیموکراســی لەو هەڵـمەتەدا ســەر ناگرێتــو هەرەس دەهێنێتو هەڵبژاردنەکە ئەنجام دەدرێتــو لەڕۆژی ٦ ی مــانگی نــۆڤەمبەری ســاڵی ١٨٦٠ ئەنجامەکــانی بەبــردنەوەی پۆســتی سەرۆکایەتی ولایەتە یەکگرتووەکان بۆ کاندیدی حزبی کۆماری ئیبراهام لینکــۆڵن رادەگەیەنــدرێت، بەوەش لینکــۆڵن دەبێــتە ســەرۆکی ئەمریکی ژمارە شازدەمین لە لیستی سەرۆکەکانی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

## شەڕی ناوخۆ

کە ســەرکەوتنی لینکــۆڵن بــۆ پۆســتی ســەرۆکایەتی رادەگەیەنــدرێت بزاڤی جوداخوازەکان کە لەولایەتی کارولینا رێبەرایەتــی دەکــرا لەرۆژی ١٧ ی مــانگی نــۆڤەمبەری ســاڵی ١٨٦٠ دەرچــوونی خۆیــان لەیەکێتــی فیــدراڵی رادەگەیەنن، حاکمی ئەو ولایەتە راگەیاندنی وڵاتێکی سەربەخۆی خــاوەن ســـــەروەری رادەگەیەنێـــــت، بەو بــــۆنەیەش هاوڵاتیــــانی ئەو ولایەتە ئــاهەنگێکی جەمــاوەری گەورە ســاز دەکەن، لەو ئــاهەنگەدا هاوڵاتیــان ســووکایەتیش بەئــاڵای فیــدراڵیەتیش دەکەن‌و ئــاڵاکە دەخەنە ژێــر پێــی خۆیانەوە، کە هەواڵی سەربەخۆیی ئەو ولایەتە رادەگەیەندرێت، ولایەتی مسیسبی لەرۆژی ٩ ی مانگی یەنایەری ساڵی ١٨٦١ ئەوانــیش ســەربەخۆیی خۆیــان رادەگەیەنــن، رۆژی دواتــر ولایەتــی ئالاباماو لەرۆژی ١٠ ی مــانگی

پەنـایەری هەمـان سـاڵیش ولایەتـی جۆرجیـاو پاشـان ولایەتـی تکسـاس لەرۆژی ۱ ی مـانگی فبـرایەر سـەربەخۆیی رادەگەیەنـنو لەیەکێتـی فیدراڵیەتیەکە دەردەچن.

پـێش ئەوەی لینکـۆڵن پۆسـتە رەسمییەکەی وەربگرێـت (لەو رۆژانە سەرۆکی نوێ ولایەتە یەکگرتووەکان لەرۆژی ٤ ی مانگی مارس پۆستەکەی وەردەگـرت، بەلام دوایـی رۆژەکەیـان گـۆڕی بەرۆژی ۲۰ ی یەنـایەر) حەوت ولایەتـی ئەمریکـی لەدژی دەرچـوونی ئیبراهـام لینکـۆڵن لەهەڵبژاردنـی سەرۆکایەتی جیابوونەوەی خۆیان لەیەکێتی فیدراڵی راگەیانـد، نـوێنەری ئەو ولایەتـانە لەرۆژی ٤ ی مـانگی فبـرایەری سـاڵی ۱۸٦۱ لەشـاری مۆنتیگۆمری پایتەختی ولایەتی ئالاباما کۆدەبنەوە، لەوێـدا یەکێتییەک لەنێـو خۆیانـدا رادەگەیەنـن، هەر لەو کۆبـوونەوەیەدا دەسـتورێکو سـەرۆکێکی کـاتی بـۆ خۆیـان دەستنیشـان دەکەن، لەودەمـانە هێشـتا لینکـۆڵن کە سـایەتییەکی ئاسـایی ئەمریکـی بـوو بەس، ئەو چـاوەڕوانی رۆژی وەرگرتنی پۆستەکەی دەکرد لەرۆژی ٤ ی مانگی مارسدا.

لەرۆژی ۱۱ ی مـانگی فبـرایەر لینکـۆڵنو بنەمـاڵەکەی لەشـاری سـبرنگیلدەوە بەشـەمەندەفەر دەگـوازنەوە واشـنتۆن، کە بەسـەفەرێکی ترسناک دەزانرا، چونکە مەترسی کوشتنی زۆر هەبوو، مەترسییەکی زۆر لەسەر گیـانی هەبـوو، ئەو لەرۆژی ۲۳ ی مانگی فبـرایەر لەگەڵ پاسـەوانی زۆر تونـدەوە لە واشـنتۆنی پایتەخـت دادەبەزێـت، ئەودەمـانە واشـنتۆن بەخـوارووە بەسـترا بـووە، دەسـەلاتیش لەبـن دەسـتی سـەرمایەدارەکانی خوارووو کۆیلەدارەکان بوو، رای گشتیش لەگەڵ کۆمارییەکاندا نەبوو.

لەرۆژی دیاریکراودا ئیبراهام لینکۆڵن سوێندی یاسایی سەرۆکایەتی

لەپێش قازییەکاندا دەخوات، لەوێش وتاری تایبەتی خۆی پێشکەش دەکات تێدا داوا دەکات هاولاتیانی ولایەتە جیابووەکان دەستبەرداری سەرۆکەکان بن و بگەڕێنەوە ژێر ولایەتی ئەو، چونکە هیچ ولایەتێک حەقی نییە لەیەکێتی فیدرالی جیاببێتەوە ئەگەر ڕەزامەندی ولایەتەکانی تری نەبێت، سەرکردەکانی ئەو ولایەتانە ئەو وتارو داوایەی لینکۆلنیان بەگاڵتەو بەبێ بایەخ وەردەگرن، لەولاشەوە ولایەتەکانی باکوور قسەکانی ئەویان پێ دروست بوو. لەودەمانەدا سەرکردەکانی باشوور شەڕ دژ بەرەوشە نوێیەکە رادەگەیەنن، بەئاشکرا وتیان بەهیچ مەرجو بەرنامەیەک حکومەتەکەی باکوور بەحکومەتی خۆمان نازانین، بۆیەش دەستیان بەئیستفزازکردنی لینکۆڵن دەکردو شەڕ بەرووی ئەودا رادەگەیەنن. بەڵام ئەو زۆر بەهێمنی مەسەلەکە وەردەگرێتو چاوەڕوانی شەڕەکەش دەکات، لەودەمانەشدا رۆژنامەکانی خواروو بەتوندی داوایان دەکرد سەرکردەکانی باکوور بگرنو، توندترین سزایان بەسەردا بچەسپێنن.

یەکەم گوللەی باشوورییەکان دژ بەحکومەتو ولایەتەکانی باکوور لەرۆژی ١٢ ی ئەپریل دەتەقێندرێت، پاش دوو رۆژ لینکۆڵن داوا دەکات کۆنگرێس لەرۆژی ١٥ ی مانگی ئەپریل کۆببێتەوە، لەوێ ڕەزامەندی وەردەگیرێت کە سوپایەک بەقەوارەی ٧٥ هەزار سەرباز دژ بەباشوورییەکان ساز بکرێت، ولایەتەکانی باکوور داواکەی سەرۆک زۆر بەخۆشیو بەدڵسۆزییەوە وەردەگرن، لەماوەی یەک هەفتەدا ولایەتەکانی باکوور ٥٠٠ هەزار سەرباز ساز دەکەن، دەزگا دارایییەکان پێشبڕکێ دەکەن بۆ وەرگرتنی قەرز لەخەزێنەی یەکێتییدا، دەوڵەمەندەکانیش پارە

دەبەخشن بەو خێزانانەی كوڕەكانیان لەشەڕەكاندا بەشدار دەبن.

لەرۆژی ٣ ی مانگی مایۆ سەرۆك داوای هێزی زۆرتری پیادەو دەریاوانی دەكات. ئەو لە هەمـوو وتارەكانیـدا دەیگـوت، ئـێمە بـۆ خۆپاراسـتن لە باشووریەكان هێزمان بەكارهێنـاوە، ئەوان دەسـتیان بەشـەڕەكە كـردووە. ولایەتـی فرجینیـا مەیـدانی سـەرەكی شـەڕە گەورەكـان بـوو، ئەودەمـانە سەرژمێری ولایەتەكانی باشوور دەگەیشتە نـۆ ملیـۆن كەس، هەمووولایەك وایانـدەزانی شـەڕەكە تەنهـا سـێ مانـگ دەخایەنێـتو باشـووریەكان دەشكێنو باكووریەكان بەئاسانی شـەڕەكە دەبەنەوە. یەكەم شـەڕ لەرۆژی ١٩ ی مـانگی یولیـۆی سـاڵی ١٨٦١ دەسـتپێدەكات، لەو شـەڕەدا هێزەكـانی لینكـۆڵن شـكانێكی گەورەیـان بەسـەردا دێـت، تـا رادەیەك واشـنتۆنی پایتەخـت دەكەوێـتە مەترسـییەوە، لەودەمـانەدا كـۆنگرێس لەكـاتی كۆبـوونەوەدا دەبێـت، بـۆیە رەزامەنـدی لەسـەر داواكەی سـەرۆك وەردەگیرێـت بـۆ سـازكردنی پـارەو سـەربازی زۆر بـۆ شـەڕەكەو بڕیـاریش وەردەگیرێـت بـۆ تەرخـانكردنی پێـنج سـەد ملیـۆن دۆلارو، سـازكردنی سوپایەك بەقەبارەی نیو ملیۆن كەس، هەر لەو كۆبوونەوەیەدا كـۆنگرێس بڕیاردەدات سامانی جوداخوازەكانو كۆیلەكـانیش حیجـز بكرێـت. هەردوو وڵاتی ئینگلتراو فەرەنسا بەردەسمی دانیان بەسەروەری باشـووریەكان وەك وڵاتێكـی سـەربەخۆ دانـابوو، بـۆیەش هاوڵاتیـانی ئەمریكـی لەباكوور داوا لەسـەرۆك دەكەن دژ بەو بڕیـارە هەڵوێسـت وەرگرێـت، بەڵام ئەو داوای لەخەڵـكە تووڕەكـان كردبـوو بـا هەڵوێسـتەكەم دوا بكەوێـت بـۆ كـاتێكی گونجاو.

بەپێـی یاسـا چەكهەڵگـرتن بـۆ رەشپێسـتەكان قەدەغەبـوو،

سپییێستەکان بواریان نەدەدا رەشەکان بەشداری سوپای ئەمریکی بکەن، بەڵام لینکۆڵن رای وابوو ئەگەر بوار بەرەشەکان بدرێت بێنە ناو ریزەکانی سوپای ئەمریکی، ئەوا بەدڵسۆزی شەڕ بۆ سەروەری ئەمریکا دەکەن، ئەوەش بەئازادکردنیان دەبێت، بۆیە سەرۆک بڕیار دەدات یاساییەک دەربچێت تێدا رەشەکان مافی ئەوەیان هەبێت بەشداری لەهێزەکانی چەکداری بکەن، ئەوەش یەکەمین ماف بوو کە رەشەکانی ئەمریکا دەستیان دەکەوێت. لەوەدەمانەدا سەرۆک کوڕێکی تری دەمرێت، لەسێ منداڵەکانیشی تەنها کوڕێکی دەمێنێتەوە، بۆیەش هاوسەرەکەی تووشی هستیریایەک دەبێت، لەولاشەوە ژمارەیەک لە ژەنەراڵەکانی سوپاکە مان دەگرن‌و یاخی دەبن، سەرۆکیش بۆ ئازادکردنی رەشەکان‌و یەکسانی هاوڵاتیانی ئەمریکا چەرمەسەریی‌و نارەحەتی زۆری دێتە پێش. لە سەرەتای مانگی سپتەمبەری ساڵی ١٨٦٢ هێزەکانی ئەمریکی لەچەند بەرەییەک سەرکەوتن بەدەست دەهێنن، لەرۆژی ٢٢ی هەمان مانگدا بەیانێکی مێژوویی دەردەچێت کە لە سەرەتای یەنایەری ساڵی ١٨٦٣ەوە، بێتە واری جێبەجێکردنەوە، کە تێدا بڕیار دەدرێت کۆیلەکان ئازاد بکرێت، بەتایبەتی ئەو خاوەندارانەی دژ بەحکومەتی فیدراڵی دەوەستن، بەبێ ئەوەی هیچ قەرەبوو بکرێنەوە، ئەو بڕیارەش هاوڵاتیانی ولایەتەکانی باکووری ئەدەگرتەوە، ئەوەک کاردانەوەی ناشایستەی لێ بکەوێتەوە، لینکۆڵنیش دەیووت:

ئەگەر من بتوانم یەکێتییەکەمان رزگار بکەین‌و لەو رۆژگارەدا بەبێ ئازادکردنی کۆیلەکان دەربازمان بێت ئەوە دەکەم، ئەگەر بشتوانم یەکێتییەکەمان بەئازادکردنی کۆیلەکانەوە رزگار بکەم ئەوەش دەکەم،

هەروەها ئەگەر بتوانم یەكێتییەكەمان بپارێزمو ژمارەیەك كۆیلەش رزگار بكەمو ژمارەیەكیش وەك خۆیان بمێننەوە، ئەوەش دەكەم.

كە شەڕەكە گەرم دەبێت هێزەكانی لینكۆڵن لەبەرەكانـدا دەشـكێن، بۆیەش ئەندامانی حكومەتەكەی لەو شكانەدا نیگەران دەبن، بەتایبەتی ئەوانەی دژی شـەڕەكە بـوون، زۆر لەكۆنگرێسـمانەكان بەرووی سـەرۆك هەڵدەستنەوەو داوا دەكەن لەگەڵ باكوورییە جیاخوازەكان ئاشت ببنەوە، پرۆژەیەكی ئاشتی بێتە ئاراوە، لەودەمانەش واشنتۆن دەكەوێتە ژێربـاری شكانو بەتوندی گەمارۆ دەدرێت، زۆری نامێنێت پایتەخت بكەوێتە ژێـر كـۆنترۆڵی یـاخیبووە باشـوورییەكان. لەرۆژی یەكەمـی مـانگی یەنـایەری سـاڵی ١٨٦٢ بەیـانە مێـژووییەكە دەكەوێـتە واری جێبەجێكـردنەوە، حكومەت سامانی جیاخوازەكان حیجز دەكات، ئەوانەی تـاكی كۆیلەیـان بەچـاوی كـاڵا سـەیر دەكـرد، كە بەبـارمتەو خاوەنـداریەتی لەپـاڵ ئەو دەوڵەمەنـدانە دابـوون، بەوەش لە حكومەتەكـانی دەرەوە دەستخۆشـیو پیرۆزبایی لەسەرۆك لینكۆڵن دەكرا.

## درامای سەركەوتنو كوشتنەكەی

لینكۆڵن مافە دەستوورییەكانی دەخاتە بـواری جێبەجێكردنەوە، بـۆیەش حـاڵەتی ئامادەباشـی دەكـاتو ئەحكـامی عـورفی رادەگەیەنێـت، داواش دەكـات خزمەتـی سـەربازییش بكـاتە ئیجبـاریو بەمەرجێـك رەشپێستەكانیش بگرێتەوە، ئەگەرچی خەڵكێكی زۆریش وایاندەزانی كە

شەرمەزارییە رەشپێستەکان جلی پیرۆزی سەربازی بپۆشن، بەڵام مەسەلەکە سەر دەگرێتو ژمارەی سەربازە رەشەکانی کە گەیشتبوونە بەرەکانی جەنگ دەگاتە ١٧٩ هەزار کەس، هەر بۆ پشتیوانی شەڕەکە وەزیری خەزێنە لەلایەن کۆنگرێسەوە رەزامەندی وەردەگرێت بۆ سەرفکردنی قەرزێک بە٩٠٠ هەزار میلۆن دۆلار.

لەمانگی یولیۆی ساڵی ١٨٦٣دا رەوشی سەرۆک بەرەو باشی دەچوو، مەسەلەکان بەرەو قازانجی ئەو دەشکایەوە، هێزەکان لەزۆر بەرەدا بەسەر شۆڕشگێرە یاخییەکان سەردەکەوتن، ئەوەش لەولایەتەکانی باکوور دەنگ دەداتەوەو کەسایەتیو ناوداری ئەو گەشدار دەبێت، بۆیەش کۆنگرەی حزبی کۆماری لەبالتیمور بۆ جاری دووەم لینکۆڵن دەکاتەوە کاندیدی سەرۆکایەتی ئەمریکا، لەمانگی نۆڤمبەری ساڵی ١٨٦٤دا ئیبراهام لینکۆڵن دووبارە وەک سەرۆکی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەنێوان پشتیوانیو نارەزاییەکی توندەوە هەڵدەبژێردرێتەوە، لەرۆژی ٣١ ی مانگی یەنایەری ساڵی ١٨٦٥دا ئەنجوومەنی نوێنەرەکان لە واشنتۆن رازی دەبن سێیەم جار دەستووری ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەموار بکرێت، کە تێدا بازرگانیکردنی بەتاکی کۆیلە قەدەغەو حەرام دەکرێت، ئەوەش بەبێ هیچ نارەزاییەک پەسند دەکرێت.

لە سەرەتای ساڵی ١٨٦٥ دا دانوستان لە نێوان جیاخوازەکانو حکومەتی شەرعی دەستپێدەکات، لینکۆڵن لەو دانوستانەدا بەتوندی جەخت لەسەر ئەو مەسەلانە دەکات وەک:

گەڕانەوەی ولایەتەکان بۆ ناو بازنەی یەکێتییە فیدراڵییەکەو قەدەغەکردنی بازرگانیکردن بە کۆیلەکان، بەڵام باشوورییەکان مەرجی

یەکەمیان قبووڵ دەبێتو لەسەر مەسەلەی دووەمیش نارازی دەبن‌و بەتوندیش ئەو مەرجەیان رەفز کردووە. بۆیەش شەڕەکە دووبارە هەڵدەگیرسێتەوە.

لە سەرەتای ئەو ساڵەدا سوپای باشوورییەکان دەشکێن، هێزەکانی فیدراڵی بەسەرۆکایەتی ئیبراهام لینکۆڵن گەمارۆیەکی دەریایی دەخەنە سەر ولایەتە جیاخوازەکان‌و برسیەتی هەڕەشە لە هاوڵاتییەکانی دەکات، بۆیەش ناچار دەبن بۆ رێکەوتنی ئاشتبوونەوە دابنیشن، بەڵام لینکۆڵن ئەوجارە لەو دانیشتنەدا مەرجی پێشینەی دەبێت، ئەگەرنا دانوستان ناکات، لەودەمانەدا سەرۆکی یەکێتی باشوورییەکان (دیفر جیفرسۆن) کە دەزانێت هەموو شتەکان لە بەرژەوەندی ئەواندا نییەو سەرکەوتنیان ئەستەم بووە، بۆیە لە رۆژی ٤ی مانگی ئەپریلی ساڵی ١٨٦٥ خۆی لەو ئاژاوەیە دەرباز دەکاتو بڕیاری راکردن دەدات، بەڵام لە ژێر پاسەوانی‌و سوپای دەسەڵاتدارانی فیدراڵییەت دەربازی نابێتو دەگیرێتو دەکەوێتە زیندانەوە. لە بەیانی رۆژی ٤ی ئەپریلی ساڵی ١٨٦٥دا لینکۆڵن بەسەرکردایەتی سوپاییەکەوە دەگاتە شاری ریشمۆندی پایتەختی جیاخوازەکان، میللەتەکەش وەک سەرکردەیەکی سەرکەوتووو مەزن پێشوازی دەکەن، رەشپێستەکانیش لەخۆشیان دەگریان، بۆ ماچکردنی پێیەکانی ئەو بۆی دەچەمانەوە، ئەویش لەخۆشییەکانی سەرکەوتنەکەو گەیشتن بەئامانجەکانی فرمێسکی شادمانی دەباراند.

لەرۆژی ٩ی مانگی ئەپریلی ساڵی ١٨٦٥دا ژەنەراڵ لی سەرکردەی هێزە جیاخوازەکان، بەرەسمی تەسلیم دەبێت، ولایەتە جیابووەکان بەفەرمی دەگەڕێنەوە ژێر رکێفی فیدراڵییەت، لینکۆڵن یش لەودەمانە

دەچێتە سەر سەکۆی کۆشکی سپی تا پێشوازی ئەو هەزارەها کەسە بکات کە بۆ پیرۆزباییەکان هاتبوونە بەردەم کۆشکەکە، لەشەوی ١٢ی مانگی ئەپریلی ساڵی ١٨٦٥دا واشنتۆن لەناو ڕووناکییەکانی ئاهەنگەکەدا دەبێتە چراخان، بەفەرمیش ئاهەنگەکانی سەرکەوتن دەگێڕن. لەڕۆژی ١٤ ی مانگی ئەپریلدا لینکۆڵن سەرپەرشتی کۆبوونەوەی حکومەتەکەی دەکات، لەودەمانەدا بیری دەڕوات، بە خەیاڵ دەبینێت کە مەراسیمی بەڕێکردنی تەرمی سەرۆک بەڕێوە دەچێت، لەوێیدا هەموولایەک دەڵێن ئەوا سەرۆکمان مردووە، وا بەرەو گۆڕستان بەڕێیدەکەین. هەر لەو ڕۆژەدا لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لەباخچەکانی واشنتۆن پیاسەی دەکرد، ئەگەرچی قسە لەسەر مەترسییەکانی ژیانیشی دەکرا، بەڵام بەبیری کەسدا نەدەهات کەس دەستدرێژی بکاتە سەر ئەو سەرکردەیەی زۆر ئامانجی گەورەی مرۆڤایەتیو نیشتیمانی مەزنی بۆ میللەتەکەی جێبەجێ کردووە. ئێوارەیەکیان لەگەڵ هاوسەرەکەی دەچێتە شانۆی فۆرد بۆ سەیرکردنی نمایشێکی شانۆیی، لەپاش سەعات دە ئەموو هاوسەرەکەی دەگەنە شوێنی تایبەتیی ناو ساڵۆنەکەو، لەوێ کەسێک کە دەمانچەیەکی شاراوەی پێ دەبێت، لە پاسەوانەکەی نزیک دەبێتەوەو دەڵێت تکایە دەمەوێ لەسەرۆک نزیک ببمەوە، کارێکی تایبەتی گرنگم بە سەرۆک هەیە، دیارە کە پاسەوانەکە بوار دەدات کابرای نیازخراپ لەو نزیک ببێتەوە، ئەو دەچێتە ناو لۆژەکەو دەرگاکە نەرم دادەخات، دەمانچە شاراوەکەی ژێر پاڵتۆیەکەی دەردەهێنێتو گوللەیەک لەکەللەی سەری گیر دەکاتو لەناو ساڵۆنەکە دەردەپەڕێت، لەوێ دەچێتەوە سەر پشتی ئەسپەکەی کە لە دەرەوەی ساڵۆنەکەی زووتر بۆ دەربازبوون سازیکردبوو، بەڵام

دەستنەدانەکەی زۆر ناخایەنێتو دەگیرێت، ئەویش دان بەوەدا دەنێت کە ئەو لەلایەن پاشماوەکانی جیاخوازەکانی باشوور بەکرێگیراوە.

دکتۆرەکان کۆششی زۆر دەکەن گیانی سەرۆک رزگار بکەن، بەڵام ئەو لەسەعات دوو چارەگی پاش نیوەشەوی رۆژی ١٥ ی ئەپریلی ساڵی ١٨٦٥ دەمرێت، تەرمەکەی دەبەنە کۆشکی سپیو لەوێ سێ رۆژی دەمێنێتەوە، لەرۆژی ١٩ ی ئەپریلـــی ســـاڵی ١٨٦٥دا بەشـــەمەندەفەر تەرمەکە دەگەیەندرێتەوە زێدی خۆی، کە پێنج ساڵ زووتر لەوێیەوە بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی ئەمریکا دەگاتە واشنتۆنی پایتەخت. لینکۆڵن لە مێژووی مرۆڤایەتییدا جێگای دیاربوو، ئەو یەکێک بوو لە گەورە پیاوانی مێژوو و یەکێک بووە لە سەرۆکە مەزنەکانی ئەمریکا، ئەمریکییەکان بۆ پیرۆزییو شکۆیی ئەو پەیکەرێکی یادەوەری بۆ ساز دەکەن، کە بریتی بوو لە٣٦ ئەســـتوونی مەرمەر، ئەوەش هێمـــایە بـــۆ ژمـــارەی ولایەتە یەکگرتووەکانی فیدراڵ، ساڵانەش ملیۆنەها کەس بۆ یادەوەریو بەرز راگرتنی ئەو سەردانی ئەم مەزارە دەکەن.

لە پاش جەنگی دووەمی جیهانیدا ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەت دەبنە دوو جەمسەرو دوو هێزی گەورەی جیهانو جڵەوی سەرکردایەتیان دەگرنە دەست، ئەوەش پاش ئەوە هات کە ئەستێرەی پرشنگداری فەرەنساو ئینگلتەرا لەبەرێوەبردنو دەسەڵاتیان بەسەر ژمارەیەکی زۆری ناوچەی جیهان بە تایبەتی وڵاتە هەژارەکان، لەوانە لە وڵاتە ئەفریقییەکان سست ببوو، لەودەمانەدا بەچەندین شێوەو رواڵەت گۆڕانی سیاسیو کۆمەڵایەتی لەجیهان روو دەداتو نەخشەکانی جوگرافیا لە زۆر ناوچەدا دەگۆڕێت، ژمارەیەک لە وڵاتان رەش بوونەوەو وڵاتانی نوێ لەسەر نەخشەی جیهانی سیاسی پەیدابوون، لەو گۆڕانو سیاسەتە نوێیەدا بزافی سیاسیو رزگاریخوازی لەچەندین دەفەری ئەو وڵاتانە سەر هەڵدەدات، لە ساڵەکانی پەنجاکانو شێستەکانی سەدەی بیستەم ئەو بزافو شۆڕشانە گەرم دەبن، کە تێدا لەو شۆڕشەدا چەند نموونەو سونبل ناو دەردەکەن کە بۆ سەربەخۆییو ئازادی کۆششو خەبات دەکەن. یەکێک لەو ناوانەی لەو مەیدانەدا ناوی لە سەرانسەری جیهان گەشەدارو دیار بوو ئەرنستو گیڤارا بوو، کە ناوی بە(چێ گیڤارا) دەرکردبوو، ئەگەرچی ئەو لەوڵاتەکەی خۆیدا شۆڕشی نەکردبوو، لەوێش سەرکردەیەکی سیاسیو مەیدانی نەبووە، بەڵام ئەو ببووە چالاکوانێکی دیارو رۆڵێکی ئیجابی هەبووە لەیارمەتیدانی شۆڕشگێڕەکان، هەموو وزەو زانیارییەکان بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کردبوو، دیارە ئامانجو مەبەستیشی دەسەڵاتو ناوداریو پاداشت نەبووە، بەڵکو ئەو تەنها مەبەستی گەیاندنی پەیامێک بوو بۆ بەرهەڵستی سیستەمەکانی زوڵمو زۆرداریی.

گیڤارا لەساڵی ١٩٢٨ لەوڵاتی ئەرجنتین لە بنەماڵەیەکی مامناوەند لەدایکبووە، لەزانکۆی بۆینس ئایرس پزیشکی خوێندووە لەساڵی ١٩٥٢ خوێندنەکەی تەواوکردووە. ئەو دەیتوانی بەئاسانیو بەباشی وەک دکتۆرێک لەوڵاتەکەی کار بکاتو بژیت، بەڵام ئەو دەبێتە کەسێکی شۆڕشگێرو بڕیار دەدات خەبات لەو شوێنانە بکات کە زوڵمو زۆرداری دەسەڵاتدارەکانی تێدایەو ژیانی خۆی بکاتە قوربانی ئەو بەرنامەو ئەو خەباتە تا میللەتەکان لەو سیستەمانە رزگار بێت.

گیڤارا نەخۆشی تەنگەنەفسی هەبووە، بۆیە خزمەتی سەربازی نەکردووەو عاشقی گەڕانو سەیران بووە، لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆیدا بەماتۆرسیکلێک لەناو وڵاتانی ئەمریکای باشوور گەڕاوە، ئەودەمانە لەقۆناغی کۆتایی خوێندنی پزیشکی بووە، لەو گەشتەدا یەکێتی خاکی ئەمریکای باشوور بەرجەستە دەکات، هەست دەکات وڵاتەکان هەموو یەکپارچەیەو زوڵمو ستەمی ئیمپریالییە گەورەکانی تێدا بەرقەرارە، لەو وڵاتانەدا دەبینێت کە کرێکارە سادەکان چەند بەشخوراون. لەودەمانەی سەرۆکی وڵاتی گواتیمالا سەرکردایەتی حکومەتێکی چەپی میللی دەکرد، ئەو سەردانی ئەو وڵاتە دەکات، بە مەبەستی گۆڕانی سیستەمەکانی کاروباری زەویو زارو کشتوکاڵ حکومەتە میللییەکە بەرەو شۆڕشێکی سۆسیالیستی هەنگاوی دەنا، بەڵام حکومەتەکە لەساڵی ١٩٥٤ بەکودەتایەکی سەربازیو بەپشتیوانی ئیستخباراتی ئەمریکی حکومەتەکەی گواتیمالا دەڕوخێت. لەساڵی ١٩٥٥ گیڤارا دیمانەی ژنە چەپە شۆڕشگێرە پیرۆییەکە هیلدا دەکاتو بەیەکەوە پرۆسەی هاوسەرگیری دەکەنو کیژێکیان دەبێت، ئەو ژنەش گیڤارا هاندەدات

کتێبە کلاسیکییە مارکسییەکان بخوێنێتەوەو شارەزایی لەو فەلسەفەیە پەیدا بکاتو لینینو ترۆتسکیو ماو ناس بکات.

* * *

کە سەفارەتی ئەرجەنتینی گیڤارا هوشیار دەکاتەوە کە موخابەراتی ئەمریکی داوای کردووەو مەترسی لەسەر ژیانییدا هەیە، ئەو سەفەری وڵاتی مەکسیک دەکات، لەوێ دیمانەی راوڵ کاسترۆ دەکات کە لەگەڵ ژمارەیەک لەهاوڕێیەکانیدا لەتاراوگەدا دەژیانو کاریان دەکرد بۆ هەڵگیرسانی شۆڕش، بەرنامەکەشیان لەسەر ئەوە وەستابوو کاسترۆ لەزیندانی کوبا رزگاری بێتو شۆڕشەکە هەڵگیرسێنێت، کە کاسترۆ لەزیندانا ئازاد دەبێت بۆ مەکسیک دوور دەخرێتەوە، لەوێدا گیڤارا بڕیار دەدات بچێتە ناو شۆڕشەکەی کوبا. کە کاسترۆ دەزانێت ئەو کەسەی شارەزوویەتی لە شۆڕشەکەیاندا بەشداریان بکاتو دکتۆریشە، زۆر بەگەرمییەوە خۆشحاڵی بەشداربوونەکەی گیڤارا لە شۆڕشەکەیان قبووڵ دەکات، هەردوولا رزگاربوونی ئەو وڵاتە بەئاسنو بەئاگر بەپێویست دەزانن تا وڵاتەکە لە ژێر باری ستەمو برسیەتی دەرباز بکەن، چیتر دەمی ئازادییەکان نەگیرێتو میدیاکان ئازاد بنو سانسۆر لەسەر چاپەمەنییەکان نەمێنێت، چونکە لەودەمانە ئەوانەی وشەی ئازادییان دەربڕیبووایە خۆیان لەگرتووخانەکان دەدۆزیەوە، هەڵگیرسانی شۆڕشەکەش زۆرتر لەبەر ئەوەبوو کە بەڵێنەکانی پاش کودەتاییەکەی ساڵی ١٩٢٢ هیچی جێبەجێ نەکرابوونو بەزەبری توندوتیژیی

دەسەڵاتیان گرتبووە دەست، کە ناچار دەکرێن ئەو دەسەڵاتە جێبهێڵن، ئەوە دووبارە ئەو دەستە بەکودەتایەکی خوێناوی لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٥٢ دێنەوە سەر حوکمو دەکەونە ناو گیانی هاوڵاتیانو کۆمەڵکوژییان دەرحەق دەکەن، کە لە کۆمەڵکوژییەکەی مولوزا دە هەزار کەس بوونە قوربانی، گەندەڵییش دەگاتە هەموو بوارەکانی ژیانو سەرانسەری کوبا دەگرێتەوە، باتیستا هەموو خزمەکانی لەپۆستە گرنگەکان دادەمەزرێنێت، لەبەرئەوەی گەندەڵییەکان لەهەموو بوارەکاندا هەبووەو ئەوانیش وەک دیکتاتۆرو کەسانی زەبربەدەست بوون بۆیە کەمتر زانیارییەکان لەسەر ئەو گەندەڵییانە ئاشکرا دەبوون.

باتیستا ١٨ ساڵ حوکمی کوبای کردبوو، ئەو پارەیەکی زۆر دەستکەوتبوو، کە خەڵکەکە بەزۆری لە ژێری هێڵی برسیەتیو نەبوونیو نەخۆشییدا دەژیان ئەو سەرمایەکەی دەگەیشتە سێ سەد ملیۆن دۆلار، وڵاتەکەی کردبوو بە کێڵگەیەکی تایبەت بەخۆیو بەبنەماڵەکەی، تا وێنەو کارنامەکانی جوانو سەرەنجراکێش بکەن دەستەیەک رۆژنامەنووس لەوێ کۆببوونەوەو کاریان دەکرد تاوەکو روو وناکاری لەدەرەوەدو ناوەوە جوان بکەن. باتیستا دەستی بەسەر سەرمایەیەکی زۆردا داگرتبوو، دارودەستەکەی زۆر سوومەندبوون، حوکمەکەشی بەتوندی بەڕێوە دەبرد، ئەو بە یەکێک لە زۆردارەکانی جیهان دەژمێردرا، لەو ماوە درێژەی حوکمی وڵاتەکەی دەکرد سەدان کەسی بەرهەڵستکاری رەوانەی گرتووخانەکان دەکرد، ژمارەیەکی زۆریشی ئەشکەنجە دەداو زۆریشی لە وڵات دەردەکرد. ئەو دیمانەو ئەو رۆژگارەی میللەتی کوبی کاستڕۆ گیڤارای هاوڕێی هەراسان کردبوو، بۆیەش بڕیار دەدەن کار بۆ لە

ناوبردنی ئەو زۆرداره دیکتاتۆره بکەن ئەگەر قوربانییەکان بۆ گەیشتن بەسەرکەوتن زۆر گرانو پیرۆزیش بێت. بۆیەش دەتوانن لەو شۆڕشەدا سەربکەون خەونی ملیۆنەها هاوڵاتی برسیو زوڵم لێکراو لە وڵاتی کوبا بهێننە دی.

کە شۆڕشگێرەکان لەسەر پشتی کەشتییەک گەیشتنە ناو کوبا ژمارەیان تەنها ۸۰ کەس بوو، کە تێیدا تەنها دە کەسیان بەزیندوویی مانەوە لەوانە کاسترۆو ڕواڵی برایو گیڤارا، لەو شکستەدا جەماوەرێکی زۆریان بە لای خۆیاندا ڕاکێشاوەو، بەمەش دۆستیان بۆ شۆڕشەکەیان زۆر دەبێت. بە تایبەتی لە ناوچە گوندنشینەکاندا. ئەو دەستە بە ژمارە کەمە لەشەڕە پارتیزانییەکان بەردەوام دەبن، دوو ساڵ شەڕ دەکەنو لەشەڕەکانیاندا نیوەیان دەکوژرێن، بۆیە گیڤارا بەرنامەیەک دادەڕێژێت کە لە شاخەکانی سییرا بەرەو هاڤانای پایتەختدا بچنە خوارەوە، بۆیە شۆڕشگێرەکان دەتوانن لەمانگی یەنایەری ساڵی ۱۹۵۹ دا بچنە ناو شارەکەو سەربکەون، ئەو دەستەیەی گەیشتنە جەرگەی پایتەختو دەستیان بە بەرنامەیەکی نوێ کردبوو، ژمارەی چەکدارەکانیان تەنها سێ سەد کەس بوون، ئەگەرچی حکومەتی ئەمریکی پشتیوانیشی لێدەکردو ژمارەیەک بەکرێگیراوی موخابەراتی مەرکزی ئەمریکیش لەناو سوپاکەی کاسترۆش چاندرابوون، شۆڕشەکە سەردەکەوێتو حکومی باتیستای دیکتاتۆریش دەڕوخێنن.

# لەسەرانسەری جیهاندا

پاش سەرکەوتنی شۆڕشەکە بڕیار دەدرێت ناسنامەی کوبی بدرێتە ئەو هاوڵاتییە بێگانانەی بەشداری شۆڕشەکەیان کردبوو، بۆیەش ئەو بڕیارە گیڤاراش دەگرێتەوەو لەسوپاشدا پلەی عەقیدو نازناوی سەرکردەی پێ ڕەوا دەبینن، پاشان دەبێتە بەڕێوەبەری بانکی ناوەندی، ئەو بەشداری دەکات لە دادگاییکردنی نەیاری شۆڕشەکە، کە شۆڕشگێڕەکان بەتایبەتی سوپاکەی دەسەڵات دەگرنە دەست، حکومەتی کۆمۆنیزمی دادەمەزرێنن، کە تێیدا گیڤارا پۆستی وەزارەتی پیشەسازی وەردەگرێتو دەبێتە نوێنەری کوباش لە دەرەوە، پاشان دەبێتە پەیڤداری کوبا لە نەتەوە یەکگرتووەکانو سەردانی وڵاتی چینو یەکێتی سۆڤیەتیش دەکات، بەڵام گیڤارا لەگەڵ سۆڤیەتییەکاندا ناکۆک دەبێت پاش ئەوەی سۆڤیەت ڕێکەوتن لەگەڵ ئەمریکییەکان دەکاتو مووشەکەکانیان لەدوورگەی کوبا دەکێشنەوە، کە تێیدا ئەمریکییەکان بەڵێن دەدەن دەستدرێژیی نەکەنە سەر کوبا.

گیڤارا لەپێگەی خۆیەوە دژ بەدەستوەردانی ئەمریکییەکانەوە دەوەستێت، بۆیەش بڕیار دەدات هەموو بەرژەوەندیو سەرمایەکان بۆ حکومەت خۆماڵی بکەن، ئەوەش بە دانوستانی کاستڕۆو گیڤارا دەکرێت. لەلایەکی تریشەوە ئەمریکییەکان گەمارۆکەی سەر کوبا توندو دژوار دەکەن، بۆیە کوبا ناچار دەبێت زۆرتر بەرەو یەکێتی سۆڤیەت بچن، بڕیار دەدەن پشتیوانی لە بزاڤەکانی ڕزگاری لە وڵاتانی شیلیو ڤێتنامو

جەزائیر بکەن.

گیڤارا وەک پەیڤداری شۆڕشی کۆبا دەگەیشتە هەموو گۆشەیەکی ئەو جیهانە، بانگەوازی پشتیوانیو یارمەتیدانی شۆڕشەکانی هەمووی جیهانی بەرز دەکردەوە، داوای دەکرد هەموو میللەتان لە ژێر سێبەری ئازادییدا بژین، ئاڵای ئازادی لە هەموو شوێنێکدا بشەکێتەوە، بۆیەش ناوی گیڤارا دەگاتە هەموو گوێو چاوێک، وەک کەسێکی خەباتگێر دەناسرێت، ئەو لەناو وڵاتانی ئەمریکای لاتینیی دەسوڕایەوە، وەکە باڵوێزێکی گەڕۆک دەگەڕا، سەرکردەکانی جیهانی دەبینیی لەوانە جەمال عەبدولناسرو نەهرۆو سکارنۆو ئەحمەد بن بیلا. بۆچوونەکانی گیڤارا لەگەڵ کاسترۆ یەک ئاست نەبوون، ئەو لەگەڵ کاسترۆ جیاوازبوو، ئەو پیاوی هەڵوێستەکان بوو، کاری نەدەکرد پۆستو پایەو دەسەڵاتی دەست بکەوێت، لەهەموو ژیانیدا کۆششی دەکرد میللەتانی جیهان ئازاد بن، بەتایبەتی میللەتانی جیهانی سێیەم، ئەو میللەتانە فشاری کۆلۆنیایان لەسەر نەمێنێت، کۆمپانیاکان هەموو سەرچاوەکان قۆرخ نەکەن، دەوڵەمەندەکان نەیانڕوتێنەوە، دەسەڵاتدارەکان نەیانچەوسێنەوە، هەموو جیهان دەیزانی گیڤارا چۆن دەخوازێت سەرکردایەتی شۆڕشەکان بەرووی ئیستعمارو مۆنۆپۆلە بێگانەکان لەئەفریقیا هەڵبستنەوەو شۆڕش بکەن.

# لەدەرەوەی کوبا

لە مانگی ئوکتۆبەری ساڵی ١٩٦٥دا گیڤارا نامەیەک ئاراستەی کاسترۆ دەکات، تێیدا دەست لە سەرکردایەتی حزبەکەو پۆستی وەزارەتەکەو پلەی سەرکردەو ناسنامەی هاوڵاتیبوونی کوبی دەکێشێتەوە، لە نامەکەدا نووسیبوی هەندێ پەیوەندی سروشتی هەیە کە ناکرێ لەسەر پسولەی رەسمی لابدرێت، من ئەوەش رادەگەیەنم کە ئەڤینە قووڵەکەم بۆ کاسترۆو کوبا هەر دەمێنێت، رۆژانی خەباتە هاوبەشەکەمان بۆ رزگاری هەرگیز لە بیر ناچێتو بەشانازییەوە یادی دەکەمەوەو بۆی دەسوتێم.
لەودەمانەدا ئاژانسی ئیستخباراتی ئەمریکی هەواڵی ئەوەی بڵاودەکاتەوە کە گیڤارا لەسەر دەستی هاورێیەکانی رۆژانی خەباتەکەیان لە کوبا شوێن بزر کراوەو بە فەرمانی فیدل کاسترۆ کوژراوە، ئەو هەواڵە لە هەموو دەزگاکاندا بەگەرمی باس دەکرا، بۆیەش کاسترۆ ناچار دەبێت دەقی نامەی دەست لەکارکێشانەوەکەی گیڤارا بڵاوبکاتەوە، کە بەدەستخەتی خۆی نووسرابوو، کە تێیدا نووسیبووی:

(من وا هەستدەکەم فەرمانی سەرشانم تەواو کرد، پەیوەندییەکانم بەشۆرش لەسەر خاکی کوبا تەواو بوو، بۆیەماڵئاوایی لەتۆ دەخوازم، ماڵئاوایی لە هاورێیەکانم دەخوازم، ماڵئاوایی لە میللەتەکەتان دەخوازم، ئەوانەی من بەمیللەتی خۆمم زانیوە، وا بەرەسمی لە پۆستی سەرکردایەتی حزبو لە پۆستی وەزارەتو پلەی سەرکردەو لە ناسنامە کوبییەکەم وازدەهێنم، لەو رۆژەوە من هیچ پەیوەندییەکی یاسایم بەو

وڵاتەوە نامینێت).

لەو نامەیەی گیڤارا دیارە کە ئەو جارێکی تر بەشێوەیەکی رەسمی روو لەو وڵاتە ناکاتەوە، ئەو وەک شۆڕشگێڕێک بەرەو ئەوای ئارام دەڕوات، ماوە ماوەش ئەواکەی دەگۆڕێت، ئەو دەگاتە وڵاتی کونگۆو ئەزموونە شۆڕشگێڕییەکەیان لەوێو لە چەندین شوێنی تر ژیانی خۆی بۆیان تەرخان دەکات.

* * *

گیڤارا لەکونگۆ کاری بۆ ئەوە دەکرد چەند دەستەیەکی پارتیزان پەروەردە بکات، بەڵام بۆچوونو بەرنامەکەی لەلایەن سەرکردەکانەوە بەگەرمی قبوڵ نەدەکرا، بەڵام ئەو سوور دەبێت لەسەر ئەوەی ئەو خەباتە لەو وڵاتەدا دەست پێ بکات. ئەو لەکاروانەکەیدا بەردەوام دەبێت، بەناوی کەسێکی ساماندارو بزنسمان گەشتێکی دوور دەست پێدەکات، لەو وڵاتەوە دەچێتە وڵاتێکی ترەوە، لەو کاروانەشدا ئازارو زەحمەتێکی زۆریشی هاتووتە پێش. ئەو لەچەند وڵاتی ئەفریقییدا لەناو شۆڕشگێرەکاندا دەسووڕێتەوە، بەڵام لەو ئەزموونەدا سەرناکەوێتو بەرنامەکەی مەیسەر نابێت، چونکە سەرکردە ئەفریقییەکان هاوکاری ناکەن، لەو وڵاتانەش کێشەی گۆڕینی ئاوو هەواو زمانیشی دەبێت، بۆیە خۆی لە نەخۆشخانەیەکی شاری براغ دەدۆزێتەوە. گیڤارا لە زائیر (کونگۆی دیموکراسی) هاوشانی سەرۆکە شۆڕشگێرەکەیان پاتریس لۆمۆمبا دەمێنێتەوە، لەودەمانە لە بۆلیڤیا شۆڕشێکی نوێ سەرهەڵدەدات، بۆیە

لە لای لۆمۆمبـــا دەڕوات، بەڵام ڕۆژانەی گیڤــارا لەبەر کەمـــی بەڵـــگەو تۆمارەکـان زۆر بـاش ڕۆژانەکـانی ئەو دیـارو زانـراو نـین، ئەگەرچـی تـا دوا ڕۆژەکانیشی پەیوەندییان بەلۆمۆمبا هەر هەبووە.

گیڤارا لەو سەردانەی بۆ بۆلیڤیا مەبەستی هەڵگیرسانی شۆڕشێکی چەکـداری نەبـــووە لەو وڵاتەدا، بەڵکـو مەبەســتی بـــوو ڕێــزی بـــزاڤە ڕزگاریخوازەکان لەئەمریکای لاتینی دژ بە دەسەڵاتو بەتاڵانبردنی سامانە سروشتییەکانیان ساز بکات. لە سـەردتای ساڵی ١٩٦٧ گیڤارا خۆی لەگەڵ تەنها بیست چەکداری شۆڕشگێری بۆلیڤی لەدەشتەکانی ئەو ناوچەیە ئیستوائییەدا ڕووبەڕووی سوپایەکی پڕ چەککـراو لەلایەن سـەرکردایەتی CIA دەبینێتەوە. ئەو لەوێ کۆشش دەکات هێزێکی باوەڕدار لە جوتیارو هیندییەکان ساز دەکات، بەڵام بەوە ڕانەگەیشتو تووشی هێرشی توند دەبێتەوەو شەڕەکان پێشوەخت ڕوودەدات.

## تیرۆرکردنەکەی

دوو پەیامنێری شۆڕشەکە دەگیرێن، لە ژێر ئەشکەنجەدا دان بەوەدا دەنـێن کە شۆڕشـەکەیان بەڕێبەرایەتـی گیڤـارایە، بـۆیە موخـابەراتی مەرکەزی ئەمریکـی بەهاوکـاری سـوپای بـۆلیڤی بـۆ ڕاونـانی ئەو دەکەوێتەخۆ، هەزارەها سەرباز شاخەکانو ناوچە دوورەکان دەپشکنن‌و لە چـل کەسـی مانـدوو برسـی دەگەڕێـن، گیڤـارا شۆڕشـگێڕەکان وا دابەش دەکات تا زۆرتر بچنە پێشەوە، بەو شێوەیە چوار مانگ لەو دارستانە چڕو

بێشەڵانەدا بەلاوازیو بەبێ دەسەڵاتیو دووردەپەرێزیی دەمێنێتەوە، لەو ماوەیەدا گیڤارا چەندین جار تەنگە نەفەسییەکەی تەنگی پێهەڵدەچنێت، تەندروستی زۆر شپرزە دەبێت، بۆیەش گیرانو گەمارۆدانەکەیان ئاسانتر دەبێت.

لە رۆژی ٨ ی مانگی ئوکتۆبەری ساڵی ١٩٦٧ دا دەستەیەک لسوپای پۆلیڤی کە پێکهاتبوون لەهەزارو پێنجەسەد کەس لەگەڵ دەستەکەی گیڤارا رووبەروو دەبنەوەو لەشەڕێکی سەختی شەش سەعاتیدا بێجگە لە گیڤارا هەموویان دەکوژرێن، لەوێ قاچی بریندار دەبێتو تفەنگە جۆرە میم (٢)دکەی دەشکێتو مەخزەنی دەمانچەکەشی گوم دەبێت، بۆیەش ئەو بەزیندوویی دەگیرێت. گیڤارای دیلکراو دەگوازنەوە گوندی (لاهیگیراس)و ماوەی بیستو چوار سەعات بەزیندوویی دەمێنێتەوە، پاش ئەوەی لێکۆڵینەوەی زۆری لەگەڵدا دەکەن، ئەو یەک وشەیان بۆ نادرکێنێت، باس لەنهێنییەکانیان بۆ ناکات، بۆیەش لەقوتابخانەی گوندەکە ئەفسەرێک بەناوی ماریو تیران فەرمانەکەی سەری جێبەجێ دەکات، بەگولله گیڤارا دەکوژێت. دەسەڵاتدارانی پۆلیڤی رازی نابن تەرمەکەی بدەنەوە براکەیو شوێنی ناشتنەکەشی پێ ناڵێن، تا ئەو شوێنە لەدوارۆژدا نەبێتە مەزارگەیەکی شۆڕشگێرانی هەموو جیهان. لەیادی ساڵڕۆژی تیرۆر کردنەکەی گیڤارا گەنجانی هەموو جیهان بۆ نەهێشتنی شەڕەکانو بەرقراربوونی ئاشتی دەڕژێنە سەر شەقامەکانو نارەزایی دژ بەشەڕ نیشاندەدەن، ئەو پیاوە شۆڕشگێرە دەبێتە سیمای هەموو کێشەکانی جیهان، ئەو دەبێتە خەونی ملیۆنەها کەس. ئەو کە رێبەرایەتی شۆڕشەکانی دەکرد، وایدەزانی ئەو بەرپرسە لە خەمو

ئەهامەتییەکانی هەموو خەڵکە بەشخوراوەکان، ئەو بەوە رازی نەبوو لەوڵاتەکەی خۆیدا تیماری ئەخۆشەکانی ئەرجنتین بکات، ئەو بڕیاری دابوو ببێتە قوربانی ئاسایشی هەمووولایەک، بۆیەش دوا هەناسەی لەگرتووخانەکانی پۆلیڤیا هەڵمژیوەو لەوێ خۆی کردووتە قوربانی کێشە رەواکانی ئەو خەڵکە چەوساوەیە، تا دادپەروەری بەرقراربێت.

گیڤارا بڕوای وابوو کەمرۆڤ دەبێت لە پێناوی ئازادییەکاندا هەموو رەوشەکان ببینێت، دەیزانی ئەو خەباتە رۆژێک دێ بەرهەمی دەبێت، ئەگەر خەڵک گیانی خۆی بکاتە قوربانی ئەو بەرنامەیە پیرۆزەیە، دەبێ مێژووی میللەتان بە خوێن بنووسرێت. شاعیرەکان جیهان ستایشی ئەو قارەمانەیان کردووە، چونکە وایاندەزانی ئەو هەناسەی ئەو میللەتانە بووەو ئەو کۆششی کردووە دوارۆژی ئەو گەردوونە پرشنگدارو گەشاوە بێت.

پاش پێنج ساڵ لە کوشتنەکەی، کێشەیەک بەناوی وشەکانی گیڤارا پەیدا دەبێت، بیرەوەرییەکانی دەبێتە سونبلێکی دیارو رەمزێکی خەڵکانی زوڵملێکراو، بەکرێگیراوی پێشووی ئاژانسی موخابەراتی ئەمریکی فلیکس رودریگیس دوا وێنەی پێش کوشتنەکەی بڵاودەکاتەوە، کە لە گوندی لاهیگیرا لە دارستانی ڤالی گراندی لەپۆلیڤیا بەگوللە کوژرا، لەوێنەکەدا دیارە کە چۆن ئەو لەسەر ئەرز درێژ کراوەو چاودکانی ئەستووربوون و لەخوێن وەردراوە، بەوەش هەموو قسەکانی سەبارەت بەکوشتنەکەی کۆتایی دێت، هەر ئەو کەسە بەکرێگیراوە وتوویەتی تا پەنجەمۆرەکانی گیڤارا وەرگرن هەردوو دەستیان بڕیوەتەوە.

# ترۆتسكی

ترۆتسكی چەند ساڵ چاوەڕوان بوو
بكوژرێت

ناوی راستەقینەی ترۆتسکی لیڤ داڤیدوفتش برونشتاین بوو، بەڵام ئەو بەترۆتسکی دەناسرا، ئەو بەرنامەرێژیی شۆرشێکی جەماوەریی مەزن بووە لەمێژووی هاوچەرخدا، ئەگەر لینین رۆحی پشتیوانی شۆرشی بەلشەفی ببووبێت ئەوا ترۆتسکی بەرنامەرێژو عەقڵی ستراتیژییەکەی ئەو شۆرشە بووە.

ترۆتسکی لە ساڵی ١٨٧٩ لە ئۆکرانیا لە بنەماڵەیەکی گوزەرانباش لە دایکبووە، لە تەمەنی هەژدە ساڵییەوە دەچێتە ناو گۆرەپانی سیاسەت، بەشداریی دیمانەو کۆبوونەوەکان دەکات، داوای مانگرتنو ناردزاییەکان دەکات، لە مانگی یەنایەری ساڵی ١٨٩٨دا بەتۆمەتی هاندان بۆ هەڵگیرسانی شۆرش ٢٠ مانگ دەگیرێت، کە ئازادیش دەبێت بەرەو سیبریا دووردەخرێتەوە، بەڵام ئەو بەناوی ساختەی ترۆتسکی لەوێ رادەکات، ناوەکەشی لە ناوی ئەو پیاوە وەردەگرێت کە لە زیندانی ئودیسا چاودێری دەکرد، ئەو ناوەش بە کاروانی ژیانی وەدەنووسێت. ئەو سەفەری ڤیینا دەکات، لەوێشەوە دەچێتە زیورخ پاشان دەچێتە لەندەن، لە لەندەن لینین دەبینێت، لەپایزی ساڵی ١٩٠٢ هاورێیەکانی ئەویش دەناسێت، لە کۆنگرەی ئیشتراکییە دیموکراسییەکان لە رۆژی ٢ ی مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩٠٣ لە بروکسلو لەندەن بەشدار دەبێت، کە لەو کۆنگرەیەدا دووبەرەکی تێدا روو دەدات، کە پاشان بەناوی بەلشەفیک واتە زۆرینەو مەنشەفیک واتە کەمینە دەناسرێن، ئەو دژایەتی سیاسەتەکەی لینین دەکات کە سەرکردایەتی بەلشەفییەکانی دەکرد، بەڵام ترۆتسکی ناچێتە ناو مەنشەفیکییەکان.

لە مانگی یەنایەری ساڵی ١٩٠٥ دا ئەو دەگەرێتەوە رووسیاو بەشداری

لەرێپێوانو نارەزاییە جەماوەرییەکان دەکات کە لەپترۆگراد روو دەدەن، بۆیەش لەمانگی سێپتەمبەری هەمان ساڵدا ئەو دەگیرێتو دەخرێتەوە زینـدانو دووبـارە بەرەو سـیبریا دووردەخـرێتەوە، بەڵام ئەو ئازایـانە دەتوانێت لەو شوێنە دوورەوە را بکاتو بگاتە وڵاتی فینلەندا، لەوێ لینین دەبینێتەوە، لەوێیەوە کۆچ دەکاتو دەگاتە وڵاتی ئەڵمانیاو ماوەیەکی درێژ لەتاراوگە دەمێنێتەوە کە ماوەی دە ساڵ دەخایەنێت.

لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٠٨ ترۆتسکی سەرپەرشتی دەرچوونی رۆژنامەی (پراڤدا) دەکات، کە مانای ناوەکەش راستییە، ئەو رۆژنامەکەی بۆ قسەکردنو هاندانی کرێکارانو جەماوەری میللەتەکەی دەرکردبوو، ئەو رۆژنـامەیە بەدزی دەگەیانـدرایەوە نـاو وڵاتو لەرووسـیادا دەخوێنـدرایەوە، لەو رۆژنـامەیەدا بەئاشـکرا بـانگەوازی شۆرشـێکی جەمـاوەری لە رووسـیادا دەکـرد، تـا بەیەکجـاری سیسـتەمە سـەرمایەدارییەکە بـروخێنو لەجیـاتی ئەو سیسـتەمە رژێمێکـی سۆسیالیستی دامەزرێنن کە ببێتە سیستەمێکی سەرتاسەری لەهەموو جیهان.

## گەڕانەوە بۆ رووسیا

لەرۆژی ٢ی مانگی ئوگستی ساڵی ١٩١٤ ئەڵمانیا شەڕ دژ بەرووسیا رادەگەیەنێت، لەئێوارەی هەمان رۆژدا ترۆتسکی پاش مانەوەی حەوت ساڵ لەڤیینا بەرەو زیورخ دەکەوێتە رێ، لەرۆژی ١٩ی مانگی نۆڤەمبەردا

بەرەو فەرەنسا بەڕێدەکەوێتو لەوێ نیشتەجێ دەبێتو تێیدا دەمێنێتەوە تا لە پایزی سالی ١٩١٦ دەری دەکەن، بۆیە بەرەو ولاتی ئەسپانیا بەڕێدەکەوێت. هەمان سالو لە مانگی دیسەمبەردا پۆلیسی ئەسپانی لەوێش دەریدەکات، دەیانەوێت بەرەو کوبا شاربەدەری بکەن، بەلام ئەو داوای کردبوو بەرەو نیویۆرک بواری بدەن بڕوات، بۆیەش لەگەل خێزانەکەی لە ناوەندی مانگی یەنایەری سالی ١٩١٧ دەگاتە ئەوێندەرێ، کە پێشکەوتنەکانی ئەمریکا دەبینێت لەوێ دەلێت ڕەنگە ڕۆژێ بێت ئەمریکا جیهان بەڕێوە بەرێتو ببێتە پێشەنگی جیهان.

لەودەمانەدا ڕەوشی ناوخۆی رووسیا بەرەو خراپی دەچوو، بۆیە ترۆتسکی بڕیاردەدات بگەڕێتەوە رووسیا، لەرۆژی ١٧ ی مانگی ئەیاری سالی ١٩١٧دا دەگاتەوە پتروگراد، لەوێیدا دەبینێت ڕەوشی سیاسی زۆر خراپترە لەوەی مەزندە دەکراو باسی لێوە دەکرا، بۆیەش قەیسەر واز لەتاجەکەی دەهێنێتو بنەمالەی رومانۆف هەموویان بەیەکجاری دەبرێنەوە، لەو رۆژەدا دەردەکەوێت کە ئەوان چیتر حوکمی رووسیایان پێ ناکرێتو لەهەموولایەکدا شکست دەخۆنو دەسەلاتیان لەسەر ئاراستە سیاسییەکان نامێنێت، ئەگەرچی ولایەتە یەکگرتووەکانو ئینگلتراو فەرەنساو ئیتالیاش دانیان پێ دادەن.

لینینو هاوڕێیەکانی پێش ترۆتسکی گەیشتبوونەوە پتروگراد، لەودەمانەدا ڕەوشەکە بەرەو خراپتر دەرۆیشت، بەلام بەگەیشتنیان ئەوان دەگیرێنو لەرۆژی ١٩ ی مانگی یولیۆی سالی ١٩١٧ لەزیندانیان دەپەستن، بەلام ترۆتسکی بێدەنگ نابێتو نامەیەکی نارەزایی ئاراستەی کیرنسکی دەکات، تێدا دەنووسێت منیش لەگەل هاوڕێیەکانمدا بەشدارم

لەو کارانەی پێی تاوانبار کراون، منیش وەک ئەوان دژایەتی حکومەتم کردووە، بۆیە ئەویش دەگیرێت، بە جاسووسی ئەلّمانی تاوانباری دەکەن، زووتریش لینین بەو تاوانەوە گیرابوو، بۆ تاوانبارکردنەکەشی چەندین بەڵگەی ساختەشی بۆ هەڵدەبەستن، کە تێدا دیاردەکەوێت ئەو جاسوسی ئەڵمانەکان بووە. لەبەر فشاری کۆنگرەی سۆڤیات پتروگراد کە لەرۆژی ١٢ ی مانگی سپتەمبەری ساڵی ١٩١٧دا بەسترابوو، کیرنسکی ناچار دەبێت ترۆتسکیو هاورێیەکانی ئازاد بکات، بەلآم لینین لەژێر خۆپۆشینی جلی شوفێرێکی شەمەندەفەر را دەکاتو دەگاتە ولآتی فینلەندا. لەرۆژی ٨ ی ئوکتوبەری ساڵی ١٩١٧ ترۆتسکی وەک سەرۆکی ئەنجومەنی سۆڤیاتی پتروگراد هەڵدەبژێردرێت، کە ئەو پۆستە وەردەگرێت پشتیوانی خۆی بەکیرنسکی دەکێشێتەوەو فەرمانی گرتنی لینینیش هەڵدەوەشێنێتەوە.

کە ترۆتسکی لە زیندان ئازاد دەبێت بەرنامەی هەڵگیرسانی شۆڕش بەهێمنی دادەرێژێت، ئەو دینامیکی زیندووی یەکەمی ستراتیژیەتی بەلشفییەکان بووە.

## شۆڕشەکە

ترۆتسکی داهێنەری شێوەکاری نوێ بوو لە کودەتاکردنی لەسەر حکومەتەکان، ئەو رێکخەری چۆنیەتی دەستبەسەر داگرتنی پێگەو مەڵبەندە زیندووەکان بووە بەبێ خوێنرشتن، رۆژی یەکەمی

هەڵگیرسانی شۆڕشەکە بەبەرنامەرێژی ئەو بووە، پرۆسەکە وا کۆتایی هاتووە وەک ئەوەی نە شۆڕش کرابێت، نە هیچ رووی دابێت.

لە رۆژی ٥ ی مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩١٧ کیرنسکی فەرمان دەدات ترۆتسکی بگیرێت، بەڵام ئەو خۆی رادەستی دەسەڵاتدارەکان ناکات، لەودەمانەدا ئەو دەستی بەسەر هەموو مەسەلەکان رادەگەیشت، بۆیەش بەیانییەکەی رۆژی ٧ ی مانگی نۆڤەمبەری هەمان ساڵ بڕیاری رابوونەکە دەدات. لەو رۆژەدا بەلشەفیکییەکان دەست بەسەر ئیستگەکانی شەمەندەفەر دادەگرن، بانکەکان، ئیستگەکانی بەرهەمهێنانی کارەباو سەنتەرەکانی تەلەفۆنو نووسینگەکانی پۆستو هەموو رێگاو بانو پردو رێگا سەرەکییەکان کۆنترۆڵ دەکەن. لە سەعات دەی ئەو رۆژە ترۆتسکی بەناوی لیژنەی شۆڕشی سەربازییەوە ئەوە رادەگەیەنێت کە شەرعیەتی حکومەتی کاتی نەماوەو حکومەتەکەش بەرووخاو ناو دەبات، بەپێی ناوەڕۆکی ئەو بەیانە دەسەڵاتەکانی حکومەتەکە رادەستی ئەو لیژنەیە دەکرێت.

لە بەیانی رۆژی ٨ ی مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩١٧ دا لینین بڕیار دەدات ئەنجوومەنێکی کۆمیسیری میللی بەسەرۆکایەتی خۆی دامەزرێنێت. وشەی کۆمیسیر لە جیاتی وەزیر بەکار دەهات، لەو کابینەیەدا ترۆتسکی کراوەتە وەزیری کاروباری دەرەوە، بەڵام ئەو پۆستەکەی نەویستووە، بۆیە لینین ئەو دەکاتە سەرۆکی ئەنجوومەنی کۆمیسیری گەل، لەبەرئەوەی ئەو کەسێکی جوولەکە بووە بۆیە لە کاری رۆژانەی لە کۆمیسیردا کێشەی زۆری بۆ هاتووەتە پێش.

پاش نیوەڕۆی ئەو رۆژە لینین لەپێش خەڵکەکە لەپتروگراد

دەردەکەوێت، لەوێیدا ترۆتسکی کۆتایی شۆڕشەکەو بەدیهێنانی ئامانجەکانی بەبێ خوێنرشتن رادەگەیەنێت.

ئەگەرچی شۆڕشەکە سەردەکەوێت، بەڵام هێشتا بەلشەفیکییەکان ئەگەری زۆریان لەپێشدا بووەو کاری حوکمگێڕانەکەیان کارێکی ئاسان نەبووە، چونکە زۆربوون ئەوانەی لەناو وڵاتدا نارازیبوونو دژ بەگۆڕانەکان بوون، هەروەها لەدەرەوەی وڵاتیش دژایەتی زۆر دەکران، بەتایبەتی وڵاتانی سەرکەوتوو لە جەنگی یەکەمی جیهاندا، لەساڵی ۱۹۱۷و ساڵی ۱۹۸۱ برسیەتی لەوڵاتەکە بڵاودەبێتەوەو خواردەمەنی دەست ناکەوێت، ئەو شۆڕشەی سوپا سپییەکە لەسەر رووباری ڤۆلگا کردبوویان زۆری نەمابوو دەسەڵاتی بەلشەفیکییەکان لەبار ببات.

ترۆتسکی رۆڵی سەرەکی دەگێڕێت بۆ کپکردنەوەی دەنگە نارەزایییو یاخیبوونەکە، ئەودەمانە ئەو پۆستی کۆمیسیاری جەنگی پێ سپێردرابوو، بۆیە ئەو شەمەندەفەرێکی گەورە ساز دەکات، ناو شەمەندەفەرەکە پڕ چەکو تەقەمەنییو کەرەستەی پێویستو خواردەمەنی دەکات بۆ سوپا سوورەکەیانو شەمەندەفەرەکە دەکاتە بارەگای بەڕێوەبردنی کارنامەکەی بۆ لەناوبردنی یاخیبوونەکان. ئەو لەگەڵ دەستەیەک لەیاوەرەکانی بەو شەمەندەفەرە لەسەر پێگەو سەربازگاکانو هێزەکانی سوور دەسووڕێتەوە، بەوردی قسە لەگەڵ سەربازەکان دەکات، بەرنامەکەیان بۆ شرۆڤە دەکات، ئامانجەکانی شۆڕشی بەلشەفیکیان لەلا پیرۆز دەکات، فەرمانە گرینگەکانی دەداتە ئەفسەرەکان، پێویستییەکانیان بۆ دابین دەکات، کۆشش دەکات کەسە یاخیبووەکان بەبەڵێنی باشو مژدەوە بگێڕێتەوە ناو ریزەکانی سوپای

سوور، ئەو ماوەی سێ ساڵ بەو شەمەندەفەرەو، بۆ رێکخستنی سوپاکەو سازکرنەوەی رەوشەکە لەناو وڵاتدا دەسووڕێتەوەو چەندین ناوچەی دوورو نزیک بەسەر دەکاتەوە. بەریتانییەکان لەودەمانە لەو وڵاتەدا پشتیوانی پاسەوانی سپییان دەکردو پڕ چەکیان دەکردن، تەقەمەنییان بۆ دابینیدەکردن، بۆیە هێزەکانیان دەگەنە سەر سنووری پتروگرادو پێشڕەوی زۆر دەکەن، تارادەیەک مەڵبەندە سەرەکییەکەیان دەکەوێتە مەترسییەوە. بەڵام بەسەرۆکایەتی ترۆتسکی هێرشەکانی سەر پتروگراد تێکدەشکێندرێتو ناتوانن شارەکە بگرنو حکومەتەکە لەباربەرن.

## ترۆتسکیو ستالین

لە رۆژی ۲۱ ی مانگی یەنایەری ساڵی ۱۹۲٤دا ترۆتسکی بەسەختی نەخۆش دەکەوێتو، تایەکی بەرز دەیدەگرێت، بۆیەش دکتۆرەکان ئامۆژگاری دەکەن ماوەیەک ئیسراحەت بکاتو بچێتە هەواری (سوخوم) لەسەر دەریای قەزوین، ئەو لەرێگادا دەبینێت بروسکەیەکی ستالینی پێدەگات کە هەواڵی مەرگی لینینی تێدا بووە. کە لینین دەمرێت ستالین دەبێتە سەرۆکی حزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، یەکەم کاریش ترۆتسکی لەپۆستی کۆمیسیری جەنگ دووردەخاتەوە، هەروەها لە ئەندامیەتی لیژنەی تەنفیزی دەولیو ئەندامیەتی لیژنەی ناوەندەی حزبی کۆمۆنیست سۆڤیەتیش دووری دەخاتەوە. لەمانگی یەنایەری ساڵی ۱۹۲۸ ستالین بڕیاردەدات ترۆتسکی بۆ گوندی (ئەلما ئەتا)ی سەر سنووری چین

دووربخـاتـەوە، کە چـوار هەزار کیلـۆمەتر لەمۆسـکۆو دوو سـەدو پەنجـا کیلۆمەتریش لەئیستگەی شەمەندەفەریشەوە دووربـوو، گونـدەکە پەتـای مەلاریا شەکەتی کردبوو، لەبەر زۆربوونو بەردەوامی لافاوو، ماوە ماوەش نەخۆشییەکانی وەک تاعونو گەڕبوونی تێدا بڵاودەبۆوە.

لەرۆژی ۲۰ ی مـانگی یەنـایەری سـاڵی ۱۹۲۹ ترۆتسـکی لەشـوێنە دوورخراوەکەیدا نوێنەرێکی پۆلیسی نهێنی رووسی سەردانی دەکات، ئەو لەوێ تاوانبـاری دەکـات کە بەرنـامەی هەیە بـۆ رووخانـدنی شۆڕشـی بەلشـەفییەکان، کـار دەکـات بـۆ پەیـداکردنی ئاشـوب بـۆ لاوازکردنـی سۆڤیەتییەکان، بـۆیەش بڕیـار دەدرێـت ئەو بـۆ دەرەوەی خـاکی کۆمـارە سۆڤیەتییەکانی ئیشتراکی دووربخرێتەوە.

لەمـانگی فبـرایەری سـاڵی ۱۹۲۹ دا ترۆتسـکی دەگـاتە شـاری قسـتەنتینییەو بەناچـاریو بەزۆر لەوڵاتەکەی دوور دەخـرێتەوە. پـاش ئەوەی حکومەتی فەرەنسی رازی دەبێت ئەو پێ بنێتە ناو خاکەکەیان لەساڵی ۱۹۳۳ ترۆتسکی دەگاتە فەرەنسا، پاش دوو ساڵ دەچێتە نەرویـژو لەوێ دەژیـت. ترۆتسـکی کە لەدەرەوە ژیـاوەو وڵات وڵات گەڕاوەو سـتالین ناچاری کردبـوو بەئاوارەیی بژیـت، ئەویـش بەردەوام رەخنـەی گرتـووەو رکـابەرایەتی سیاسـەتەکەی سـتالینی کـردووەو بەرنـامەی حـوکمەکەی شـەرمەزارکردووە، تـا ئەوەی وتبـووی سـتالین بەژەهـر لینینـی کوشـتووە، بـۆیەش چەنـدین جار کۆشـش کـراوە لەدەرەوەی وڵات ترۆتسـکی تیـرۆر بکەن.

# فەرمانی لەسێدارەدانەکە

لەمانگی ئوگستی ساڵی ١٩٣٦و یەک مانگ پاش هەڵگیرسانیی شەڕە ناوخۆییەکەی ئەسپانیا، ستالین بەناوی دادگای پاکسازیی دادگایەکی دامەزراندبوو بۆ لێپرسینەوەو دادگاییکردنی نەیارەکانی، یەکەم کەس ئەو دادگایە لێپرسینەوەی لەسەر ترۆتسکیو کوڕەکەی دادەنێت، کە دادگاکە سەیری دۆسیەیەکەیان دەکات بڕیاردەدات سزای لە سێدارەدانیان بۆ دەربکات، ئەودەمانە هەردووکیان لە وڵاتی نەرویژو لە تاراوگەدا دەژیان، بۆیە ش سەفیری سۆڤیەت لە نەرویژ داوا لە حکومەتی نەرویژ دەکات ترۆتسکیو کوڕەکەی لە وڵاتەکەی خۆیدا دەربکات، بەڵام دەسەڵاتدارانی نەرویژ نەک هەر دەریان ناکەن، هەردووکیانو هاوسەرەکەی دەگوازنەوە گوندێکی لاچەپی دووری پایتەخت، بۆ پاسەوانیو سەلامەتی ئەو دوورخراوانەش ١٥ سەربازیش تەرخان دەکات، ئاگاداریان دەکاتەوە کە بەهیچ شێوەیەک بۆتان نییە لەو خانووە دەربچنو دیمانەش بەکەسی تری ناکەن، بەڵام وەزیری دادییەکەیان (تریجفی لی) لەبەر بوونی دۆستایەتی پتەوی کۆن بەترۆتسکی سەردانیان دەکات. هونەرمەندی نیگارکێشی مەکسیکی ناودار (دیگو ریڤیرا) داوا لە سەرۆکی مەکسیکی کاردیناس دەکات هاوڕێیە خۆشەویستەکەی ترۆتسکی داوەتی مەکسیک بکاتو مافی سیاسی پەنابەریشی پێ بدات، چونکە ئەو زۆر بە کەسایەتی ترۆتسکی سەرسام دەبێت، بۆیە سەرۆکی مەکسیکی قسەو داواکەی هونەرمەندەکە

ناشکێنێتو بەبێ دوودڵی ترۆتسکی بانگهێشتی مەکسیک دەکات.

ترۆتسکی داوا لەحکومەتی نەرویج دەکات سەلامەتی خۆیو هاوسەرەکەیو هەموو کەلوپەلەکانی بپارێزێت، بەڵام ئەوەیان ماوەیەکی زۆر ناخایەنێتو لەسەر داوای خۆی لەرۆژی ۱۹ ی مانگی دیسمبەری ساڵی ۱۹۳٦ ترۆتسکیو هاوسەرەکەی بەبارهەڵگری پترۆڵی دەریایی لەگەڵ ئەفسەرێکی پۆلیس دەگەیەنێتە مەکسیک، لەرۆژی ٦ ی مانگی یەنایەری ساڵی ۱۹۳۷ هەموو بەیەکەوە دەگەنە مەکسیک، لەوێ لەلایەن دەستەیەک لەهاورێیەکانیو هونەرمەند دییگوو هاوسەرەکەی پێشوازییەکی گەرمی لێ دەکرێت.

پێش ئەوەی ترۆتسکی بگاتە مەکسیک ژنێک بەناوی (کاریداد) کە بەنەژاد کوبی بووە، ئەو لەگەڵ مێردە ئەسپانییەکەیو رامۆنی کوڕی دەگەنە مەکسیک، ئەو ژنە رۆڵی لەشەڕی ناوخۆی ئەسپانی زۆر کاریگەربووە، هاوشانی کۆمۆنیستیەکان بووەو شەڕی باشی بۆ کردوون، زۆر لەگەڵ ترۆتسکییەکاندا توندبووە، بەدەستی خۆی بیست کەسی لەوان کوشتووەو زۆریش لەنیشانەشکێنیدا شارەزابووە، لەوەشاندنی خەنجەریش دەستگەرەو چاپووک بووەو لەدووری دە مەتردوە نیشانەی پێکاوە، ئەو لەگەڵ سەرۆکی موخابەراتی سۆفیەتی دۆستایەتیو پەیوەندی گەرمی هەبووە، بۆیەش لەو دەزگایەدا پلەو پایەیەکی باڵای پێدراوەو دەستی رۆیشتووە. رامۆنی کوڕەکەی کاریداد دۆستایەتی لەگەڵ ترۆتسکی خۆش دەکات، بەئاسانیش هەواڵەکانی ئەو سەرکردەیە دەگەیەنێتە مەڵبەندی جاسووسی سۆفیەتی لەنیویۆرک.

# قەڵایەكی قایم

لە ئێوارەی رۆژی ٢٤ی مانگی مایۆی ساڵی ١٩٢٧ ترۆتسكی لە هەوڵێكی كوشتن دەربازی دەبێت، كە دەستەیەك بەتفەنگو نارنجۆك هێرش دەكەنە سەر خۆیو هاوسەرەكەی، ئەگەرچی هێرشو ئاگرەكە زۆر سەخت بوون، دەربازبوونیشیان ئاسان نەبوو، بەڵام زۆر بەختیار دەبێت كە لەو هەوڵە رزگاری دەبێت.

پاش ئەو هەوڵە ئاگرینە بۆ كوشتنی ئەو دۆستەكانی ترۆتسكی لەولایەتە یەكگرتووەكان زۆر نارەحەت دەبنو بیر لەوە دەكەنەوە كە چۆن ترۆتسكی ماڵەكەی دووبارە ساز بكاتەوە بەمەرجێك گیانی تێدا پارێزراو بێتو ماڵەكەی ببێتە قەڵایەكی سەختو قایم، بۆیە ئەركو بەرنامەی چاككردنەوەی خانووەكەی لەسەر شێوازی قەڵایەكی قایم، دەسپێرنە ئەندازیارێكی شارەزاو پسپۆڕ لەسازكردنی قەڵاو سەنگەرە سەربازییەكان، بۆ زۆر سەلامەتی ئەو شوورەیەك بەبەرزی بیست مەتری لە چواردەورەی ماڵەكەی دروست دەكەن، بنمیچی خانووەكەو ئەرزەكەی وا ساز دەكەن بەرگری هەموو تەقینەوەكان بكات، دەرگاكان پۆڵاڕێژ دەكەن، تاوەری چاودێری دادەمەزرێنن، لەسەر شوورەكەدا تەلبەندی دڕو كارەبایی دادەنێن، هەروەها ژمارەی پاسەوانەكانیش زۆرتر دەكەنو هەموشیان باش دەستنیشان دەكەن، لەسەر پاسەوانەكانیش چاودێری وردو زۆر وریا دادەنێن.

# کۆتاییە حەتمییەکە

لەودەمانە پەیوەندیو دۆستایەتی ترۆتسکیو هاوسەرەکەی بەرامۆنو دەستگیرانەکەی خۆشو گەرم دەبێت، زۆرو بەردەوام یەکتری دەبینن، بۆیەش ترۆتسکی کوێرانە بڕوای زۆریان پێدەکات. لەرۆژی ۱ ی مانگی ئۆگستی سالی ۱۹٤٠ رامۆن وتارێک بۆ بلاوکردنەوە دەنووسێت، پێش ئەوەی بلاوی بکاتەوە حەز دەکات وتارەکە بەترۆتسکی نیشان دەدات تا چاوێکی پێ دابخشێنێتەوەو سەرنجەکانی بۆ تۆمار بکات، بەوەش ئەو بەتەنها لەنوسینگەکەی خۆیدا بەیەکەوە تەنیا دەبن، ئەوەش بۆ رامۆن دەبێتە یەکەمین بوارو دەرفەت بۆ کوشتنی ترۆتسکی. لەرۆژی ۲٠ی مانگی ئۆگستی هەمان سالْ رامۆن دەچێتە مالەکەی ترۆتسکی، بەیەکەوە لەنوسینەگەکەی دادەنیشن، کە رامۆن دەچێتە ژوورەکەی دەبینی ئەو خەریکی خوێندنەوە دەبێت، لەگەلْ خوێندنەوەی کتێبەکەی خەریک بوو، زۆر ئاگای لەمیوانەکەی نابێت، بۆیەش رامۆن ئەوە بەدەرفەت دەزانێتو لەبن پالتۆکەیدا تەورداسە سەر بەقامەکەی دەردەهێنێت، زۆر بەخێرایی زەبرێک لەسەری دەدات، لێدانەکە زۆر بەهێز دەبێت، بۆیە تەواوی کەللەسەری دەبڕێت. ترۆتسکی پاش ئەو لێدانە بەهێزە دەتوانێت هەلبستێتەوەو بگاتە سالۆنی پێشوازیی، بەلام خەلتانی خوێن ببوو، لەو دەمانەش رامۆن دەیویست نەرم نەرم بۆی دەربچێت، بەلام پاسەوانەکان دەتوانن پاش ئەوەی زەبرێکی لێ دەوەشێنن، دەستگیری دەکەن، بەخێرایی ترۆتسکی دەبەنە نەخۆشخانە، دکتۆرەکان

ئەشتەرگەری بۆ دەکەن، بەڵام ئەو لەبەر گەورەیی برینەکەی تەنها ٢٦ سەعات دەژیتو لە رۆژی ٢٦ی مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩٤٠ کۆچی دوایی دەکات.

دەسەڵاتدارانی مەکسیکی رامۆن دەستگیر دەکەن، ستالینیش لەلایەن خۆیەوە مەدالیای پاڵەوانی یەکێتی سۆڤیەتی پێ دەبەخشێت، ماوەی شەش مانگ شارەزایانی لێکۆڵینەوەو مامۆستایانی سایکۆلۆژی کۆششی لەگەڵدا دەکەن، بەڵام ئەو دان بەهیچ دانانێتو زانیارییەکان نادرکێنێت کە ئەو بۆ بەرژەوەندی کێ ترۆتسکی کوشتووە، ناوی کەسە هاوکارەکانی ئاشکرا ناکات، ناوی راستەقینەی خۆیو زیندو زانیارییە تایبەتییەکانی نالێت. پاش تێپەربوونی بیست مانگ بەسەر تیرۆرکردنی ترۆتسکی رامۆنی تاوانبار لەرۆژی ١٧ ی مانگی ئەپریلی ساڵی ١٩٤٢ لە دادگا هۆکاری راستی تاوانەکە بەدادگا رادەگەیەنێت، دادگاش زیندانی ١٩ ساڵی بۆ دەبڕێتەوە. پاش چەند ساڵێک پۆلیسی نهێنی ئیسپانی راستی کەسایەتی رامۆنو دایکی دەزانن، بۆیەش دایکی بۆ پاریس دوور دەخەنەوە، ئەویش لەوێ لەژێر چاودێری پۆلیسی فەرەنسییەوە ژیان دەباتەسەر.

هەموومان دەزانین کە فیلمەکانی (وەڵامی دڵەکەم)و (خاکی دوورووپی)و (لە نێوان شوێنەوارەکاندا)و (تاڵییەکان)و (من دوور کەوتمەوە)و (ئێمە درگ ناڕوێنین)و چەندین فیلمی دیاری تر لە سینەمای عەرەبییدا لە نووسینی ئەدیبی ناوداری میسری یوسف ئەلسوباعی بووە، ئەوەی کە قەدەر لەدەرەوەی وڵاتەکەی رووبەڕووی چارەنووسێکی ناخۆشی دەکاتەوە.

لە رۆژی هەینی هەڤدەی مانگی فبرایەری ساڵی ١٩٧٨دا یوسف ئەلسوباعی وەزیری رۆشنبیری کە لە ولایەتە یەکگرتووەکانەوە دەگاتە نیکۆسیای پایتەختی قوبرس، ئەو سەرۆکایەتی وەفدێکی میسری لە کۆنگرەی هاوکاریی ئەفرۆئەسیوبی شەشەمی دەکرد، ئەو کۆنگرەیەی لە بەرژەوەندی کێشەی رەوای فەڵەستینییەکان دەبەسترا، ئەویش وەک سکرتێری گشتی کۆنگرەکە ئامادەبوو، لە فڕۆکەخانەکەی قوبرس سەفیری میسری حەسەن شاش ئامادە دەبێت، لەو سەفەرەدا ئەلسوباعی نەیدەزانی قەدەرەکان چی بۆ شاردوتەوەو لەوێ چارەنووسی بەو رۆژە رەشەی دەبات.

لە بەیانی رۆژی دوایی رێکەوتی ١٨ ی نۆڤەمبەر نزیکەی سەعات یازدە یوسف ئەلسوباعی لە ژوورەکەی خۆی لە نهۆمی پێنجەمی هوتێلی هیلتۆندا دادەبەزێتە نهۆمی خوارەوە، کە کارەکانی کۆنگرەکەی تێدا دەبەسترا، سەرۆکایەتی کۆنگرەکەش لەلایەن دکتۆر فاسوس لیساریدسی جێگری سکرتێری رێکخراوەکەو سەرۆکی حزبی ئیشتراکی قوبرس بەرێوە دەچوو. پێش ئەوەی ئەو بگاتە ساڵۆنەکە لە پێش کوشکی کتێبو رۆژنامەفرۆشەکەی تەنیشت ساڵۆنەکە دەوەستێت، لەودەمانەدا تەقەی لێ دەکرێتو سێ گوللەی بەسەری دەکەوێت، پێش ئەوەی بگەیەندرێتە

ئەخۆشخانەو هەر لەوێ گیانی دەردەچێتو یەکسەر دەمرێت. هەواڵی تیرۆرکردنی یوسف ئەلسوباعی زۆر بەخێراییو بەسەرسامییەوە بڵاودەبێتەوەو میسرییەکان هەواڵەکە بەشۆکەوە وەردەگرن، زوو پرسیارو گومان لەو دەستە دەکرا کە ئەلسوباعی کوشتووە، گومان لەدەسەڵاتدارانی قوبرس کرا، وتیان دەستی ئەوانی تێدایە، زوو میسرییەکان وتیان هەر وڵاتێک کۆنگرەیەک ساز بکات دەبێ دابینی سەلامەتی بەشداربووەکان بکات، میسرییەکان لەبەر ئەو رەوشەی میسر تێدابوو کە تازە رێکەوتنی ئاشتیان لەگەڵ ئیسرائیلدا مۆرکردووە، دەبوایە حاڵەتی پاراستنی ئەوان تایبەتی بووایەو رەچاوی هەموو پێشهاتەکان کرابووایە، چونکە سەردانەکەی سەرۆکی میسری ئەنوەر ئەلسادات بۆ قودس جێگەی رەوانینو مەترسی بوو. هەردەم ئەوو ئەندامانی وەفدەکەی کە ئەو سەردانەیان کردبوو، ژیانیان لەمەترسی دابوو.

لەرۆژی ١٩ ی فبرایەری ساڵی ١٩٧٨ مەراسیمی بەرێکردنی تەرمەکەی یوسف ئەلسوباعی بەئامادەبوونی سەرۆک ئەلساداتو جێگرەکەی حوسنی موبارەکو وەزیری بەرگری موحەمەد عەبدولغەنی ئەلجەمسی سازکرا. لەرێورەسمی جەنازەکەدا کاردانەوەی میللیو رەسمی دژ بەکێشەی فەلەستینییەکان باسکرا، دەزگاکانی راگەیاندنی میسری هەڵمەتێکی درو توندیان دژ بەفەلەستینو مەسەلەکەی کرد، ئامادەبووانی مەراسیمی شاردنەوەی تەرمەکەی دروشمی دژ بەفەلەستینیان دەوتەوەو هەموو سنوورەکانیان دەبەزاند، بۆیەش سەرۆک ئەلسادات بڕیاردەدات هەموو فەلەستینییەکان لەمافەکانی هاوڵاتیبوون بێبەش بکات، ئەو مافانەی زووتر لە میسر هەیانبوو لێیان وەرگیرێتەوە، چونکە سەرۆکی پێشوو

جەمال عەبدولناسر لەساڵی ١٩٥٤ەوە زۆر لە مافەکانی بۆ فەڵەستینییەکان دەستەبەر کردەوە.

## ڕێکخراوی ئەبو نیزال

ڕێکخراوی ئەبو نیزال بەرپرسییەتی خۆی لە تیرۆرکردنی ئەلسوباعی ڕادەگەیەنێت، دووبارە ئەو پرسیارە کرایەوە، ناسنامەی ئەبو نیزالو هاوکارییەکانی چییەو ناسنامەی ئەوانەی یارمەتی دەدەن پرسیارو گومانی زۆر پەیدا دەکرد.

ئەبو نیزال ناوی راستەقینەی سەبری ئەلبەنایەو لەرۆژی ١٦ ی مانگی مایوی ساڵی ١٩٣٧ لە دایکبووە، لەسەرەتای کاری سیاسی دەچێتە ناو ڕیزەکانی ڕێکخراوی رزگاریخوازی فەڵەستینی، ئەبو ئەیاد لەساڵی ١٩٦٨ ئەو دەکاتە نوێنەری ڕێکخراوەکە لەخەرتوم، پاشان دەگوازرێتەوە عێراق، ئەو لەساڵی ١٩٧٤ لەبزاڤی ئەلفەتح جیادەبێتەوەو ڕێکخراوی (بزاڤی فەتحی ئەنجوومەنی شۆڕشگێر) ڕادەگەیەنێت، بۆیەش یاسر عەرەفات بڕیارو سزای لە سێدارەدانی بۆ دەبڕێتەوە.

ئەبو نزال لە نێوان سوریاو عێراقو لیبیا دەسوڕێتەوە، ئەوەدەمانەی ئەلسوباعی دەکوژرێت کۆمەڵەو دەستەکەی ئەو لەعێراقدا بوون، حکومەتی عێراق هەموو پێداویستییەکانی بۆ دابینکردبوون، ئەویش لەو وڵاتەدا دەمێنێتەوە تا بەدەستی ئەوانیشەوە دەکوژرێت.

لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٢ تەرمەکەی ئەو بەکوژراوی لە پێش شوقەکەی

لە بەغـدا دەدۆزرێـتەوە بەگـوللەیەک کوژرابـوو کە لەسـەری درابـوو. کە هەواڵی کوشتنەکەی بڵاودەبێتەوە حکومەتی عێراقی وتبووی ئەو خۆی کوشـتووە، بەڵام هەمـوو بەڵگەکـان ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو بەدەسـتێکی نادیـار کـوژراوە. ئەبـو نیـزال چارەنووسـەکەی دیـاربوو کە ڕۆژێـک دێ هەر دەکوژرێـت، چـونکە ئەو سـەدان ڕەنـگە هەزارەهـا کەسـی فەڵەسـتینی بەفەرمانی ئەو بکوشـتن درابێت، لەبەرامـبەر ئەو هەمـوو کوشـتنەدا، ئەو لەژیانیدا یەک کەسی ئیسرائیلیشی نەکوشتووە.

ئەوانەی یوسـف ئەلسـوباعیان لە قـوبرس کوشـت دوو کەس بـوون، یەکێکیان فەڵەستینیـو ئەوی تریـان عێراقی بـووە، ئەوان دانیـان بەوەدا نـابوو کە ئەوان بـۆیە یوسـف ئەلسوباعی یـان کوشـتووە چـونکە ئەو لەگەڵ ئەلسـادات سـەردانی قودسی کردبوو، ئەوەش بە بۆچـوونی ئەوان کـارێکە دژایەتی کێشەی ڕەوای فەڵەستینییەکانە، بەڵام ڕێکخـراوی ڕزگـاریخوازی فەڵەسـتینی بێئاگـایی خۆیـان لەو مەسـەلەیە ڕاگەیانـد، بەڵام میـدیای میسـری سـوور دەبێـت لەسـەر ئەوەی ئەوانـیش لەو کوشـتنەدا دەسـتیان هەبووەو ئاگاداری بەرنامەکەش بوونە. ئەوەی هەموولایەک دەیـانزانی کە یوسـف ئەلسـوباعی یەکێـک بـووە لەوانەی بەرگـری لە کێشـەی فەڵەسـتینییەکان کـردووەو بەردەوام لەنووسـینەکانیدا دەنگـی هەبـووەو دەیـان وتـاری بـۆ سـەرکەوتنی کێشـەکەیان نووسـیوەو ڕۆمـانێکی بەنـاوی (ڕێگـای گەڕانەوە) ی بـاس لەو کێشـەیە دەکـاتو بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ لەگەڵ گەڕانەوەی ئـاوارە فەڵەسـتینییەکان بـووەو بەرگـری لێکـردووەو بەردەوام پشتیوانی لەو کێشەیە کردووە.

# فڕاندنی فڕۆکەیەک

کە دوو بکوژەکە تاوانەکە ئەنجام دەدەن، ئەندامانی وەفدی هاوکارەکە وەک دیلو دەستبەسەر لەناو کافتیریای هوتێلەکە دەگرن، هەڕەشەیان لێدەکەن کە بەنارنجۆک هەموویان دەکوژن، ئەوان داواکاربوون دەسەڵاتدارانی قوبرسی ئۆتۆپاسەکەی فڕۆکەخانەیان بۆ دابین بکەنو بگەنە فڕۆکەخانەکەو لەوێش فڕۆکەیەکیان بۆ دابین بکەن تا دەربازیان بێتو لەو وڵاتە دەرچن، ئەگەر ئەوەشیان بۆ نەکەن ئەوا دەستبەسەرەکان دەکوژن.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو ئەوان داوایان کردبوو ئەوانەی عەرەبن، دەتوانن لە کافتیریاکە بچنە دەرەوە، ئەوان ئەو کەسانەیان دەوێت کە عەرەب نین، کە قسەو داواکانیان تەواو دەکەن زوو فتیلەی نارنجۆکەکانیان دەردەهێننو هەڕەشەی تەقینەوەیان کردبوو، بۆیەش دەسەڵاتدارەکانیان ناچارکردبوو بە پەلەداواکانیان جێبەجێ بکەن.

سەرۆکی کۆنگرەکە بەتەلەفۆن راستی رووداوەکەو داواکاری دەستە بکوژەکە بەوەزیری ناوخۆی قوبرسی رادەگەیەنێت، بۆیەش ئەو زووو یەکسەر دەگاتە شوێنی رووداوەکەو دوو کەسە بکوژەکە ئەویش دەستبەسەر دەکەن، داوایان لە گیراوەکان کردبوو بەملپێچەکانیان هەر کەسە دەستی هاوڕێیەکی تەنیشتی توند ببەستێتەوە، بەو شێوە شەرمەزارییە لەناو سالۆنی خواردنەکە دەردەچن، بەهەڕەشەی چەکو کوشتن گیراوەکان دەگەیەنە ئۆتۆپاسەکان، کە زووتر بەرپرسە قوبرسییەکان بۆیان دابینکردبوون.

دەسـەڵاتدارە قوبرسـییەکان هەمـوو داواکانیـان جێبەجـێ دەکەن، بەرنامەکە ساز دەبێت تـا بەفڕۆکەیەکی قوبرسی جۆری DC ٨ هەردوو بکوژەکە لە قوبرسەوە بفڕن، ئەوانیش بێجگە لەیازدە کەس، دیلەکانی تـر ئـازاد دەکەن، لەوانە چـوار کەسـیان هـاوڵاتی میسـری بـوون، سـەرەتا فڕۆکەکە بەرەو تەرابولسی خۆرئاوا دەفڕێت، بەڵام سەرۆکی لیبی موعەممەر ئەلقەزافـی رازی نابێـت وەریانگرێـت، بـۆیە فـڕۆکەکە روو دەکـاتە وڵاتـی سـوریا، لەوێـش لەدیمەشـق بـوار نـادەن فـڕۆکەکە بنیشـێتەوە، بـۆیە دوو بکـوژەکە بەفـڕۆکەنەکە دەڵـێن بەرەو عەدەن بفڕێـت، لەوێ پیلـۆتەکە بەکارمەندانی فڕۆکەخـانەکە دەڵێـت مـن سووتەمەنی بەردەوامی فـڕینم نەماوە، بۆیە ناکرێ لەو فڕۆکەخانەیەدا نەنیشم، من ناچارم دەبێ لێرە بنیشم، بەڵام کاربەدەستانی فڕۆکەخـانەکە بـۆ نەنیشتنەوەی فـڕۆکەکە بەربەست رێز دەکەن، تا فڕۆکە رفێنـدراوەکە نەنیشـێتەوە. کە فـڕۆکەکە هـیچ بـواری نیشـتنەوەی نابێـت بەناچـارییەوە لە جیبـۆتی (سـۆماڵی فەرەنسـی) لە گۆشـەیەکی لاچەپـی فڕۆکەخـانەکە دەنیشـێتەوە، ئەودەمـانەی ئەو دەنیشـێتەوە دوا دڵـۆپە بەنزینیـان دەمێنێـت. لەوێـیەوە ئەوانەی فڕۆکەکەیـان فڕانـدبوو پەیوەنـدی بەچەنـدین فڕۆکەخـانەی جیهـان دەکەن تـا بواریـان بـدەن لە یەکێـک لە فڕۆکەخانەکانی ئەوانـدا بنیشنەوە، بەڵام ئەوان هیچ رەزامەندییەک لە فڕۆکەخانەکان وەرناگرن، پەیوەندییە بێتەلەکانیان سوودی نابێت، بۆیە فڕۆکەکە پـاش وەرگرتنـی رەزامەنـدی سـەرۆک کۆمـاری قوبروسـی بەناچـاری دووبـارە دەگەڕێـتەوە فڕۆکەخانەی لارنەکا لە قوبروس.

# کارێکی سەرنەگرتوو

کە سەرۆک ئەنوەر ئەلسادات دەزانێت وەزیردکەیان لە قوبروس کوژراوە، بە فڕۆکەیەکی تایبەتی دەستەیەک چەکداری کۆماندۆز ڕەوانەی قوبرس دەکات، تا هەردوو بکوژەکە بگرنو دیلە میسرییەکانیش ئازاد بکەن، سەعات شەشی ئێوارە پیلۆتی فڕۆکە سەربازییە میسرییەکە قسە لەگەڵ فڕۆکەخانەی قوبروس دەکات، کە فڕۆکەکەیان وەفدێکی بە سەرۆکایەتی وەزیرێکی میسری بۆ دانوستان لەگەڵ دوو بکوژەکەدا هەڵگرتووە، تا دیلەکان ئازاد بکەنو مەسەلەکە بەدانوستان چارەسەر بکەن.

سەرۆکی قوبرسی سیبرۆس کابریانۆ خۆی دەگاتە فڕۆکەخانەکەی لارنەکا، دەیەوێ لە تاوەری چاودێرییەوە ئاگاداری دانوستانەکەی نێوان رفێنەرەکانو لایەنەکانی تری بەرامبەریان بکات، سەفیری میسر لە قوبروس حەسەن شاش دەگاتە ناو فڕۆکەخانەکە تا پێشوازی لە وەزیرە میسرییەکە بکات کە بۆ دانوستان هاتووە، سەفیرەکە وەزیرێکی قوبرسیشی لەگەڵدا دەبێت، پێشوازیکەرەکان سەرسام دەبن کە فڕۆکەکە لەسەر شۆستەی فڕۆکەخانەکە دەنیشێت دەبینن فڕۆکەکە فڕۆکەیەکی جۆری سی ۱۳۰ سەربازییە، کە دەرگاکەی دەکرێتەوە سەربازێکی کۆماندۆز بۆ پشکنینی ناوچەکە دادەبەزێت، بۆیە زوو قوبرسییەکان هەست دەکەنو تێدەگەن کە فڕۆکە میسرییەکە دەستەیەک چەکداری کۆماندۆزیان هەڵگرتووەو هیچ وەزیرو وەفدی دانوستانیان لەگەڵدا نییە، بۆیە دەسەڵاتدارانی قوبروسی هەڕەشە لە دەستە چەکدارە میسرییەکە

دەکەن کە بەهیچ شێوەیەک ئەومیان قبوڵ نییە بۆ رزگارکردنی دیلەکانو گرتنی بکوژەکانی وەزیرە میسرییەکە هێرش بکەنە سەر فڕۆکە قوبرسییەکە. سەفیرە میسرییەکە لەگەڵ وەزیرە قوبرسییەکە دەچنە ناو فڕۆکە میسرییەکە، یەکێک لە ئەفسەرە کۆماندۆزەکان پێشوازییان دەکات، ئەو پرسیاری مولحەقی سەربازی میسری لەقوبرس دەکات، ئەفسەرەکە راستەوخۆ راستی مەسەلەو بەرنامەکەی خۆیان بەسەفیرو وەزیرەکە دەڵێت، کە ئەوان هاتوون دیلەکانی ناو فڕۆکە قوبرسییەکە ئازاد بکەن. سەفیری میسر دەگاتە لای سەرۆک کۆماری قوبروسی کابریانۆ، بەڵام سەرۆکەکە زۆر تووڕەو ناڕەحەت دیار دەبێت، بۆیە بەسەفیرە میسرییەکە دەڵێت،

دیارە ئێوە هاتوون قوبروس داگیر بکەن!

سەفیرەکەش دەڵێت،

نەخێر میسر دەیەوێت دیلەکان ئازاد بکات!

بۆیەش سەرۆکی قوبروسی وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت،

ئێمە دەوڵەتێکی بەرێزین، ئێوەش لێرە بەو شێوە هەڵسوکەوت دەکەن...؟

سەفیرەکەش لەوەڵامدا دەڵێت،

من بەڵێن دەدەم کەس لەناو ئەو فڕۆکە میسرییە دانابەزێت ئەگەر ئێوە رەزامەندی ئەفەرموون، هەموو ئەندامانی تیمە کۆماندۆزەکە لە خزمەتی فەرمانی جەنابتاندا دەبن، ئێمە تەنها مەبەستمان ئازادکردنی دیلەکانەو گرتنی بکوژەکانەو بەس.

بکوژەکان دانوستانیان لەگەڵ بەرپرسانی قوبرسی دەکەن،

لەکۆتاییدا دەگمەنە رێکەوتنێک کە هەردووکیان پاسپۆرتی سەفەری قوبرس وەربگرن بەرەو وڵاتی یۆنان بفرن، دیارە کە قوبرسییەکان بەو مەرجە رازی دەبن و خەریکی سازکردنی مەرجەکە دەبن، لەناکاو هێزە میسرییەکە هێرشێکی کتوپڕ دەکەنە سەر فڕۆکەکە.

ئۆتۆمبێلێکی جۆری جیب لەناو فڕۆکە میسرییەکە دادەبەزێتو بەرەو فڕۆکەکە دەچێتو تەقەی لێدەکەن و ئاگر لەپێشەوەی فڕۆکەکە بەردەدەن، لەئەنجامدا تاقمی فڕۆکەکە دەکوژن، هێزە میسرییەکە بەرەو تاوەری فڕۆکەخانەکەش دەچن، کە لەوەدەمانەدا سەرۆکی قوبرسی لەوێدا بوو، کە تەقەش دەکەن سەرۆکیش دەترسێنن. بۆیە پاسەوانی نیشتیمانی قوبرسی و میلیشیا حزبییە چەکدارەکانیش تەقە لە هێزە میسرییەکە دەکەن و شەڕێکی دژوار روو دەدات کە ماوەی ٥٠ دەقە درێژەی دەبێت، لەو شەڕەدا فڕۆکە میسرییەکە ئاگر دەگرێتو دەسوتێت، پازدە سەربازی هێزە کۆماندۆزەکەش دەکوژرێن، لە هەردوولاش نزیکەی ٨٠ کەسیش بریندار دەبێت، گۆڕەپانی فڕۆکەخانەکە بەتەرمو جەستەی برینداری میسرییەکان دادەپۆشرێت، ئەوانەی ناکوژرێن بەزیندوویی دەگیرێن.

لەبیرەوەرییەکانیدا دکتۆر پوترس غالی ئەو کارە زۆر بەتوندی شەرمەزار دەکات، بەکارێکی نابەرپرس ناودەبات، هەموو دەزگاکانی میدیای جیهان بەچەندین شێوەش هەواڵەکە باس دەکەن، وەک هێرشێکی میسری بۆ سەر فڕۆکەخانەی لارنەکا، یان دەڵێن میسر پەلاماری قوبرس دەدات. ئەو کردەوەیە بە هەموو پێوەرەکان هەڵەیەکی گەورە بوو، ئەوەش یەکێکە لەو هەڵانەی سەرۆکی میسری ئەنوەر

ئەلسادات لە کاتی حکومگێڕانی خۆیدا لە میسر کردوویەتی.

## ئەنگژەیەکی سیاسی

بۆ بەیانییەکەیو پاش شەرەکەی فڕۆکەخانەی لارنەکا سەرۆک وەزیرانی میسری مەمدوح سالم داوا لەپوترس غالی وەزیری کاروباری دەرەوەی میسری دەکات سەردانی قوبرس بکات، لەوێ دانوستان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی قوبرسی بکات، لەگەڵ خۆیدا سەربازەکانی کۆماندۆزە گیراوەکانو تەرمی کوژراوەکانیش بهێنێتەوە میسر.

دکتۆر پوترس غالی دەگاتە قوبرس لەوێ بەدەسەڵاتدارانی قوبروس رادەگەیەنێت کە ئەو هاتووە پەیوەندییەکانی هەردوو وڵاتەکەیان دەرباز بکات، پاش پێنج سەعات لە دانوستان لەگەڵ سەرۆک کۆماری قوبرس رەزامەندی وەردەگیرێت کە ئەندامانی تیمەکە بگەڕێنەوە میسرو سەرۆکی وەفدە میسرییەکە بەقوبرسییەکان دەڵێت من زۆر مەبەستمە پەیوەندییەکانمان ئاسایی ببێتەوە.

لە رۆژی ٢٠ ی مانگی فبرایەری سالی ١٩٧٨و پاش بە رێکەوتنی فڕۆکەکەی پوترس غالی حکومەتی میسری بەرەسمی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی بەقوبروس دەبڕێت، دانپێدانانیش بەسەرۆکەکەیان دەستێنێتەوەو هەموو دەستە دبلۆماسییەکانیان لەو وڵاتە بەفەرمی لەنیقۆسیا دەکێشێتەوە، داواش لەقوبروس دەکەن دەستە دبلۆماسییەکانی خۆیان لە قاهیرە بکێشنەوە. لەفڕۆکەخانەی قاهیرە

ئەندامانی تیمە کەماندۆزەکە وەک کەسانی پاڵەوانو سەرکەوتوو پێشوازی گەرمیان لێدەکرێت، هەموویان لەلایەن سەرۆک ئەلساداتەوە ڕێزیان لێگیراوە مەدالیای شەرەفیان وەرگرتووە، بۆ کوژراوەکانیش جەنازەییەکی میللیان بەبەشداری سەرۆک ئەنوەر ئەلسادات بۆ سازدەکەن.

لەودەمانەی هێرش دەکرایە سەر فەلەستینییەکانو قوبرسییەکان، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی میسری باسی پاڵەوانیەتی دەستە کۆماندۆزەکەیان دەگێڕایەوەو باسی ئەو نەبەردییەیان بەشکۆو بەشانازییەوە دەکرد، لەبەرامبەریشدا ڕووی دووەمی دیمەنەکەش بەشکانو بەسەرنەکەوتنی چالاکییەکەو لاوازی بەرنامەکەو نەپێکانی مەبەستەکانی دەستە کۆماندۆزەکە باس دەکران، ئەوان دەیانووت ئەو هەڵمەتە ڕاگەیاندنە تەنها بۆ شاردنەوەو ڕووجوانی کارەکەو هەڵەکە بووەو بەس. کە حکومەت پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی لەگەڵ قوبروس دەکێشێتەوەو دانپێدانی میسریش بەسەرۆکی قوبروس دەستێنێتەوە، دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەشانازییەوە باسی ئازایەتیو لێوەشاوەیی سەرۆک ئەلساداتیان دەکردو زۆریش ئاماژە بەنەبەردییەکەی قوبروسیش دەکرا. لەگەڵ ئەو قسەو هەواڵو پێشهاتانەش باس لەوە دەکرا کە دەستەیەک لەئەندامانی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی هاوشانی هێزە قوبروسییەکان شەڕی دەستە کۆماندۆزەکەی میسریان لەناو فڕۆکەخانەی لارنەکا کردووە، لەو ڕۆژانەش وەزیری بەرگری میسری لەپێش پەرلەمانی میسری دان بەوەدا دەنێت کە، ئەو ڕووداوەی فڕۆکەخانەکە بەشێکە لەو پلانو بەرنامەی دژ بەسەروەری وڵاتی میسر بەڕێوە دەچێت.

چەند سەرچاوەیەکی فەلەستینی ئەوەیان درکاندبوو کە باسر

عەرەفات بڕیاری دابوو دەستەیەک لەتیمی ژمارە ۱۷ بەسەرپەرشتی عەقید ئەبو ئەلتەیب رەوانەی قوبرس بکات تا فەلەستینییە گیراوەکانی فرۆکەخانەکە ئازاد بکات، دیارە ئەوەش بەهاوکاری حکومەتی قوبرسی بووە، کە دەستەکە جلی سێرفیسو پیاوانی دەستەی خزمەتکردنو خواردەمەنی سازکردن لەبەر بکەنو بەبیانووی ئامادەکردنی خواردن بۆ ناو فڕۆکەکە هاوکاری بکوژەکان بکەن، بەڵام سەرۆکایەتی میسریو بەسەرپەرشتی راستەوخۆی ئەنوەر ئەلسادات ئەو پلانە هەڵدەوەشێنێتەوەو پلانەکە جێبەجێ ناکرێت.

لەرۆژی ۹ ی مانگی مارسی ساڵی ۱۹۷۸ دادگاییکردنی بکوژەکانی یوسف ئەلسوباعی دەست پێدەکات، بکوژەکان (زەید حوسێن عەلی)و (سەمیر محەممەد خزیەر) لەبەردەم دادگای قوبروسی ئامادە دەبن، دانیشتنەکە بە سەرۆکایەتی مودەعی گشتی قوبرسی دەبێتو دەستەیەک لە چاودێرانی میسریش لەوانە راوێژکار (عەدلی حوسێن) ئامادەی دانیشتنی دادگاییکردنەکە دەبوون، لەرۆژی ٤ی مانگی ئەپریلی ساڵی ۱۹۷۸ دا دادگای قوبرسی بڕیاری لە سێدارەدانیان دەردەکات. پاش چەند مانگێک لەدەرچوونی ئەو سزایە بەسەر بکوژانی وەزیرە میسرییەکە لەقوبروس سەرۆکی قوبرسی سیبرۆس کابریانۆ بەبڕیارێکی سەرۆکایەتی سزای لەسێدارەدانەکە بۆ حکومی هەتاهەتایی سووک دەکاتەوە، دیارە هۆکارەکانی سووککردنی ئەو سزایەش باس ناکەن، دەڵێن مەسەلەکە پەیوەندی بەوڵاتی قوبرسەوە هەبوو، لەچەند سەرچاوەیەکی دبلۆماسییەوە ئەوە ئاشکرا کرا کە قوبرسییەکان وتبوویان ئێمە لەچەندین سەرچاوە هەڕەشەمان لێکراوە، وەک هەڕەشەی رفاندنی

فرۆکەو ئەنجامدانی چالاکی تیرۆرکردنو کوشتنیش، لەوانە ڕێکخراوە عەرەبییەکان هەڕەشەی ئەوەیان کردبوو لەسەر خاکی قوبرس تۆڵەی خۆمان لەقوبرسییەکان دەکەینەوە ئەگەر ئەو بکوژانە ئازاد نەکەن. پاش ئەوەی مەسەلەکە سارد دەبێتەوە قسەی وا دەکرا، گوایە هەردوو بکوژەکەی ئەلسوباعی ڕەوانەی عێراق دەکرێنەوەو دەگەنەوە لای ئەبو نیزال، کە ئەو ماوەیە ئەو لەبەغدا دەژیاو لەوێ چالاکییەکانی دەنواند، دیارە ئەوەش مانای ئەوەیە ئەو دوو کەسە بەبێ ئەوەی سزا بدرێن ئازاد دەبن.

سەرۆکی قوبرسی بانگەوازێکی ئاراستەی سەرۆک ئەلساداتو هەموو سەرکردە عەرەبییەکانو سەرۆکی ڕێکخراوەکان دەکات، کە وڵاتەکەیان نەکەنە گۆڕەپانی ململانێی نێوان خۆیاندا، داواکارەو حەزدەکات قوبروس وەک وڵاتێکی دۆستی عەرەب بمێنێتەوە.

## یوسف ئەلسوباعی کێ بوو...؟

❖ یوسف ئەلسوباعی لەرۆژی ١٠ ی مانگی یونیۆی ساڵی ١٩١٧ لە دەڤەری سەیدە زەینەب لەقاهیرە لە دایکبووە، بنەماڵەکەیان ڕەوشیان مامناوەندی بوودو حەزیان لە ئەدەب بووە، باوکی محەمەد ئەلسوباعی زانا بووەو کتێبخانەیەکی گەورەی هەبووە، بۆیەش ئەو زوو چاوی لەناو ئەو کتێبانەدا کراوەتەوە زۆری خوێندووتەوە، بە تایبەتی کتێبی هەموو جۆری زانیاری و ڕۆمان، بۆیەش ئەو زوو ئارەزووی نووسین پەیدا دەکات،

ئەو کە لە قوتابخانەی ئەلخدیۆی بووەو تەمەنی چواردە ساڵان بووە یەکەم چیرۆکی لەساڵی ١٩٢١ بڵاودەکاتەوە.

❖ لە ساڵی ١٩٢٤ یوسف بەکالۆریا وەردەگرێت، لە ساڵی ١٩٢٥ پەیوەندیی دەکات بە کۆلیژی جەنگ لە ساڵی سێیەمییەوە پلەی جاویش وەردەگرێت، لە ساڵی ١٩٢٧ خوێندنەکەی لەوێ تەواو دەکات، لەبەرئەوەی پلەی یەکەمی بەدەست هێنابوو بۆیە بەپلەی ئەفسەر لە سوپای سوارچاکان دادەمەزرێتو دەبێتە سەرکردەی یەکێک لەتیپەکانی سوارچاکی، تا ساڵی ١٩٥٢ دەبێتە بەڕێوەبەری مۆزەی جەنگی لە قاهیرەو چەندین پلەی سەربازی وەردەگرێت.

❖ یوسف پاش هەڵگیرسانی شۆڕشی یولیۆ پۆستی سوپا جێدەهێڵێتو دەبێتە سکرتێری گشتی ئەنجوومەنی باڵای هونەرو ئەدەب، پاشان دەبێتە سەرۆکی کۆمەڵەی ئەدیبانو کۆمەڵەی رەخنەگرانی سینەماو دەبێتە سکرتێری گشتی کۆنگرەی هاوکاری ئەفروئاسیایی.

❖ لە کاروانی کاری رۆژنامەگەرییدا ئەو دەبێتە سەرنووسەری گۆڤاری (ئاخر ئەلساعە)و (ئەلمسوەر)و بەڕێوەبەری ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی (دار ئەلهیلال)و پاشان (ئەلئەهرام)، لە ساڵی ١٩٧٧ دەبێتە نەقیبی رۆژنامەنووسانو وەزیری راگەیاندنو رۆشنبیری میسری.

❖ لەبەرئەوەی سەرنووسەری رۆژنامەی الاهرام دەبێت بۆیە لەگەڵ ئەنوەر ئەلسادات لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٧٧ دەچێتە قودس، لەبەر ئەو سەردانەو ئەو سیاسەتە ئاشتیانەی حکومەتی میسر زۆربەی وڵاتانی عەرەبی بایکۆتی میسر دەکەن، ئەو دەستەو کۆمەڵە توندڕەوانەی دژ

بەدانوستانو ئاشتی بوون لەگەڵ ئیسرائیل، ناوی ئەو سەرکردەو ئەو کەسانەی ئەو سەردانەیان کردبوو، دەخەنە ناو لیستە ڕەشەکانو بە کوشتن داواکراو بوون.

❖ ڕێکخراوە فەڵەستینییە توندڕەوەکان بەرووونیو بەئاشکرا هەڕەشەی کوشتن لەو کەسانە دەکەن کە لەگەڵ ئەنوەر ئەلسادات سەردانی ئیسرائیلیان کردبوو، لەوانەی ناویان بۆ کوشتن هاتبوو، یوسف ئەلسوباعی بوو.

❖ کە کۆنگرەی هاوکاری ئەفروئاسیایی لە قوبروس دەگیرێت، زۆر لەسیاسییەکانو پیاوانی ئاسایش لەوانە سەفیری میسر لە قوبروس ئاگاداری یوسف ئەلسوباعی دەکەنەوە سەردانی ئەو وڵاتە نەکەن، دیارە گومانیان لە کوشتنی هەبووە، چونکە لەو دوورگەیە موخابەراتو دەزگاکانی مۆساد هێلانەیان کردبوو، ئەندامەکانی هاتوچۆیان بوو، لەوانەش ڕێکخراوە توندڕەوە فەڵەستینییەکانیش بوونیان هەبوو لەو دوورگەیەدا، بەڵام یوسف گوێ بەو قسانە نادات و سەفەرەکەی قوبروس دەکات، هەڕەشەکان ئەو ناترسێنێت، بۆیەش لەوێ دەکوژرێت.

# شا فەیسەڵ

## شا فەیسەڵ بووە قوربانی پترۆڵ یان لەبەر قودس کوژرا؟

لە رۆژی ٢٥ی مانگی مارسی ساڵی ١٩٧٥ وەلی عەهدی سعودی خالید کوڕی عەبدولعەزیز لە پەیامێکدا بۆ هاوڵاتیانی سعودیو جەماوەری نەتەوەی عەرەبیو ئیسلامی وتبووی:

هەمـوو ئیرادەکانمان رادەستی خوداو قەزاو قەدەرەکانی ئەو دەکەینو بە دڵنیکی بە خەمو ژانەوە، پرسەکەمان بە جیهانی عەرەبیو ئیسلامیو نەوەکانی میللەتەکەمان بە لەدەستدانی رۆڵەیەکی بەوەفامان بەرزامەندی خوداوە خاوەن شکۆ مەلیک فەیسەڵ کوڕی عەبدولعەزیز لە بەیانی رۆژی سێشەممەی رێکەوتی رۆژی ١٠ ٠٣ ١٣٩٥ ی کۆچی رادەگەیەنین، کە لەئەنجامی کردەوەیەکی دەستدرێژی دەکوژرێت، لە کاتێکدا ئێمە لەهەموو کاتێک زۆرتر پێویستمان بەسەرکردایەتیو حیکمەتو رێبەرایەتی دروستی ئەو هەبوو.

فەیسەڵی کوڕی عەبدولعەزیز ئال سعود ئەو پاش تورکیو سعود کوڕی سێیەمی شا عەبدولعەزیز بوو، ئەو حاکمی پازدەمینی ئال سعود بوو، سێیەمین کەسیش بوو لە دەوڵەتە نوێیەکەی سعودیە.

ئەو لەرۆژی ١٥ ی مانگی نۆڤمبەری ساڵی ١٩٠٦ ئەو رۆژەی شا عەبدولعەزیزی باوکی لە شەڕەکەی رەوەزەی ئەلمهنا سەردەکەوێت لە دایکبووە، ئەو شەڕ بوو کە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر لاوازکردنی بەرگرییەکانی ئال ئەلرەشید، تا بەگەورەیی ناوی بێت بەناوی باپیری باوکی کراوەتەوە.

ئەو لە سەردەستی چەند مامۆستایەکی بەتوانا زانستە سەرەتاییەکانی وەردەگرێت، زانستە ئاینییەکانیشی لەسەردەستی

سـەماحەتی شـێخ عەبـدوڵای کـوڕی عەبـدولەتیف ئـال ئەلشـێخ کە یەکـێکە بـووە لە گەورە زاناکـانی نەجـدی ئەوکـات وەردەگرێـت، ئەو لەنـاو بنەمـاڵەیەکی پابەنـد بەرێنمـاییە نەگۆڕەکـانی ئـاینو ڕێنمـاییە ئیسلامییەکان پەروەردە دەبێتو لە تەمەنی سێزدە ساڵییەوە قورئـان لەبەر دەکات، مەشق لەسەر سوارچاکیو ئەسپسواری دەکات، زوو فێری بەکارهێنـانی چەکـیش دەکرێـت، لە بـاوکی کە بەنازنـاوی هەڵـۆی دوورگەکە دەناسـرێت بۆچوونەکـانو ئەزموونەکـانو دەربڕینەکـانو ئاراستەکردنەکان فێردەبێت. لە ڕۆژی ١ی مـانگی ئۆگستی سـاڵی ١٩١٩ بـاوکی دەیکـاتە نماینـدەی خـۆی بـۆ پیرۆزبـاییکردن لە براوەکـانی جەنگـی یەکەمـی جیهانـدا، لەوێـدا سـەردانی فەرەنسـاو بەلژیکـا دەکـات. لەسـاڵی ١٩٢٩دا بـاوکی لەهێرشـەکانی سـەر (حایـل) دەوە وەک ئەمیرێکی سوپا بەشداری پێدەکات، پـاش ساڵێک بۆ تەمبێکردنـی دانیشـتووانی ئەلعەسیر سـەرکردایەتی دەسـتەیەکی پێدەسـپێرێت، ئەو بەخۆشـــییەوە کـــارەکە ئەنجـــام دەداتو ســـەرهەڵدانەکەی ئەو ناوچەیەش کپ دەکاتەوە.

لە ساڵی ١٩٢٥ لەگەڵ باوکییـدا بەشـداری لە گەمارۆییەکەی شـاری جەدە دەکـات کە پاشـان لە ڕۆژی ٢١ی مـانگی دیسـمبەری سـاڵی ١٩٢٥ خۆیـان دەدەنە دەسـت، بـۆیەش بـاوکی دەیکـاتە جێگـری خـۆی لە حیجازو سەرۆکی ئەنجوومەنی شوراش.

لەمانگی ئەپریلی ساڵی ١٩٢٧دا لەحیـاتی بـاوکی ئەو ڕێکەوتنەی مۆرکردووە کە بەریتانیا بەرەسمی دانـی تەواوی بەسـەربەخۆیی پاشـا عەبـــدولعەزیز دادەنێـــت، ئەوەش ڕێکەوتـــنەکەی ئەلعەقیـــر

هەڵدەوەشــــێنێتەوە کەمەلیـــــک عەبــــدولعەزیز لەســــاڵی ١٩١٥و لەسەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهاندا لەگەڵ بەریتانییەکاندا مۆری کردبوو.

* * *

لە ساڵی ١٩٢١ مەرسوومێکی پاشایەتی دەردەچێت کە فەیسەڵ دەکاتە وەزیری دەرەوە، لەساڵی ١٩٢٢یش دەبێتە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەکیل و شوراو مەڵبەندی ناوخۆیی و قەزاش بەو ئەنجوومەنە دەبەستێتەوە. لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٢٤دا فەیسەڵ دەبێتە سەرکردەی گشتی هێزەکانی سعودیە لە ناوچەکانی ئەلعەسیرو ئەلتهامە، تا ڕۆژی ٢٠ی مانگی ئەیاری ساڵی ١٩٢٤ ڕێکەوتنێک مۆر دەکرێتو تێدا یەمەن دان بەوە دادەنێت کە هەردوو ناوچەی ئەلعەسیرو ئەلتهامە بەشێکن لە خاکی مەملەکەتی عەرەبی سعودیە. لەسەر داوای حکومەتی بەریتانیا لەساڵی ١٩٢٨ لە لەندەن کۆنگرەیەک لە پێناوی فەلەستین دەبەسترێت، تێدا نوێنەرانی میسرو عێراقو یەمەنو سعودیە بەشداری تێدا دەکەن، لەوێ فەیسەڵ نوێنەرایەتی پاشای سعودیە دەکاتو پەیامی ئەو دەگەیەنێتە حکومەتی بەریتانی، لەپەیامەکەدا مەلیک داواکاربوو کە فەلەستینییەکان مافی ڕەوای خۆیانە لەسەر تەواوی خاکەکەیاندا دەوڵەتێکیان هەبێت، هەر لەوێش کۆچی بەردەوامی جوولەکەکانیش بەمەترسی دەزانێتو دەڵێت ڕەنگە ئەوەش ببێتە سەرەتای ململانێیەکی درێژخایەن لەسەر ئاستی دەولی.

لە ساڵی ۱۹٤۲ سەرۆکی ئەمریکی تیودور رۆزفلت داوەتی سەردانی مەلیک عەبدولعەزیز دەکات بۆ ئەمریکا، بەڵام مەلیک لە جیاتی خۆی هەردوو ئەمیر فەیسەڵو خالید رەوانە دەکات، لە رێگای گەڕانەوەیاندا سەردانی لەندەن دەکەنو لەگەڵ مەلیک جۆرجی شەشەم کۆدەبنەوە. لە رۆژی ۲٥ی مانگی ئەپریلی ساڵی ۱۹٤٥ ئەمیر فەیسەڵ بەناوی مەملەکەتی سعودی ئەو رێکەوتنەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لەسان فرنسیسکۆ سازدەبێت مۆر دەکات. لە ساڵی ۱۹٤۷ کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان خولێک لەسەر کێشەی دابەشکردنی فەڵەستین دەبەستێت، لەوێدا ئەمیر فەیسەڵ بەهەناسەیەکی نارەزاییەوە دژ بەدابەشکردنەکە وتارەکەی پێشکەش دەکات. کە مەلیک عەبدولعەزیز ئال سعود دامەزرێنەری مەملەکەتی عەرەبی سعودیە کۆچی دوایی دەکات، لەرۆژی ۹ ی نۆڤەمبەری ساڵی ۱۹٥۳ ئەمیر فەیسەڵ وەک وەلی عەهد ناودەنێن، لەرۆژی ۱٥ ی مانگی ئۆگستی ساڵی ۱۹٥٤ فەیسەڵ دەبێە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

فەیسەڵ لەساڵی ۱۹٥٥ بەشداریی دەکات لە کۆنگرەی باندونگ، لە کۆبوونەوەی نەتەوە یەکگرتووەکانو کۆبوونەوەی کۆنگرەی وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی عەرەبی لە ساڵی ۱۹٦۲ بەشدار دەکات. لە رۆژی ۲۹ی مانگی مارسی ساڵی ۱۹٦٤ بەبریاری زاناکانی مەملەکەتو میللەتەکە فەیسەڵ دەبێتە جێگری پاشاو هەموو دەسەڵاتەکانی پاشای پێ دەدەن، لە رۆژی ٥ی مانگی سێپتەمبەری ساڵی ۱۹٦٤دا بە سەرۆکایەتی وەفدێک دەگاتە کۆنگرەی لووتکەیی دووەمی وڵاتانی عەرەبی کە لە شاری ئەسکەندەریە لە میسر دەبەسترێت، لە رۆژی ۲۳ی مانگی ئۆکتۆبەری

ساڵی ١٩٦٤ بە مەلیکی سعودیە موبایعە دەکرێت.

رۆڵی مەلیک فەیسەڵ لە شەڕی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٣ بەڕوونی دەردەکەوێت، ئەو دکارێت وڵاتانی خۆرئاوا بەرەو دۆزی عەرەبیو فەڵەستینی رابکێشێت، بەوەی کە توانی پترۆڵ بکاتە چەکێکو شەڕەکەی پێ بکات، بڕیاریش دەدات هەناردەی پترۆڵ بۆ خۆرئاوا کەم بکاتەوەدو ئەوەش کاردانەوەیەکی ئیجابیو کاریگەری زۆری دەبێت، بۆیەش سەرۆک ئەنوەر ئەلسادات وتبووی:

فەیسەڵ پاڵەوانی شەڕی پەڕینەوە بوو، دەکرێ لە لاپەرەی یەکەمی مێژووی جیهادی عەرەبی ناوی ئەو بنووسرێتەوە، ئەوانە بوون سستییەکانیان هەژاند، چیتر چاوەڕوانی نەماو چاوەڕوانییەکان بەهێزشکردنەوە گۆڕا، ستایشەکەش هەموو بۆ ئەو دەگەڕێتەوەو ئەو خاوەن فەزلی یەکەم بوو، ئەو زەمینەی شەڕەکان بوو، ئەو بوو گەیشتە ڕێزەکانی یەکەمی پێشەوەی جەنگەکە، ئەو سووربوو لەسەر بەکارهێنانی چەکە ترسناکەکە، ئەو خەزینەکانی خۆیانی بۆ وڵاتە شەرکەرەکان کردەوە، ئەو وڵاتانەی سەرپشک کرد بۆ شەڕو پەڕینەوەکە چەند لە پارەی ئەو خەزێنەیە هەڵدەگرن، هەمووانی سەربەست دەکرد، بەئازایەتی ئەو شەڕی کەرامەت دەکرا، ئەو فەرمانی دابووە بە سێ بانکی گەورەی جیهان کە وڵاتی میسر ئازادە لەوەی چەند پارە دەردەهێنێتو، لەو شەڕەدا بەکاریدەهێنێت.

لەو رۆژانەدا یەکێک لە رۆژنامە گەورەکانی خۆرئاوا بەو شێوەیە پێناسەی ئەویان کردبوو:

ئەو هێزەی مەلیک فەیسەڵ هەیەتی دەتوانێ بەجووڵەیەک دەستی

هەموو پیشەسازیی ئەورووپیو ئەمریکیی راگریت، هەر ئەوەندە ناو بەس، بەڵکو بەچەند دەقەیەک ئەو دەتوانیت هاوسەنگییەکانی دراوی ئەورووپی بروخینیت، زیان بەفەرەنگو مارکو جونەیهی بدات، زەبریکیان لێ بوەشێنێت هەرگیز گورزی وایان نەدیبێت، ئەو پیاوە زراڤەی کە بەرێزو شەرمەوە لەسەر دووگردە سەر لمینەکە دادەنیشێت، دەسەڵاتی بەهیزی هەیە کە گۆڕانی زۆر گەورە بکات.

کە مەلیک فەیسەڵ پاش شەڕو سەرکەوتنەی ٢٠ ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٤ بۆ پیرۆزباییکردن سەردانی میسر دەکات، لەوێ ملیۆنەها کەس بەگەرمییەکی زۆر بەسۆزەوە پێشوازی دەکەن، ئەو لەناو دڵی موسڵمانو میسرییەکان خۆشەویستییەکی بێ وێنەی چاندبوو، ئەو پیاوە بوو کە هەموو ئیمکانیاتی سەربازیو ئابووری وڵاتەکەی خستبووە ژێر دەستی سەرکردایەتی میسری لە کاتی شەڕی پەڕینەوە مەزنەکە. لەو سەردانە مێژووییەدا مەلیک فەیسەڵ سەردانی شاری ئەلسویس دەکات، لەوێ شوێنەواری شەڕەکە دەبینێت، ئەو یەکەمین سەرکردەی عەرەب بوو کە پێی ناوەتە سەر ئەو خاکەی شەڕەکەی تێدا قەومابوو، سەردانی ئەو بۆ سینا هێمایەکی دیارو شکۆمەندبوو، ئەو لەوێ چاوی بەسەربازەکانی پەڕیوەکەی کەوتبوو، دەستخۆشی لە میسرییەکان کردبوو، لەدیار مەشقێکی سەربازی بەچەکی زیندوو دەوەستێت. لەوێ سەرۆک ئەنوەر ئەلسادات پێیوتبوو:

ئێمە کەناڵی ئەلسویسمان بەپێیەکانم بڕی، ئەوەش پاش ئەوە هات کە تۆ بەڵێنت داو بەڵێنەکانت هێنایە دی، بۆیە بەناوی خۆمو بەناوی میللەتی میسریو سەرکردایەتی سوپاکەمانو هەموو نەتەوەی

موسڵمانەكان سوپاس‌و ڕێز بە ئێوە ڕادەگەیەنم.

ماوەی دەسەڵاتی ئەو لە مەملەكەتەكە كە یازدە ساڵی خایاندووە، لەو ماوەیەدا لە هەموو جیهان ناوداری پەیدا دەكاتو زۆر دەناسرێت، لە هەموو ئەو سەكۆیانەی ئەو ئامادە دەبوو دەنگی دەبیسترا، بەتایبەتی لەسەر ئاستی عەرەبیدا، ئەو كەسایەتییەكی سەركردایەتی بەهێزی هەبوو، بۆیەش هەموولایەك ڕێزیان دەگرت، ئەوەی بەسەر خەڵكەكە سەپاندبوو، دەوڵەتە مەزنەكانیش هەزار حیسابیان بۆ ئەو دەكرد، هەڵوێستەكانی نەگۆڕبوون، بۆ دۆزی فەلەستینییەكان بەرنامەو هەڵوێستەكانی دیارو نەگۆڕ بوون، ئەو بەوە ناسرابوو كە بەرگری لەخاكە داگیركراوەكان دەكات، زۆریش غیرەی لەسەر ئیسلام هەبوو.

## كوشتنەكەی مەلیك

لە بەیانی ڕۆژی سێشەممەی ٢٥ ی مانگی مارسی ساڵی ١٩٧٥ مەلیك فەیسەڵ سەرقاڵی پێشوازی میوانەكانی دەبێت لە بارەگای سەرۆكایەتی وەزیران لە ڕیازی پایتەختدا، لەودەمانە وەزیری پترۆڵی كوێتی ئەلكازمی‌و وەزیری پترۆڵی سعودیەش ئەحمەد زەكی یەمانیش لەژووری چاوەڕوانیدا بوون، ئەمیر فەیسەل كوڕی موساعد كوڕی عەبدولعەزیزی برازای مەلیك فەیسەڵ دەگاتە ژوورەكەو داوا دەكات بچێتە ژوورەوەو سڵاوێك لە مامی بكات، ئەو لەگەڵ دوو وەزیرەكەی پترۆڵ دەچێتە ژوورەوە، مەلیك فەیسەڵ بۆ پێشوازیكردنیان بەپێوە وەستابوو، لەناكاو

ئەمیر فەیسەڵ دەمانچە شاراوەکەی ناو جلەکانی دەردەهێنێتو سێ گوللەلەمەلیک دەداتو دەیکوژێت، بەمردوویی دەگەیەنرێتە نەخۆشخانەی ناوەندی رەیاز. پاش ٨٢ رۆژ لەدادگاییکردنی بکوژەکە لە رۆژی ١٨ی مانگی یونیۆی ساڵی ١٩٧٥ بریارەکەی دادگا بەسەر بکوژەکە جێبەجێ دەکەنو بەشیر سەری دەبەرێنن.

# ئایا کوشتنەکەی پلان بوو...؟

لەسەر کوشتنەکەی مەلیک فەیسەڵ چەندین راو بۆچوون لەلایەن توێژەرەکانو نووسەرانو ئەندامانی بنەماڵەکەیانەوە دەگوترا، هەندێک وتیان فەیسەڵ بۆیە مامی کوشت چونکە براکەی ئەو ئەمیر خالید کوڕی موساعد بەدەستی ئاسایشی سعودی کوژرابوو، ئەویش بەو شێوەیە تۆڵەی براکەی دەکاتەوە، هەندێکیان دەیانووت کوشتنەکەی ئەو پلانێک بوو، ئەمیر فەیسەڵیش بەشێک بووە لەو پلانە، هەندێکیش وتیان ئەمیرە بکوژەکە نەخۆشی دەروونی هەبووە.

ئەوانەی وادەزانن کوشتنەکەی ئەو پلانێک بووە، ئەوانە پشت بەو بۆچوونە دەبەستن کە مەلیک فەیسەڵ سەرکردەو پشتیوانی شەڕەکەی ئۆکتۆبەری دژ بەئیسرائیل کردووە، لە تۆڵەی ئەوە بوو بەکوشتنیان دابوو، ئەو کردەوەو ئەبەردییەکانی پێش لێدوانو بەڵێنەکانی دەکەوت. کە شەڕەکانی بەرەی سووریی گەرم دەبێت، لەودەمانە فەرمان دەدات هێزەکانی سعودی بخاتە ئامادەباشی بۆ بەشداریکردن لەو شەڕە مەزنەی

نەتەوەی عەرەب، بەئاشکراش پشتیوانی کۆماری عەرەبی سوری کردووەو ئامادەبووە بەهێز پشتیوانییەکەی رابگەیەنێت، تا خوێنی سەربازی عەرەبی سوری لەگەڵ خوێنی سەربازی سعودی لەو گۆڕەپانەدا تێکەڵ بێتو بەیەکەوە بەرگری لەشەرەفو کەرامەتو گێڕانەوەی خاکە داگیرکراوەکەیانو گەڕانەوەی قودسی پیرۆز بکەن. لەرۆژی ١٤ ی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٢ هێزەکانیان دەگاتە گۆڕەپانی جەنگەکەو دەکەوێتە هاوشانی هێزە سورییەکان، هەروەها هەڵوێستی مەلیک فەیسەڵ لەسەر ئەمریکاو وڵاتانی خۆرئاوا روونو دیاربوو، ئەو بەردەوام دژ بەداگیرکردنی خاکی عەرەبی بووەو هاوشانی شەڕەکانیان بووە بەرووی جوولەکەدا، لەو ماوەیەدا هەناردەی پترۆڵی سعودی بۆ ئەمریکاو ئەوروپا راگرتووەو زیانێکی زۆرو کاریگەری بەئابوورییەکەیان داوە، ئەوەی شایانی باسە بکوژەکەی ئەمیر فەیسەڵ ماوەی هەشت ساڵ لە ئەمریکا ژیاوە.

کە وەزیرەکانی پترۆڵی عەرەب لەکۆنگرەکەیاندا لەرۆژی ١٧ ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٢ لەکوێت بڕیار دەدەن هەموو وڵاتانی عەرەب بەرهەمهێنانی پترۆڵیان رێژەی زۆرتر لە٥٥% کەم بکەنەوە، مەلیک فەیسەڵ بۆ پشتیوانی ئەو بڕیارە ئەو لەکۆتایی مانگی نۆڤەمبەردا رێژەکە بۆ ١٠٥% کەم دەکاتەوە، بەڵام پاشان رێژەکە وەک ناوەڕۆکی بڕیارەکە جێبەجێ دەکات. بۆیەش سعودیە بەردەوام کاریگەردووە ئەمریکا ناچار بکات پشت لە دەوڵەتی ئیسرائیل بکاتو چیتر بە چەکو بەپارە پشتیوانی ئیسرائیل نەکات، سعودیە بەوەش نەوەستاوە لەرۆژی ١٨ ی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٢ بەیانێک لە دیوانی پاشایەتی سعودی دەردەکات کە تێیدا بەراشکاوی رادەگەیەنێت ئەگەر ئەمریکا پشتیوانی

خـۆی لەو شـەڕە بـۆ بەرژەوەنـدی ئیسـرائیلییەکان ڕانەگرێـت، ئەوە مەملەکەتەکەی هەناردەی پترۆڵ بۆ ئەمریکا بەیەکجاری دەوەستێنێت، پـاش دوو ڕۆژو لەڕۆژی ٢٠ ی مـانگی ئۆکتـۆبەری سـاڵی ١٩٧٢دا لەدیـوانی پاشایەتی ئەو بەیانە دەردەچێت؛

ئامـاژە بەو بەیـانەی کە لە دیـوانی پاشـایەتی لەڕۆژی ٢٢ ی مـانگی ڕەمەزانـی سـاڵی ١٣٩٢ ی کـۆچی کە دەکـاتە ڕۆژی ١٨ ی مـانگی ئۆکتـۆبەری سـاڵی ١٩٧٢ کە تێدا حکومەتی خـاوەن شـکۆ بڕیـار دەدات بەرهەمهێنـانی پترۆڵەکەیـان بەرێـژەی ١٠% یەکسـەرو خێـرا کەم بکـاتەوە، لەبەرئەوەی بۆمـان ڕوون دەبێـتەوە کە ئەمریکـا پشـتیوانییە سـەربازییەکەی بـۆ ئیسرائیل ڕانەگرتـووە، بـۆیە مەملەکەتـی عەرەبـی سـعودی بڕیـار دەدات هەناردەی پترۆڵ بۆ ئەمریکا بەیەکجاریی ڕاگرێت، ئەوەش کـاردانەوەی ئەو هەڵوێستەی ئەوانە دژ بە مەسەلە ڕەواکەمان لە فەلەستین.

کە شەڕەکە دەوەستێتو هێشتا مەلیک فەیسەڵ نەکوژرا بوو، وەزیـری پێشووتری دەرەوەی ئەمریکـی هنـری کیسنجەر دەگـاتە سـعودیە، پـێش ئەوەی وەزیرەکە بگـاتە مەملەکەتە، مەلیـک فەیسـەڵ فەرمـان دەدات بـۆ پێشـوازیکردن لەو وەفـدە لەبیابانـدا خێوەتێـک هەڵبـدەن، لە پـێش خێوەتەکە چەند سـەرەمەڕێک ڕاگرنو دارخورمـایەکیش قیـت بـکەنەوە، ئەوەش هێما بێت کە سعودییەکان بەسامانی تریان دەتوانن بژین، تەنها بەسـامانو فرۆشـتنی پتـرۆڵ نیـیە ئەو مەمـلەکەتە دەژیـت، ئەوە بـا ئەمریکییەکـانو هەمـوو جیهـان بزانێـت، ئەوان دەتـوانن هەمـوو دەمێـک هەنـاردەی پترۆڵیـان ڕاگرنو ئەگەر پێویسـتیش بکـات ئەوە هەمـوو بیـرە پترۆڵییەکانیش بسوتێنن، ئەوان دەتـوانن جـارێکی تـر خۆیـان لە ژیـانی

بادیەو مەرداری ڕابهێنن‌و بەدارخورما گوزەران بکەن‌و دووبارە بگەڕێنەوە ژیانی بیابانی جارانی خۆیان.

مەلیک فەیسەڵ هەڵوێستی بەرووی خۆرئاوا نەگۆڕ بووە، بەرژەوەندییەکانی عەرەب‌و موسڵمانەکانی ڕەچاو دەکردو پرنسیپەکانی هەڤاڵبەندی باش ڕەچاو کردبوو، بۆیە کە هنری کیسنجەری جوولەکە دەبێتە وەزیری دەرەوەی ئەمریکی پلانی کوشتنی ئەو دادەڕێژرێت‌و ئەلسادات ڕازی دەکەن شەڕەکە ڕاگرێت‌و ئاشتییەکە قبووڵ بکات، ئەگەرچی ئەگەری سەرکەوتن‌و پێشرەوییەکان هەر هەبووە، بەرنامەش ساز دەکرێت مەلیک فەیسەڵ لەناو ببەن، کە ئەو تاکە سواری مەیدان بوو دەیتوانی شەڕەکان بەردەوامی پێ بدات، ئەوەی پاش مردنی باوکی دەبێتە کەسی بە دەسەڵات‌و یەکەمی مەملەکەتەکەو ئەو حاکمە بووە بەرووی هەموو حاکمەکانی ئەمریکا وەستاوە بۆ گەڕاندنەوەی مافی ڕەوای عەرەبەکان. ئیستگەی سێیەمی بەرنامەکەی ئەمریکاش سەردانەکەی ئەلسادات بوو بۆ قودس، بۆیەش وڵاتانی عەرەبی بایکۆتی دەکەن، ئەو وڵاتەی کە ببووە دڵی زیندووی عەروبەو دڵی گەشی بزاڤەکە کە لەوێیەوە ژیانی عەرەبەکان سەرهەڵدەدات، پاش ئەو پلان‌و بەرنامەیەو لەسەردەمی جیاوازو لەیەک نزیکیشدا کاری تریش کراوە، لەوانە کۆششدان بۆ کوشتنی مەلیک فەیسەڵ چونکە لەناوبردنی ئەو هەنگاوێکی باش بوو بۆ پەرتەوازەکردنی عەرەبەکان‌و لاوازکردنیان لە داکۆکیکردن لە مافەکانیان. کوڕی مەلیک فەیسەڵ ئەمیر خالید ئەلفەیسەڵ هەستی بەوە کردووە، بۆیە کە بەپارچە شیعرێک بەناوی (سلام یا فیصل) باوکی لاواندووتەوە نووسیویەتی:

ان كان قصد عداك تعطيل ممشاك حقك علينا ما نوقف ولا يوم

ان قاله الله ما نضيع لك مناك نسجد لرب البيت في القدس و نصوم

واتە ئەگەر دوژمنەکانت بۆ ڕێگاکردن لەکاروانەکەدا ئەوەیان کرد، حەق وایە ئێمە نەوەستینو یەک ڕۆژ پشوودانمان نەبێت.

خوداش فەرمانی داوە هیواکەت گووم نەکەینو سوجدەو بەرۆژبوون بۆ کردگار لە ماڵی خودا لە قودس بکەین.

کـوڕە شاعیرەکە لەدوا دێـڕی شـیعرەکەی ئەو مەبەسـتی بـووە کە مەلیک فەیسەڵ پێش کوشتنەکەی وتوویەتی بەفەرمانی خودا جەژنی دادێ لە قودس نوێژ دەکەین.

## یان کوشتنەکەی بۆ تۆڵەکردنەوە بوو!؟

لە سـاڵی ١٩٦٥و سـاڵێک پـاش ئەوەی مەلیـک فەیسـەڵ تـاجی مەمـلەکەت وەردەگرێـت، ڕووداوێکـی مەترسـیدار ڕوودەدات، ئەویـش کوشـتنی یەکێـک لە ئەنـدامانی بنەماڵەی ئال سـعود بەدەسـتی پیـاوانی ئاسایش ، ئەمیر خالیدی کوڕی موساعدی کـوڕی عەبـدولعەزیز کە بـرازای مەلیک فەیسەڵ بوو، ئەو پیاوە کەسێکی دینداربوو، ئیلتزامی بەئاین زۆر پتەو بوو، زۆریش لە مزگەوتەکانی خـوتبەی دەداو لایەنـی خوداپەرسـتی زۆر گرتبوو، ئەمیر عەبدولای کوڕی موساعد بەو شێوەیە باس لەو برایەی

خۆی کردووە،

ئەوانەی خالیدی برامیان دەناسی دەیانزانی ئەو کەسێکی ئەهل ئەلتقەوا بووە، زۆر کارکەرو زیرەك بوو، هەموو قورئانی لەبەر بووە، دەعوەی لەسەر هەموو شتەکانی تر بەگەورەتر زانیوەو زۆرتر لەگەڵ داوای زانستدا بووە، کە لەمزگەوتەکانی خوتبەی داوە دەنگی داوەتەوە ڕێنماییەکانی بیستراوەو گوێیان لەو راگرتووە، زۆر هاوڕێیەتی موفتی مەملەکەتی عەرەبی سعودیە خوالێخۆشبوو شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی باز کردووە، هەروەها لەگەڵ شێخ عەبدوڵای کوڕی غەیس و شێخ عەبدولرەحمانی کوڕی فریان سەرۆکی دەستەی خەیری لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز لە ناوچەی ریازی پایتەخت بووە کە زۆر داواکاری فێربوون و زانست بوو.

ئەمیر خالید کەسێکی سەلەفی توندڕەو بوو، ئەو وایدەزانی ئامێری تەلەفزیۆن پەسەند نییەو بوونی پێویست نییە، ئەگەر ئەو ئامێرە لەمەملەکەتەکەیاندا هەبێت زیان بە هەموو نەتەوەکەیان دەگەیەنێت، بۆیە ئەگەر خودا لەسەر شتانە تووڕە بێت سزامان دەدات، سزاکەش توندو کاریگەر دەبێت، بۆیە تا خودا رازی بکەین دەبێ بوار بەبوونی ئەو ئامێرە نەدەین، ئەو داواکاربوو ئەگەر بەقسەکانی ئەو، ئەو ئامێرە لە مەملەکەت قەدەغە نەکرێت بۆیە دەبێ ئەو نیستگە داگیر بکرێت و دەزگاکان وردو خاش بکرێت.

شێوەو چۆنیەتی کوشتنی ئەو ئەمیرە قسەو گێڕانەوەی زۆری هەیە، دەڵێن گوایە ئەو لەودەمانە کوژراوە کە هێرشی کردووتە سەر نیستگەی تەلەفزیۆنەکان، بۆیە چەکدارەکانی پاسەوانی تەقەیان لەو کردووەو

کوشتوویانە، وەزیری ناوخۆش ئەمیر فەهدی کوڕی عەبدولعەزیز ئەو دەمانە بۆ قسەکردنو لێپرسینەوە داوای گرتنی کردبوو، بۆ ئەو مەبەستە تیمێکی تایبەتی چەکداریان لە شەقامی ئەلخەزان بۆ گرتنی ئاراستەکردبوو، لە نیوە شەوی ٨ ی مانگی سپتەمبەری ساڵی ١٩٦٥ماڵەکەیان گەمارۆدابوو، دەڵێن سەرۆکی تیمەکە تەقەی لەو کردبوو.

ئەمیر عەبدولای کوڕی موساعد زۆرتر باس لە بەسەرهاتی کوشتنەکەی براکەی دەکاتو دەڵێت:

قسە لەسەر ئەوە کرابوو کە یەکێک لەمامەکانم لەماڵەوە سەردانی ئەمیر خالید بکەن، بەیەکەوە نوێژێک بکەن، پاشان بۆ لێپرسینەوەکە ئەو لەگەڵ خۆیدا ببات، کە تیمە پۆلیسەکان لەشەوی ١٢ی جەمادی یەکەمی ساڵی ١٣٨٥ی کۆچی بەرامبەر سپتەمبەری ساڵی ١٩٦٥ دەگەنە نزیک ماڵەکەیو گەمارۆی دەدەن. ئەو لەناو ماڵو منداڵەکانیدا دانیشتبوو، کە پۆلیس دەگەنە نزیک ماڵەکەی ئەو دەچێتە دەرەوە پێشوازییان دەکات، ئەوان داوای لێدەکەن لەگەڵیان بچێتو لێپرسینەوەی پێویستی لەگەڵدا بکەن، بەڵام ئەو پێیان دەڵێت لەسەرم راوەستن نوێژی بەیانی بکەم، ئینجا لەگەڵتان دێم، بەڵام ئەوان بەو مەرجەی ئەو رازی نابن، بۆیە پۆلیسەکان لەو نزیک دەبنەوەو دەیانەوێ بەتوندی بیبەن، بۆیە ئەو خۆی لەناو دەستیان دەردەهێنێتو دەچێتەوە ژوورەوە. بەڵام لەسەر ئەو رووداوە قسەی زۆر هەیە، دەڵێن گوایە خالیدی برام بۆ دوورخستنەوەی پۆلیسەکان تەقەی ئاسمانی کردووە، ئەوانیش بەلێزمەیەک گوللە وەڵامیان داوەتەوە. هەندێکیان دەڵێن گوللەیەک لەو نزیکانەوە هاتووەو قاچی پۆلیسێکی بریندارکردووە، بۆیەش ئەوان

تەقەیان لەو کردووە. لەودەمانەدا رەوشەکە ئاڵۆزبووەو هەموولایەک تەنگاوو بەپەلەبووینو نەکراوە رەوشەکە کۆنترۆڵ بکەن، ئێمەش راستی کارەساتەکە باش نازانین، ئەوەی دەزانین گوللەیەک بەسەری خالیدی برامان کەوتووەو بەربووتەوە سەر زەویو رۆحی بۆ لای خودای گەورە بەرز بۆتەوە، ناکرێ راستی رووداوەکە وەک خۆی بزانین، زۆر لێکۆڵینەوەش لە کوشتنەکەی نەکراوە، هیچ زانیاریی بڵاونەکراوەتەوە، ئەوەی زانیمان بەرپرسەکان وتیان لە سەرەتا تا کۆتاییەکەی رووداوێکی ناخۆشو کارەساتێکێکی شووم بوو.

## بەڵام پلانێک بووە

ئەوەی مەلیک فەیسەڵی پاش دە ساڵ کوشت، فەیسەڵی برای خالید بوو. پرسیارەکەش ئەوە بوو بۆچی پاش ئەوەندە ساڵەئەو تۆڵەی براکەی دەکاتەوە...؟ بۆ ئەو بژارەی کردبوو، بۆچی مەلیکی هەڵبژاردبوو...؟ بۆچی یەکێکی تری نەکوشت، تەنها مەبەستی ئەو بووە...؟ پرسیارە لۆژیکییەکەش ئەوەیە رەنگە هاوبیرەکانی خالید کە هەموویان توندڕەوبوون ئەوەیان قەناعەت پێکردووە کە مامی لەتۆڵەی ئەو بکوژرێتەوە، چونکە ئەو بەرپرسی یەکەم بووە لە کوشتنەکە...؟ ئەگەر ئەو پرسیارەو ئەو رووداوە جوان شرۆڤە بکەین سەرەداوی پلانێکی موخابەراتی ورد دارێژراو هەست پێدەکرێت.

# کەنەدی

## کەنەدی خوێنەکەی لە نێوان موخابەراتو
## مافیاو کوباو سۆڤیەتییەکان گوم بوو

جۆن فیتز جیرالّد ئو جۆن ئێف کەنەدی ، یان جۆن کەنەدی سەرۆکی ژمارە سیو پێنجەمینی ئەمریکییە کە لەپاش دوایت ئایزنهاوەرەوە هاتووە، ئەو لەسالّی ١٩٦٠ وەک کاندیدی حزبی دیموکراسی دەبێتە سەرۆکی ئەمریکی، کە لەهەلّبژاردنەکەدا پێش کاندیدی حزبی کۆماری ریتشارد نیکسۆن دەکەوێت، ئەو زووتر لەنێوانی سالآنی ١٩٤٧و ١٩٦٠ لەئەنجومەنی نوێنەران نوێنەری ولایەتی ماساتشوسیس بووە، پاشان لەئەنجومەنی پیرانیش نوێنەریان بووە.

کەنەدی لەرۆژی ٢٩ی مانگی مایۆی سالّی ١٩١٧ لەدایکبووەو لەرۆژی ٢٢ی مانگی نۆڤمبەری سالّی ١٩٦٣ دەکوژرێت، ئەو تاکە سەرۆک بووە سەر بەمەزهەبی کاسۆلیک بووبێتو گچکەترین سەرۆکی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش بووە، کە بووە بەسەرۆک تەمەنی ٤٢ سالّ بووە بۆیەش ئەو گچکەترین سەرۆک بووە لە مێژووی ئەمریکادا. ئەو سەرۆکایەتی ئەمریکای لەسەردەمێکدا دەکرد کە ململانێی لەنێوان ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەتی گەرمو بەردەوام بوو، ئەو بەرووی یەکێتی سۆڤیەتدا لەهەموو ئاستەکاندا چ سەربازیو چ سیاسی بەهێزبوو، بەتایبەتی لە ئەنجوومەنی ئاسایشو راگەیاندنو کەنالّەکانی دیبلۆماسیدا، بۆیەش ئەو بووە یەکێک لەو سەرۆکە میللیو بایەخدارانە. یەکێک لەرووداوە هەرە مەزنەکانی سەردەمی ئەو چالاکییەکەی کەنەداوی بەرازەکانو قەیرانی مووشەکەکانی کوباو دروستکردنو دانانی دیوارەکەی بەرلینو پێشبڕکێ گەیشتن بە ئاسمان بوو، ئەویش خاوەن بیرۆکەی گەیاندنی مرۆڤ بوو بۆ سەر مانگ، ئەوەی پاش شەش سالّ لەمردنەکەی جێبەجێکرا.

## تیرۆرکردنەکەی

بڕیاربوو سەرۆک کەنەدی سەردانی ولایەتەکانی تکساس‌و شیکاغۆو میامی بکات، تا لەوێ لێکۆڵینەوە لەسەر شەعبیەتی دیموکراسییەکان دژ بەکۆمارییەکان بکات، هەندێ لەئەندامانی کۆنگرێس لەشاری دالاس ئامۆژگارییان کردبوو ئەو سەردانە نەکات، چونکە توندڕەوو راستڕەوەکان چالاکن، لەوەدەمانەدا لێدوانەکانیان لەسەر هەڵگرتن‌و نەمانی جیاخوازی ئەزادی‌و پەرەسەندنی مافەکانی مرۆڤ گەرم بوو، قسە زۆر لە پەیمانی قەدەغەکردنی ئەزموونە ناوەکییەکان لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت دەکرا، ناکۆکییەکان لەگەڵ کوبا بەبایەخەوە قسەی لەبارەوە دەبیسترا، ئەوانیش ئەوانەیان بە خیانەت دەزانی کە باس لەبەیەکەوە ژیانی ئاشتیانە دەکرد، بۆیە هاوڕێیەکانی پێیان وتبوو سەفەرەکەت مەترسی لەسەرەو دەبێ هوشیار بیت.

لە رۆژی ١١ ی مانگی نۆڤمبەری ساڵی ١٩٦٣دا لەوەدەمانەدا کاروان‌و کەژاوەی سەرۆک کەنەدی لەناو جەماوەرێکی زۆر گەورەدا رێی دەکرد، لەوێ سێ گوللەبەر سەرۆک دەکەوێت‌و یەکێک لە گوللەکان بەر پشتی دەکەوێت‌و گوللەیەکیش بەمێشکی دەکەوێت، کە دکتۆرەکان ویستبوویان جەستەی ئەو تەشریح بکەن، دەستەیەک لە پیاوانی موخابەراتی مەرکزی ئەمریکی بەدەمانچەوە لە دکتۆرەکان دەچنە ژوورەوەو دکتۆرەکان لەو تەشریحکردنە رادەگرن، ئەوان بەزۆر تەرمەکەی دەبەنە نەخۆشخانەی دەریاوانی لەواشنتۆن، لەوێ تەشریحی جەستەکەی

لەلایەن دکتۆرێکی ناشارەزا لە تەشریحی کەسی کوژرا بەتفەنگ دەکرێت، کە مادەکانی تەشریحکراوەکە دەگوازنەوە بەشی هەڵگرتنی نیشتیمانی، مێشکەکەی ئەو دیار نامێنێت، چەند بەشێکی ئەو شووشەیەو دڵۆپە خوێنەکانو وێنەی تیشکەکان گووم دەبێت، بەپشکنینو لێکۆڵینەوە لەوانە دەکرا بزاندرێت سەرچاوەی تەقاندنی گوللەکانی لەجەستەی کەنەدی درابوو لە کام شوێنەوە ئاراستە کرابوو، بەتایبەتی ئەو شوێنەوارەش دیار دیار نامێنێت، رەنگە بەوەیان تێوەگلاندنی پیاوانی موخابەراتی مەرکەزی لەو تاوانەو لەکوشتنەدا دەردەکەوت. پێش ئەوەی هەواڵی مردنەکەی ئەو رابگەیەنن دەسەڵاتەکە بەرەسمی دەدەنە دەست جێگری سەرۆک جۆنسۆن، فڕۆکەی یەکەمی سەرۆکایەتی تەرمەکەی ئەو دەباتەوە واشنتۆن.

# تاوانبارەکە

ئەگەرچی لە ماوەیەکی زۆر کورتدا تاوانبارەکە دەگیرێت، بەڵام تا ئێستاش نەزانرا بۆچی ئەو کەنەدی تیرۆرکردبوو، راستی مەسەلەکە چ بوو، هەندێک دەڵێن پیاوانی موخابەراتو کەسانی نزیک لە حکومەت دەستیان لەکوشتنەکەدا هەبووە، یان لەشاردنەوەی راستییەکاندا رۆڵیان هەبووە. دوایی وتیان شارەزایانی کەسانی سۆڤیەتی لە بواری جاسووسیدا لەلێکۆڵینەوەکانیدا هەندێ سەرەداوی نهێنی لەو کارەدا دەدۆزنەوە، ئەوان دەگەنە چەند دەرئەنجامێک کە کەس ئەوە قبووڵ ناکات، ئەوەش

یاش نیو سەدە لەپاش کوشتنەکەیدا بووە. شرۆڤە رەسمییەکان ئەوەیان راگەیاندووە کە لیژنەی لێکۆڵینەوەکەی (وارین) گومانی تەنها لەیەک کەس دەکرد کە سەرۆک کەنەدی کوشتبێت، ئەو لیژنەیەش تایبەت بۆ لێکۆڵینەوە لەو رووداوە دامەزرابوو، بەڵام راستییەکە وەک خۆی دەمێنێتەوەو زانیاری زۆرترو روونتر ئاشکرا نابێت. لیژنەی وارین تایبەت بە لێکۆڵینەوەی کوشتنەکە قسەی زۆریان لەسەر بڵاوکردەوە، شاهێدێک وتبووی من گوێم لەدوو تەقە بووە، هەندێکی تر وتبوویان تەقەکان چوار تەقە بووە، هەروەها لەلێکۆڵینەوەکەدا گوترابوو کە ژمارەی تەقەکان ژمارەیان شەش تەقە بووە، بەڵام حاکمی ولایەتی تەکساس کە ئەودەمانە لەگەڵ سەرۆک کەنەدی بوو، ئەو وتبووی من وادەزانم دوو یان سێ کەس بوون کە تەقەیان لە کەنەدی کردبوو. بەڵام لیژنەی کوشتنەکان لەلێکۆڵینەوەکاندا لەساڵی ١٩٨٠ وتبوویان کە راوێژ لەگەڵ شارەزا لەبستن (پاش گوێراگرتن لەو فیلمەی رووداوەکەی تۆمارکردبوو) چوار گوللەتەقێندراوە، سێ لەو تەقانە لە کۆگایەکی کتێبی پشت کاروانەکەوە کراوەو یەکێکیان لەبەرزاییەکەو لەناو دارانەوەو لە پێش کاروانەکەوە تەقەی کردووە، هەردوو تەقەکەش لە ماوەی یەک چرکەدا بووە، دیارە کە بکوژرەکان دوو کەس بووینەو ئەوانە لەو کۆگایەوە تەقەیان کردووە، بەڵام کەسی سێیەمیش لە پشت دیوارێک لەپشت دارە چڕەکانەوە تەقەی کردووە.

# ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ئۆتۆمی

مەسـەلەی شـاردنەوەی ڕاسـتییەکان تەنهـا لەلایەن حکـومەتی ئەمـریکییەوە نەبـووەو بەس، بەڵکـو سـۆڤیەتییەکانیش زانیارییـان لەو دۆسیەدا هەبووە، بەڵام زانیـارییە نهێنییەکانیـان بڵاونەکردیتەوە، پـاش کۆتایی هاتنی شەڕە ساردەکەی نێوان ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەت هەنـدێ لە لاپەڕەکـانی ئەو دۆسـیەیە ئاشـکراکراوە، ئەو بەڵگەنامـانەش ئەوە دەردەخەن کە دەستی دەرەکی لە کوشتنەکەی جۆن کەنەدی دا هەبووە.

کە ئەو زانیارییەش ئاشکرا دەبێت ئەمریکا بـۆ تـۆڵەکردنەوە چەنـد فـڕۆکەی جەنگـی سـازکراو بە چەکـی نـاوەکی سـاز دەکـات، سـۆڤیەتییەکانیش هێـزە سـەربازییەکان تەیـارو ئامـادە دەکەن، شـەڕە نـاوەکییەکەی نێـوان هەردوو جەمسـەری خـۆرهەڵاتـو خۆرئـاوا ڕووبەڕوو دەوەستن، ئەوەش لە مەزندەو رامانی کەسدا نەبـوو، نیشانەی شەڕێکی جیهانی مەزنو جەنگی جیهانی سێیەمو بەهەبوونی بۆمبی ناوەکی دەست ئەو دوو هێزە مەزنە نزیک دەبێتەوە، کە بەو چەکانە دەتوانن گـوێ زەوی بـخەنە مەترسییەوەو چەکەکانیـان زەبـری ئەوەی هەیە چەنـد جار ئەو جیهانە خاپوور بکات. لەوەدەمانەدا قسە لەسەر ئەوە کـرا دەبێ هێزێکی شاراوە لەپشت کوشتنەکەی جۆن کەنەدی یدا هەبێت، یان ترسی ئەوەش هەبـوو کە ڤیـدل کاسـترۆ دەستی لەو کوشـتنەدا هەبووبێـت، جێگـرەکەی سەرۆکی ئەمریکیش جۆنسۆن وایدەزانی ئەویش بوویتە نیشانەو مەترسی لەسەردا هەیە، لەباندۆری ئەو مەسەلەیە سەرۆک وەزیرانـی سـۆڤیەتیش خروشۆف لەبەر چـاوان دیـار نامینێـتو هـیچ نیشـانەیەک بە شـوێنەکەی

ئەو شارەزا نابێت، بۆیە ئەوەیان گومان لە بوونی دەستی رووسەکان لەو کوشتنەدا پەیدا دەکات.

ئەو قەیرانە نوێیە تەنها چەند مانگێک بوو لە پاش قەیرانی مووشەکی کوبییەکان، بۆیەش ئەگەری دەستی سۆڤیەتییەکان زۆرتر دەبوو. ناکۆکییەکانی نێوان ئەو دەوڵەتە مەزنتر دەبێت، یەکێتی سۆڤیەت حاڵەتی ئامادەباشی لەناو سوپادا رادەگەیەنێت، کاسترۆ بە ئاشکرا رادەگەیەنێت کە ئەو دەستی لەکوشتنەکەدا نەبووە، سەرۆک وەزیرانی سۆڤیەت خرۆشۆف پەیوەندی بەسەفارەتی ئەمریکی دەکات، پێیان دەڵێت وڵاتەکەمان دەستی لەو تاوانەدا نییە، وەنەبێ خرۆشۆف ترسی لەوەدا نەبووبێت ئەوەک بەنهێنی دەزگای ئیستخباراتی سۆڤیەتی (کی گی بی) دەستی لەو رووداوە هەبێت، بۆیە بەلەز داوا دەکات لێکۆڵینەوەی ورد لەگەڵ ئەو دەزگای خۆیاندا بکەن، تا سی ساڵ لێکۆڵینەوەکانو سۆراخی کردنی ئەو مەسەلەیە لەناو ژوورە تاریکییەکاندا بە شاراوەیی دەمینێتەوەو هیچ لە ناوەرۆکی ئەو لێکۆڵینەوە نادرکێنن.

لەو رۆژگارانەی شەڕی سارد زۆر گەرم بوو، ئەو دەزگایە سۆڤیەتییە یەکێک بووە لەو دەزگایانەی زۆر بەکارامەیی کاریان کردووە، بەتایبەتی لەکپکردنی دەنگی ئۆپۆزسیۆن لە دەرەوەو لەناوەوەی سۆڤیەتدا، دەزگاکە زۆرتر لەسێ سەد کەسی بەکرێگیراویان هەبوو، ئەوانەش لەناو کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتو دەرەوە کاریان بۆ راگرتنی سیسەتەمەکەی ئەو وڵاتە کردووە، هەتا لەسەرەتای شێستەکاندا سۆراخی نیکیتا خرۆشۆفیشیان کردبوو.

لە دالاس دەسەڵاتداران بەوردی سۆراخی ئەو کەسە قەناسەیان

کردووه کە سەرۆکی بەگوللەکانی کوشتبوو، ئەو کارمەندێکی ئەو کۆگایە بوو کە تایبەت بوو بە هەڵگرتنی کتێبی قوتابخانەکان، ئەو کارمەندە دوو سەعات لە پاش کوشتنەکە دەگیرێت، ئەوان وتیان ئەو لە نهۆمی شەشەمدا چاوەڕوانی کەژاوەکەی سەرۆکی کردبوو، کە تەقەکانیشی کردووە تفەنگەکەی شاردووتەوەو خۆشی دابەزیوەتە نهۆمی دووەمی باڵەخانەکە.

ئەگەر ئەو پیاوە زوو دەگیرێتو ئەویش تاکەکەس بووە کە گومانیان لێی کردووە، بەڵام بەرپرسەکانی ئەو لێکۆڵینەوە دەڵێن بڕوا ناکرێت ئەو کەسە کە ناوی ئۆزویلدبوو ئەو کارەی کردبێت، ئەو تەنها وەک پەردەیەک بەکارهاتووە، ئەوان دڵنیابوون کە ئەو کەسە ئەو کارەشی ئەنجام نەداوە، پاش ئەوەی دەستەی وارین بۆ لێکۆڵینەوەکە دادەمەزرێنن، ئەمریکییەکان پشتیان لە کارەکەی ئەو لیژنە دەکەنەوەو دڵنیا دەبن کە وارین بە ئاسانی مەسەلەکەو بکوژەکە بەدەلیلەوە دەدۆزێتەوە، بەڵام کە ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە ئاشکرا دەبێت، زۆر گلەیی لە راپۆرتەکە دەکەنو رەخنەی زۆریان لەسەر دەبێت.

لەلێکۆڵینەوەکەدا ئۆزویلد ئینکار دەکات کە دەستی لەو کوشتنەدا هەبووبێت، بەڵام کە ژیاننامەی خۆی دەگێڕێتەوە گومانی لێدەکەن، ئەویش دەڵێن لەبەرئەوەی من لەساڵی ١٩٥٩ چوومەتە یەکێتی سۆڤیەت، پاشان لەساڵی ١٩٦١ گەڕاومەتەوە نیوئۆرلیانز، لە ساڵی ١٩٦٢یش هاتوومەتە تکساس، لەودەمانەشدا من هاوسۆزییم لەگەڵ کاسترۆدا هەبووەو دۆستایەتیم لەگەڵ خەباتی کوبییەکاندا هەبووە، بۆیە گومانم لێدەکەن. ئەو لەدیمانەیەکی تەلەفزیۆنیدا نکوڵی لەوەدا دەکات کە

دەستی لەو کوشتنەدا هەبووبێت، پۆلیس بۆیەش گومانیان هەبووە چونکە ئەو لەرووسیادا ژیاوە، بەڵام هێماکان ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو بکوژی راستەوخۆ نەبووە، بەڵکو لەو کارەدا کەسێکی یاریدەر بووە، رەنگە موخابەراتی ناوەندی ئەمریکی رۆڵی سەرەکی گێڕا بێت. دەسەڵاتداران وردەکاری هەبوونی پەیوەندی ئەو پیاوە بەو رووداوە بڵاودەکەنەوە، میدیای جیهانیش ئەوە ئاشکرا دەکات کە ئوزوێلد پەیوەندی بە حزبی کۆمۆنیست هەبووە، تا گومان لەسۆڤیەتییەکانیش نەکەن، ئەوانیش بەوردی لێکۆڵینەوەیان کردبوو.

ژەنەراڵ ئولی کالیجین ئەو بە کرێگیراوێکی نهێنی بووە، بەڵام خۆی لەژێر ناوی پەیامنێری رادیۆی مۆسکۆدا شاردووتەوە، پاش چەند ساڵێک بەو شێوەیە باسی رووداوەکەی کردووە:

ئێمە رێنمایی بەلەزمان پێگەیشتووە زووش بۆ سەرکردایەتی بانگ کراینەوە، کۆلۆنێل ئونیل هەموو وردەکاری رێنماییەکانی بەپەلەو لەکاتی خۆیدا لە مۆسکۆوە دەگەیاند کە چۆن لە گەرمەکانی ئەو شارەدا بسووڕێنەوە، چۆن پەیوەندی بەدبلۆماسییەکانو بەئەفسەرە گەورە ئەمریکییەکان بەهاوڵاتیان بکەین، چۆن باس لە خەمو نارەحەتی خۆمان بەو رووداوەو بە کوشتنەکەی سەرۆک کەنەدی لەناو خەڵکەکە بڵاوبکەینەوە، بەگوێی خەڵکەکەش بچرپێنین کە زۆرمان پێ ناخۆشەو بەراستی بەشداری خەمی ئەمریکییەکان دەبین لە کوشتنی سەرۆکەکەیان. یان ئەوە بەئاشکراو بەروونی باس بکەین، باشە کوشتنی

سەرۆک کەنەدی چ سوود بەئێمەی سۆڤیەت دەگەیەنێت، بێگومان هیچ، ئێمە هیچ بەرژەوەندییمان لەو کوشتنەدا نییە.

ئۆزوێلد دەگوازرێتەوە زیندانی شاری دالاس، لەوێ بەتۆمەتی کوشتنی سەرۆک کەنەدی و تیبیتی ئەفسەر دەگیرێت، قسەش لەوە دەکرا کە ئەو بەرنامەکەی لە مێژە داناوەو ڕەنگە چەند هەفتەیەک زووتر یان چەند مانگێک زووتر بووە، بۆیەش باش بەرنامەڕێژی کردووەو وردیش جێبەجێیکردووە.

لە ڕۆژی ٢٤ی مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٦٣و دوو ڕۆژ پاش کوشتنی سەرۆک کەنەدی لی هارڤی ئۆزوێلد ئەو کەسەی کە بەتاوانی کوشتنەکە گیرابوو، لەگرتووخانەیەکی هەرێمی دالاس دەگوازرایەوە، لەودەمانەدا پیاوێک لەناو حەشاماتەکەدا دەمانچەکەی ئاراستەی سکی کابرا دەکات، بۆیە پۆلیسیش دەستبەجێ پیاوەکە دەگرێت، ئەویش خاوەن یانەیەکی شەوانە دەبێتو ناوی (جاک ڕوبی) بوو.

ڕوبی هاوڵاتییەکی شیکاغۆ بوو، کەسێکی توندکاربوو، پەیوەندی بەدەستەکانی مافیاوە هەبووە، کە لەشیکاغۆوە تا دالاس تۆڕیان هەبوو، گوتیان گوایە ئەو پیاوە دەمانچەکەی بەدەستتو بەهاوکاری پیاوێکی پۆلیس لە دالاس کڕیوە، هەر بەهاوکاری ئەویش لەکاتی دیاریکراودا گەیشتووتە ئەو شوێنەی ئۆزوێلدی تێدا بووە، ئەو کە لەپۆلیسخانەکە گیراوە هاواری لێ هەڵساودو داوای یارمەتی کردوود کە پێویست وابوو ئەو لەشوێنێکی پارێزراودا بێت، بەڵام کەس بەفریای نەکەوتووە. قسەی هەمەجۆر لەسەر ئەو پیاوە دەکرا، هەندێ دەیانگووت ئەو دەستی لەگەڵ مافیادا هەبووەو زۆر بۆچوون هەبوو، بەڵام هەموو قسەکانی دەچنەوە سەر

ئەو سەرچاوەی کە ئەو بەفەرمانو راسپاردەی مافیا ئەو کارەی کردووە. کە ئەو دەگیرێت ئوزویلدیش دەگەیەندرێتە نەخۆشخانە، پاش چەند سەعاتێک لەسەر نەشتەرگەرییەکەی لەبن دەستی دکتۆرەکانەوە بەو برینانەوە دەمرێت. ئەو هەواڵەش لەجیهان بڵاودەبێتەوە کە ئەو پیاوەی نهێنی کوشتنەکەی جۆن کەنەدی لەلادا بووە دەمرێت.

• • •

لەساڵی ۱۹۷۹ لیژنەی تیرۆرەکان زانیاری نوێ دەخاتە سەر راپۆرتی لیژنەی لێکۆڵینەوەکەی وارین، پاش تێپەربوونی ماوەیەکی زۆر چەند سەرەداوی تری کوشتنەکەی کەنەدی دەدۆزرێتەوە، کە پێشتر بەردەست بوون وەک دەستەکانی مافیاو کوبییەکانو کۆچبەرە نەیارەکانی کاسترۆ، ئەو لیژنەیە پەیوەندی ئوزویلدی چەپگەرو هاوکاریکردنی ئەو بەدەستەکانی تاوانو راستڕەوەکان، ئەوە دوور دەخاتەوە کە هەستی چەپگەری ئەو هۆکارێک بێت بەئەنجامدانی ئەو تاوانە، لێرەدا دیار دەکەوێت کە دەستی موخابەراتی مرکزی ئەمریکی دەستی لەو پلانەدا هەبووە، بەڵگەکەش ئەوەیە کە ئەوان نەیانتوانی نهێنییەکە بدۆزنەوەو وردەکاریی پلانەکە بزانن یان ئاشکرای بکەن، کوشتنی ئوزویلد بەدەستی (جاک روبی) پتر ئەوە دەسەلمێنێت، ئەگەرچی ئوزویلد کەسێکی چەپ بووە، بەڵام لە دەریاوانی ئەمریکییش وەرگیراوە، کە لەدەستەی چاککردنەوەی فڕۆکەش کاریکردووە، دەبوایە باش لە ناسنامەو کەسایەتییەکەیان زانیبووایە، چونکە بۆ پێداویستییەکانی ئاسایش ئەوە مەرجێکی یەکەمە.

ئەو لە ساڵی ١٩٥٧ دەچێتە بنکەی ئاسمانی ئاتسوگی لە ژاپۆن لەوێ وەک کارمەنـدێکی رادار کـاریکردووە، ئەگەرچـی ئەو بـنکە سـەربازییە ئەمریکییەکەش زۆر نهێنـی تێـدا بـووە، بەتـایبەتی فـڕۆکەی جاسووسـی جـۆری ئــو ٢٠، ئەودەمــانە ئەو فــڕۆکەیەش یەکێــک بــووە لەنهێنــیە سـەربازییە زۆر داخراوەکـان، لەو بـنکەیەش چەنـدین کۆگـای چەکـی نـاوەکی تێـدا حەشـار درابـوو. لەوێ ئەو زمـانی رووسی فێربووە، بـایەخی زۆریشـی بەئایـدلۆژی ئیشـتراکیو سیاسـەتی رووسـیو شۆڕشـی کـوبی داوە، لەسـاڵی ١٩٥٩ داوای دەسـت لەکارکێشـانەوەی کـردووە سـەفەری مۆسـکۆی کردووەو واز لە ناسنامە ئەمریکییەکەی خۆی دەهێنێت، بە قونسڵەکەی ئەمریکایشی وتووە من ئامادەم هەموو زانیارییەکانی چەکی دەریـاوانی پێشکەش بە سۆڤیەتییەکان بکەم، هەرچی لەسەر رادارەکانو فڕۆکەکانی جاسووسیان دەزانـم پێیـان بڵێم. ئەو بە ئاشکرا هـزرە چەپگەرییـەکەی خـۆی ئاشـکراکردووە، لە کـاتی گەرمەی شـەڕە سـاردەکەش لەو بـنکە هەستیارەش کاریان داوەتـێ، بەبـێ ئەوەی موخـابەراتی ئەمریکی بـایەخ بەو مەسـەلەیە بـدەن، ئەو لە قوتابخـانەیەکی سـوپای رووسـیش فێـری زمانی رووسی کراوە، ئەگەرچی ناویشی لە لیستەکانی ئەو قوتابخـانەیەدا نەبووە. بەپێی راپـۆرتی بەڕێوەبەری کاروبـاری کارمەنـدانی دەریـاوانی ئەو پیــاوە چەنــد کــارو فەرمــانی نهێنیشــی پــێ ســێپردراوە، ئەگەرچــی مووچەکەشـی بەشـی سـەفەرەکانی مۆسـکۆی نەکـردووەو ئەو لە هلسـنکی پـایتەختی فنلەنداشـدا لە هـوتێلی گرانبەهـادا دابەزیـوە، زۆریـش قسـە لەسەر ئەوەش کراوە ئەو پارەی گەڕانەوەکانی بۆ ئەمریکای لەکوێ بووە.

لە ساڵی ١٩٧٨ ئەفسەرێکی موخـابەرات دانـی بەوەدا نـاوە کە ئۆزویلـد

دووسەرە کاری جاسووسی کردووە، ئەو خۆی مەسرووفاتی سەفەرەکانی مۆسکۆی پێداوە، ئەوەش مانای ئەوەیە قونسڵەکەی ئەمریکی لەمۆسکۆ ئاگاداری چالاکییەکانی ئەو نەبووە، لەلای ئەو باسی ئەوەی نەکردووە کە ئەو پیاوێکە سەر بەموخابەراتی مەرکەزییە، چونکە ئەو لەلای ئەو قونسولە وتوویەتی من زانیارییەکانم دەدەمە سۆڤیەتییەکان، ئینجا لەسەر ئەو قسەیەش هیچ کاردانەوەیەکیان نەبووە. ئۆزویلد لەراستییدا سەربازی دەریاوانی ئەمریکی بووە، پاشان پەیوەندی بەیەکەیەکی سەربازی لەژاپۆن کردووە، واتە ئەو لەبەر پەردەی دەریاوانییەکەدا کەسێکی جاسووس بووە، بۆیەش زۆر ئاساییە لەدۆسییەکەی ئەودا زانیاری چەواشەو نادروستی زۆر تۆمارکراون، بۆیەش زانیاری کۆکردنەوەش لەسەر کوشتنی کەنەدی دەشاردرێتەوە، ئەو لەودەمانەدا نیشی دژ بەسۆڤیەتییەکانی پێکراوە کە ئەو کارەش ئاسان نەبووە، چونکە لەودەمانەدا سۆڤیەتییەکان دەسەڵاتو کۆنترۆڵیان بەسەر جیهاندا هەبووە، بۆیەش موخابەراتی مەرکەزی ئەمریک ٤٠ گەنجی هەزاری ئاگادار لە کۆمۆنیزم پەیدا دەکەنو رەوانەی سۆڤیەتییان دەکەن تا لەوێ بۆ بەرژەوەندی خۆیان لە رێزەکانی موخابەراتی سۆڤیەتییەکان کارکەربن، کارو بەرنامەکەش دەستەمۆی ئەو ئەمریکایانەی دەکرد کە بۆ سۆڤیەت رایانکردبوو، لەوانە کەسێکی وەک ئۆزویلد. ئەو پیاوە لە پێگەو شوێنی ناسکو ترسناکی وەک رادارو فڕۆکەکانی جاسووسیی کاریکردووە، بۆیەش وەزارەتی دەرەوەو موخابەراتی ئەمریکی لارییان نەبووە بچێتە ناو یەکێتی سۆڤیەت، بۆیەش زۆر ئاساییە ئۆزویلد ببێتە یەکێک لە پیاوانی موخـــــابەراتی ئەمریکــــی، بەکرێگیراوەکـــــان ئەوانەی لەولایەتە

یەککگرتووەکانی ئەمریکاوە دەچوونە ناو سۆڤیەت کەسانی تایبەتی بوونو کەسایەتی تایبەتییان هەبووە، کەسایەتی وەک ئەو کەسەیان نەبوو، بۆیەش کە ئەو لەناو یەکێتی سۆڤیەت داوای پەنابەری سیاسی کردووەو هاتۆتە مۆسکۆ، ئەوان زۆریان لا سەیر بووە، زۆریش بەهەموو دەزگاکانی گوێگرتنو چاودێری بۆیان روونو ئاشکرا نەبووە کە ئەو کەسێکی جاسووس بووە.

ڤلادیمیر سمیشاسنی بڕیاردەری ئەودەمانەی لیژنەی KGB، دەیزانی کە ئەو پیاوە ئوزویلد بەکەڵک کاری جاسووسی نایەت، لەو کارەش ناوەشێتەوە، بۆیە داوا دەکەن زۆر زوو بگەڕێنەوە وڵاتەکەیان، بەڵام ئەو سوور دەبێت لەو وڵاتە بمێنێتەوە، بەنیازی مانەوەو دەرنەکردنی مەچەکی چەپی زامدار دەکات، سۆڤیەتییەکان بەپەلە ئەو دەبەنە نەخۆشخانە، سۆڤیەتییەکان بەو کارەی ئەو نیگەران دەبن، چونکە مردنی کەسێکو هاوڵاتییە ئەمریکییەکە لە یەکێتی سۆڤیەت ئاسان نەبوو. ئەو لەماوەی هەفتەیەک دەبێتە درکێک بۆ جەستەی رووسەکان، بەناچاری مافی مانەوەو نیشتەجێی کاتی پێ رەوا دەبینن. ئەوان ئەو بڕیارەیان بۆ ئەوە دەرکردووە تا دەروازەی هاتنی کەسانی تر بۆ یەکێتی سۆڤیەت دانەخەن، بڕیارەکەش سیاسیی بووە. ئەگەرچی ئوزویلد لەسۆڤیەت دەمێنێتەوەو کیژێکی سۆڤیەتیش دەهێنێت، بەڵام هەر ناتوانێت لەناو کۆمەڵگەی سۆڤیەتی ناوێتە ببێت، بۆیە لە مانگی یونیۆی ساڵی ١٩٦٢ لەگەڵ هاوسەرەکەیو کوڕەکەیان دا لە رووسیا دەردەچن.

* * *

لە سەردەمی حوکمگێڕانی کەنەدی موخابەراتی مرکەزی بەڵێنی بە کوبییە کۆچبەرەکان دابوو کە حوکمی کاسترۆیان بۆ بڕوخێنێت، بۆیەش لە مانگی ئەپریلی ساڵی ١٩٦١ هێرشی بەنداوی بەرازەکان دەست پێدەکات، بەڵام بەرنامەو هێرشەکە سەرناگرێت، سەرۆک کەنەدی رازی نەبووە سوپای ئەمریکی چەند یەکەیەکیان لەو هێرشەدا بەشدار بکاتو تەرازووی ئەو شەڕە بگۆڕێت، هەرچەند موخابەراتی مەرکەزی فشار دەکات، بەڵام سەرۆک بەو داوایە رازی نابێت، سەرۆک کەنەدی وادەزانێت کە ئەو دەزگایە لەبن کۆنترۆڵی کۆشکی سپی دەرچووە، بۆیەش دەیویست چاویان بشکێنێت، چەند سەرکردەیەکیان دەردەکات لەوانە بەڕێوەبەرەکەیان ولیام دالاس، کە کرابووە ئەندامی لیژنەی وارین و، زۆر چاوی لە کەموکورییەکانی موخابەراتی ئەمریکی دەپۆشی.

ئەو هەڵوێستەی سەرۆک کەنەدی کوبییەکانییانی ناو ئەمریکاش تووڕە دەکات، لە هێرشی بەنداوی بەرازەکان سەرناکەون ئەوە لە پشتیوانینەکردنی کەنەدی دەزانن، ئەوەش بە خیانەت ناودەبەنو ئەو بەکەسێکی کۆمۆنیستی ناودەبەن، لە پاش ئەوەیان کێشەی مووشەکە سۆڤیەتییەکانیش سەرهەڵدەدات، ئەوەشیان بەوە کۆتایی پێ دێت کە سۆڤیەتییەکان مووشەکەکان دەکێشنەوە، بەمەرجێک ئەمریکا هێرش نەکاتە سەر کوبا. کەنەدی فەرمان دەدات کوباییەکانی ناو ئەمریکا بە هیچ شێوەیەک بوار نەدرێت لەسەر کەنارەکانەوە پەلاماری رژێمی کاسترۆ بدەن، بەتایبەتی پاپۆڕە رووسیەکانی سەر کەنارەکانیان، بۆیەش ئەو کوباییانە رقی زۆریان لەو هەڵگرتبوو، وایاندەزانی هەردوو میللەتی

ئەمریکی‌و کوبی هەڵدەخەڵەتێنێت، بۆیەش مافیاکان دوژمنێکی تریان بۆ کەنەدی زیاددەکەن، پێش ئەوەی کەنەدی ئەو پۆستە وەرگرێت دەسەڵاتدارەکانی ناو موخابەراتی ئەمریکی بۆ کوشتنی کاسترۆ کارو بەرنامەیان هەبووە. موخابەراتی ئەمریکی لەکاتی جەنگی دووەمی جیهاندا بەردەوام پەیوەندییان بەمافیاوە هەبووە، لەڤێتنام ئەو پەیوەندییە زۆرتر دەبێت، بۆیەش موخابەراتی سەربازییان لە بازرگانی‌و ئاودیوکردنی کۆکاکین کە مافیاکان دەیانکرد هاوکارییان هەبووە. لە ساڵی ١٩٥٦ ناکۆکی‌و ململانێیەکان لە نێوان مافیاکان‌و سەرۆک کەنەدی هەبووە.

دەستەکانی چەتەگەریی دەستیان خستبووە ناو بزاڤی کرێکاران، جڵەوی سەندیکاکانیان گرتبووە دەست‌و پارەو سامانەکانیان بەتاڵان دەبرد، ئەوانەی دژایەتیکردنی نیشاندابووایە دەکوژران، دەسەڵاتیان لە کارو چالاکییە پیشەسازیی و شوفێری لۆرییەکان هەبوو، کرێکاری کۆگاکان یەکێک بوون لەبەهێزترین یەکێتییەکانی کرێکاران، ناکۆکیی دەکەوێتە نێوان رۆبرت کەنەدی‌و سەرۆکی یەکێتییەکە جیمس هۆڤا کە سەرۆک بەتاوانی بەرتیل وەرگرتن لە یەکێک لە پارێزەرەکانی کۆنگرێس دەیداتە دادگا، ئەوەی شایانی باسە رۆبرت کەنەدی برای جۆن کەنەدی کە راوێژکاری ناوەندی لیژنەی کۆنگرێس بوو.

سەرۆک جۆن کەنەدی لەگەڵ رۆبرتی برای هاوسۆزبوو لەوەی بەرنامەی تاوانی بەرنامەرێژییەکان بڕوخێنێت، رۆبرت باش دەیزانی دژایەتیکردنی مافیا سەلامەتی‌و ژیانی کەسایەتییە سیاسییەکان دەخاتە مەترسییەوە، ئەوانە زۆر لایان ئاساییە تایفەیەک بەیەکەوە لەناوبەن، ناکۆکییەکانی نێوان ئەوو هەردوو براکە هەڕەشەی کوشتنی لە

هەردووکیان کردبوو، ئەنـدامێکی ئەو دەستەیە سانتۆس ترافیکانتی کە لە کوبا کاریکردووە، هەستیکردبوو کە سەرۆک کەنەدی بەوردی چاودێری ئەنـدامانی مافیـای کـردووە، بـۆیە لە مـانگی سـێپتەمبەری سـاڵی ١٩٦٢ بە هاورێو هاوکارەکانی وتبوو، ئەو پیاوە گەمە بەکارتێکی ترسـناک دەکات، زۆریـش کەوتـووتە نـاو گێژاوێکـی ترسـناک، بـۆیە دڵنیـام لەو نزیکـانە دەکوژرێت. کەسی سێیەمیش کە ناوی لەو لیستەدا هاتووە پێشەوا کارلۆس مارسیلیوبوو کە رۆبرت کەنەدی بەوردی چـاودێری چالاکییەکـانی دەکـردو لە وڵاتیش دووری دەخاتەوە، بۆیە ئەو سوێندی خواردبوو رۆبرتو بـراکەی لەناو ببات.

ئۆزویلدی کە وەک پیاوێکی موخابەرات چالاکی دەبێت دەکەوێتە نـاو دەسـتی مافیاکـان، ئەگەرچـی ئەو کەسێکی چەپخوازبـوو، بەروونـی خۆشەویستی بۆ کاسترۆ دەربڕیوە، بەڵام کە لەموخابەراتەوە دەچێتە نـاو مافیـا دەکەوێـتە نـاو لایەنە راسـترەوەکانو دەستەکانی نەیـاری کاسـترۆو کوبـا. حەوت مانـگ پـێش کوشـتنەکەی کەنەدی ئۆزویلـد خـۆی وەک کەسێکی کۆمۆنیسـتو دۆسـتی کاسـترۆ نیشـان دەدا، ئەوەش بە باشـی لە رۆژنـامەو دەزگاکانیتری راگەیانـدن دەبینـرا، لەمـانگی ئەپریلـی سـاڵی ١٩٦٣ ئۆزویلـد بە ئاشـکرا لە شـەقامو شـوێنە گشـتییەکان بەیاننـامەی پشتیوانیی بۆ کاسترۆ دابەشدەکرد، لەمانگی مـایۆی هەمـان سـاڵدا نـامەو داوای بـۆ لیـژنەی پشـتیوانی کوبـا نووسـیوەو، کـاریکردووە بـۆ کـردنەوەی لقێکـی ئەو لیـژنەیە لە نیوئۆرلیـانز، داواشـی کـردووە بـۆ راپەڕانـدنی کارەکـان ئامۆژگـاری بکەیـن، رێوشـوێنی ریکـلامو چـۆنیەتی ئەنـدامبوونی فێـربکەن، بـۆ چـاپکردنی هەزار نـامیلکە بـۆ پشـتیوانی لە کاسـترۆو

چاپکردنی ٥٠٠ داوانامەو ٢٠٠ کارت ئەندامبوون سەردانی چاپخانەکانی کردووە.

لە مانگی یونیۆی ساڵی ١٩٦٢ سەرۆک کەنەدی کۆششی کردووە ناکۆکییەکانیان لەگەڵ سۆڤیەت بەدانوستان چارەسەر بکەن، بەڵام نەیارەکانی کاسترۆ لە ئەمریکا ئاژاوەیان ناوەتەوەو پەلاماری پاپۆرە کوبیی‌و رووسیەکانیان داوە، هەمووش پارەیان لە موخابەراتی ئەمریکی وەرگرتووەو پشتیوانی لۆجیستییان کراوە، لەوەدەمانەش جۆن کەنەدی زۆری نەمابوو لەگەڵ سۆڤیەتییەکان بگاتە رێکەوتنی ئاشتیانە بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوەکییەکان، بەردەوام لە ئاسمانو لە دەریاو لە وشکاییەوە هێرش کراوەتەوە سەر کوباو هێرشەکانیش زۆر دژوار بوون، موخابەراتی ئەمریکیش بەردەوام کاری دەکرد کاسترۆ بکوژن، تا ناکۆکییەکان هەبێتو رۆژێک بێت سوپای ئەمریکیش بکەوێتە ناو ململانێیەکە. لە مانگی سپتەمبەری ساڵی ١٩٦٢ ئۆزوێلد بەوشکانیی‌و بەپاسێک دەچێتە مکسیکوستی، بەنەفەرەکانی وتبوو من سەردانی رووسیام کردووەو من سکرتێری لیژنەی پشتیوانیی کوبام، مەبەستمە سەردانی هاڤانا بکەم، لەناو پاسەکەش کەسێکی بەکرێگیراوی لەگەڵدا بووەو بەیەکەوە قسەو باسی زۆریان کردووە. لە رۆژی ٢٧ ی مانگی سێپتەمبەردا داوایەک پێشکەش بە قونسوڵیەتی کوبی دەکات تا بچێتە ناو کوبا، لەوێ چەند بەڵگەنامەیەکیان نیشاندەدات کە ئەو سەردانی مۆسکۆی کردووەو چەندین پسولەو بەڵگەی تری پێبووە کە ئەو پشتیوانی کوباییەکان بووە، پسولەی ئەندامیەتی حزبی کۆمۆنیستشی نیشانداون، بەڵام قونسڵەکە گومانی لێکردووە، بۆیە داوای لێکردووە سەردانی

سەفارەتی سۆفیەتی بکات، بەلاّم پاش چاوەڕوانی هەشت هەفتە داواکەی قبوولّ نابێتو رەت دەکرێتەوە. ژەنەراڵ لیکونایلینوفی سەرکردەی دەستەیەکی KGB لەمەکسیک نوزویلد لەسەفارەتی رووسی دەبینێت، ئەو وتبووی:

من ناوم نوزویلدە، بەلاّم ئەوەیان بۆ من گرینگ نەبوو، چونکە بیرم لەوە نەکردوە کە ئەو ناوەم بیستبێت، یان ناوەکە رۆژێکیان سەرەنجی منی راکێشابێت. ئەو کۆششی کردووە بگەرێتەوە یەکێتی سۆفیەت، چونکە وتبووی من لەناو ئەمریکادا وەک کەسێکی دەستبەسەر دەژیم، ئەگەر لێرە بمێنێمەوە لەسەرخۆ دەمکوژن، دەترسم شتێکی خراپم لێ بقەومێت، ئەو وتبووی کاتێک لە مەکسیک لە هوتێلدا دادەبەزیم منیان ورد دەپشکنیو زۆریش چاودێرییان دەکردم، حیسابیان بۆ هەموو قسەکانم دەکرد، چاودێریی هەموو جوولّەو گەڕانەکانی منیان دەکرد.

من زۆری لێ دەپاڕامەوە چەکەکەی بشارێتەوەو فیشەکەکانی لەناو دەربهێنێت، من وامدەزانی کەسێکی لاسارو شێتە، زۆر بەئاسایی نەدەهاتە بەرچاوم، بۆیە پسپۆرێکی دەروونم هێنابووە سەری تا تەماشای بکات، ئەو داوای دەکرد پلیتێکی فرۆکەیەکی بۆ پەیدا بکەم تا بگاتە مۆسکۆ، بەلاّم من پێم وت دەبێ ڤیزات هەبێت ناکرێ سەفەری ئەو وڵاتە بکەین بەبێ رەزامەندییە نوسولّییەکان، من باشم دەزانی کارەکانی ئەو رەزامەندییە دوورودرێژەو کاری بیروکراتی زۆری دەوێت. ئەوان دەیانپرسی ئایا ئەوە رەواو یاساییە...؟ ئایا ئەوەیان پێویستی بەئیزەن هەیە، زۆریش قسەیان لەسەر سیستەمی سۆفیەتی دەکرد، ئەو پیاوە چۆن دەبێتە هاوڵاتییەکی رووسی، رەنگە ئەوەیان لەدانیشتنێکدا روو

بدات، ئەوەش ناکرێت چونکە لەودەمانەدا ئەو دەستی دەلەرزی.

بەپێـی راپۆرتەکـان ئۆزویلـد دووبـارە دەچێتەوە سەفارەتی کـوبی، دیسـان لەوێ ڤیـزای سـەفارەتی سـۆڤیەتی نـادەنێ، بـۆیە بەناچـاری دەگەڕێتەوە دالاس، لەوێ لەکۆگای کتێبـدا کارێـک وەردەگرێـت، ئەوەش یەک مانـگ پـێش سـەفەرەکەی کەنەدی بـوو بـۆ دالاس، لەودەمـانەدا موخـابەراتی ئەمریکـی بەوردی چـاودێریی سـەفارەتەکانی وڵاتـانی ئیشـتراکی دەکـرد، وێـنەی میوانەکانیـان دەگـرت، گوێیـان لە هەمـوو قسەکانیان رادەگرت، هەموو قسەکانیان تۆمار دەکـرد، لەوێ دەرکەوتبـوو کە ئەو چەندین جار سەردانی سەفارەتی رووسی کردبوو بۆ سەردانی کوبا. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو لەوێنەکانـدا دەرکەوتبـوو کە وێـنەی ناو فیلمە تۆمارکراوەکان، پیاوەکە ئۆزویلد نەبوو!

ئەگەرچـی ئۆزویلـد خـۆی لە دالاس بـوو، بەڵام چەنـد هەفـتەیەک پێش کوشتنەکەی کەنەدی کەسێکی تـر بەنـاوی ئەو بەهەڵسوکەوتی ئەو لەنـاو بازارەکانـدا، لەفرۆشـگاکانی ئۆتۆمبێلەکـان، لە سوپەرمارکێت و لە نووسـینگەکانی کـاردۆزینەوە چەکو تەقەمەنیـی فرۆشـەکان وەک ئەو دەجولایەوە، خۆی وەک ئۆزویلد نیشاندەدا.

لە سـاڵی ١٩٦٣ کـار دەکـرا پەیوەنـدییە دبلۆماسـییەکان لەگەڵ کوبـا باشتر بێت، بـۆ ئەو مەبەسـتەش کۆبـوونەوەی نهێنـی لەنێوان واشـنتۆنو هاڤانا گەرم بوو، تا بگەنە رێکەوتنێک بـۆ قەدەغەکردنـی تـاقیکردنەوەی چەکە ناوەکییەکان، لەودەمانەدا بزاڤە دژ بە رژێمەکەی کاسـترۆ بەنـاوی ئۆزویلد مناوەراتیـان دەکـرد، ئەگەرچـی ئۆزویلـد خـۆی لە دالاس بـوو. لەو رەوشـە سیاسـییەدا سـەرۆک کەنەدی بەبـێ رەزامەنـدیی موخـابەرات کە

شەڕی ڤێتنامیان بەڕێوە دەبرد ئەو بڕیار دەدات هێزەکان لەو وڵاتە بکێشێتەوە، ئەوانەش هەموو بەنهێنی کراوەو موخابەرات ئەگەریش پرسی پێ نەکراوە، بەڵام هەواڵی ئەو مشتومڕانەش بۆ دەرەوەی سالۆنەکان دزەی کردووە.

## هەموولایەک پیلانگێربوون

لەمانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٦٢دا کۆبوونەوەیەک لە نێوان کۆمەڵەی بیرتشی راستڕەوو توندڕەوو کۆچبەرە کوباییەکان دەکرا بۆ سووربوون لەسەر کوشتنی کەنەدی ، بۆیەش لەوێ یەکێک لە کەسە دیارەکانی ئەو کۆبوونەوەیە بەئامادەبووانی وتبوو، کە کەنەدی لەرۆژی ٢٢ی مانگی نۆڤەمبەر سەردانی دالاس دەکات، دەبێ لەوێو لەو کاتەدا سەرۆک جۆن کەنەدی بکوژرێت. هاوکات بۆ کوشتنی کەنەدی لە میامیش کۆششی کوشتنی کرابوو، لەناو پەنجەرەیەک بەرنامەی کوشتنەکەیان هەست پێکردووە، بۆیە سەردانی ئەو دوو شارەیان هەڵوەشاندووتەوە. کە کەنەدی لە دالاس بووە کاسترۆ لەودەمانە لەگەڵ ژۆرنالیستێکی فەرەنسی ئاماژەی بەکۆششی ئاشتیخوازی کەنەدی داوەو زۆریش بەرنامەکەی ئەوی پێ باش بووە، ئەو ژوورنالسیتەش هاندەدات وەک پەیامنێرێکی ئاشتیخواز لەنێوانیاندا کار بکات، نیازیش بوو بۆ ناردنی نوێنەرێکی رەسمی بەرنامەرێژیش بکات، بەڵام کەنەدی لە دالاس دەربازی نەبوو، کە کاسترۆ هەواڵەکە دەزانێت شۆکێکی مەزن دەیگرێت، کە ئێستگەکانی

ئەمریکی لەهەواڵەکاندا باسی ئەوەیان کردبوو کە ئەو کەسەی کەنەدی تیرۆرکردووە کەسێکی کۆمۆنیستو دۆستی کاسترۆ بووە، دیارە کاسترۆ حەقی بووە بترسێت، لەتۆڵەی ئەوەدا چاوەڕوانی پەلامارێکی سەربازی ئەمریکی دەرکرد، بۆیە ئەو هەموو بەرنامەی دیمانەکانی هەڵدەوەشێنێتەوە.

زۆر لە رۆژنامەکانو لە ئەمریکییەکانیش دڵنیابوون کە تیرۆرکردنی کەنەدی دەستی رووسیاو کوباو کۆمۆنیستیەکانی تێدایە، بەڵام راپۆرتی لیژنەکەی وارین لەساڵی ۱۹٦۲و راپۆرتی لیژنەی تیرۆرەکانی ساڵی ۱۹۷۹ ئاماژەیان بەوە داوە کە هیچ بەڵگەیەک نییە ئەوان تاوانبار بکرێن بەو تاوانە. بەڵام دووبارەو لە ساڵی ۱۹٦۷ دا ئەو گومانە دەژێنتەوەو ئەمریکییەکان دەڵێن کوشتنی کەنەدی پیلانێکی راستەوەدکان بووە، وتیان گوایە کاسترۆ لەتۆڵەی ئەوەی کەنەدی مەبەستی بووە کاسترۆ تیرۆر بکات، بۆیەش ئەو دەستی لەو کوشتنەدا هەبووە، ئەوەش لە لایەن یەکێک لە سەرکردەکانی مافیاوە کە لەگەڵ موخابەراتی ئەمریکی کاریکردووە بەگەرمی ئەو قسەیەی بڵاوکردیتەوە، کە لەگەڵ موخابەراتا بەرنامەکەیان دارشتووە.

سەبارەت بەجاک روبی ئەوەی ئوزویلد دەکوژێت، ئەو رووداوەکەی لەو دیمانە تەلەفزیۆنەدا کورت کردیتەوەو وتویەتی:

ئەوەی تەنها دەکرێ بیڵێم ئەوەی روویداوە هەرگیز دەرناکەوێت، راستییەکانیش بۆ جیهان ئاشکرا نابێت. پاش چەند سەعاتێک لەبریندداربوونەوەکەی ئوزویلد لەسەر قەرەوێلەی نەخۆشخانە دەمرێت، هەواڵی مردنی ئەو پیاوەش بڵاودەبێتەوە ئەو پیاوەی سەرەداوی

کوشتنەکەی کەنەدی لەلا دەستدەکەوت، بەمردنی ئەو هەموو نهێنییەکان گوم بوون.

پاش چەند ساڵ هەموو جیهان باس لەو پیاوە دەکەنو دەڵێن:

بۆچی ئوزویلد یەک ڕۆژ پاش کوشتنەکەی بەخاک سپێردرا...؟ ڕوبی داوای کردبوو دووبارە دادگایی بکرێتەوە، ئەوەشیان بۆ کردبوو، بەڵام کە ئەو تووشی نەخۆشی کانسەر دەبێت هەموولایەکیش دوعایان بۆ دەکرد پێش ڕۆژی دادگاییکردنەوەکەی نەمرێت. تا ئیمڕۆش هۆکاری کوشتنەکەی ئەو بەشاراوەیی ماوەتەوە، هەر جارێک باس لەمەسەلەی کوشتنەکەی کەنەدی دەکرێت، دەڵێن:

ئایا هارفی ئوزویلد کێ بوو. وەڵامەکەش لەناو دۆسییەکانی KGB دەدۆزرێتەوە.

ئەوە چلو پێنج ساڵ بەسەر کوشتنەکەی کەنەدیدا ڕەت دەبێت، وا خەریکە لەناو دۆسییەکانی KGB لە پاش چەندین لێکۆڵینەوەی هەندێ نهێنی وردیان پێش تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکانی دەزگاکانی حکومەت، ئەو ڕاستییە ڕوون دەکەنەوە، کە ئوزویلد لەکوشتنەکەدا دەستی نەبوو، وەک چۆن لە ڕاپۆرتەکەی وارین دەرکەوتبوو، چونکە کەس ئەوە بڕوا ناکات ئەو پیاوە ئەو کارەی بە تەنها کردبێت، بۆ یەکەمجاریش ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئەو فیشەکانەی بەر کەنەدی کەوتوون لەیەکلاوو لەپشت ئۆتۆمبێلە لیمۆزینەکەی سەرۆکایەتی هاتووە، یەک گوللەش لەو بەرزاییە چڕە بەدارەکان هاتووەو لەهیچ شوێنیکی تری پێش ئۆتۆمبێلەکە نەهاتووە، دەڵێن لەباڵەخانەیەکی تر دوو کەسێکی تر تەقەی کردووە.

بەپێی راپۆرتێکی KGB ئەوە بەفەرمی دەسلمێنێت کە لایەنگیرانی سەرۆکی ڤیێتنامی لەگەڵ ئەندامانی دەستەیەکی مافیای سۆڤیەتی و ئەمریکی دەستیان لەکوشتنی کەنەدی دا هەبووە، ئاژانسی نهێنییەکانی بەردەستی سۆڤیەتیی و ئەمریکییەکان گەیشتبوونە یەکلاکردنەوەی ئەو مشتومرەی ماوەیەکە هەمووولایەکی لەسەر ئەو مەسەلەیە هەراسان کردبوو و هیواش زۆرە ئەو گرێیە بکرێتەوەو نهێنیی ئەو رووداوە گەورە بدۆزرێتەوە.

## جۆنسۆن

ئەوەی مادلین دونکان براون لەسەر ئەو مەسەلەیە قسەی لەسەر کردووە، هەمووولایەکی تووشی شۆک کردووە، ئەویش ژنێکی دۆستی جۆنسۆن بووە، کە ئەو لەو ماوەیەدا جێگری سەرۆک کەنەدی بووە، کە پاش کوشتنی کەنەدی ئەو دەبێتە سەرۆکی ئەمریکی، ئەو لەدیمانەیەکدا کە پێش مردنی لەساڵی ۲۰۰۲ دا وتبووی:

جۆنسۆن لەگەڵ (هنت) ی ئیمپراتۆری کۆمپانیاکانی (ئێچ ئێل) بیرۆکەی لەناوبردنی کەنەدی یان بۆ یەکەمجار لە کۆنگرەی حزبی دیموکراسی لەساڵی ۱۹٦۰ باسکردووە، ئەو ژنە وتبووی هنت بەمنی وتبوو:

رەنگە شەڕەکە بدۆڕێنین، بەڵام جەنگەکە دەبەینەوە.!

مادلین وتبووی شەوی پێش کوشتنەکە جۆنسۆن بەساردییەکی ترسناکەوە بەمنی وتبوو:

ئەو لەمەودوا من شەرمەزار ناکات. هەروەها ئەو ژنە وتبووی:

هنت لەرۆژی ۲۲ ی مانگی نۆڤمبەری ساڵی ۱۹٦۳ کە رۆژی کوشتنی

بوو، بەمنی وتبوو:

ئێمە جەنگەکەمان بردەوە، ئەوەش مانای ئەوە بوو هەموو پلانی بەرنامەکە تەواو بوو، بۆیەش هنت لە کۆنگرەی حزبی دیموکراسی هەموو شتێکی بۆ پشتیوانی ئەو سازکردبوو، خەڵکێکی زۆر ئامادەبوون. ئەو ژنە ئەو ناوانەی ریزکردووە کە دەستیان لەو کارەدا هەبووە، کە ژمارەیەک لە کەسایەتی کۆمەڵایەتیو سیاسی بوونو لەجۆنسۆنو هنت زۆر نزیک بوون، تێیدا پارەداری زۆر دەوڵەمەندو قازیو بەرێوەبەری نووسینگەکانی لێکۆڵینەوەی فیدراڵییش ئادگار هوفر ناوی هەبووە. ئەوانە ئەو شەوەی لە ئاهەنگە تایبەتیەکەی شاری دالاس، کە کەسێکی زۆر نزیک لە مافیا کلینت مورشیسون سازیکردبوو، لەوێ هوفر لەگەڵ بزنسمانە لۆکالییەکانو ئەندامانی مافیاو نووسەری رۆژنامەکانو بەرێوەبەری تەلەفزیۆنەکانو ریتشارد نیکسۆنو جاک روبی فەرمان بەهارڤی ئوزوێلد دەدەن تەقە لەکەنەدی بکات، ئەوانە هەموو بەهێمنی لە نزیک سەعات یازدەی شەو دانیشتبوون لەناکاو جۆنسۆن بەمورشیسون دەڵێت، فەرموون بۆ کۆبوونەوەکەمان. ژنەکە زۆرتر قسەی لەسەر ئەو مەسەلەیە کردووەو وتوویەتی:

کە جۆنسۆن لەدانیشتنەکە تەواو بووە زۆر بەدڵنیاییەوە قسەی کردووە.

مادلیین وتوویەتی کە جۆنسۆن لەلای ئەو وتوویەتی:

چیتر ئەو کورە زۆڵانە شەرمەزارمان ناکەن... ئەوەش بەڵێنو هەرەشە نییە.

ئەو کە تەلەفۆنی بۆ من کردبوو، وتبوی چیتر مافیاکانی ئیرلندی

نزیك لەبنەماڵەی كەنەدی حەز ناكەن كەنەدی لەژیاندا بمینێت.

ئەو ژنە هەر ئەو رۆژە هەواڵی پەلامارەكەی سەر كەنەدی بیستووە، بۆیەش پەیوەندی بەئیمپراتۆری میدیاكان لو ستیریت كردووە، ئەویش لەوەڵامدا بەمادلینی وتووە،

ئەوانە تەنها تەقە لە زۆڵەكان دەكەن.

مادلین هەر ئەوەندەی وتووە كە تاوانەكە سیاسی بووەو هۆكارەكەش لەسەر ململانێی سیاسی بووە. ئەوانەی ئاگاداری ئەو رووداوە بوون، دەبوایە شاهیدی لەسەر جۆنسۆن بدەن، كە دەستی ئەو لەو تاوانەدا هەبووە، زۆریان لەناو زەلكاوی تاوانو بەد رەوشتییدا خنكاونو بۆیە دەنگیان نەدەهات، یان سەریان بە پێنج گوللەكون كون كراوە، من كوڕە ناشەرعییەكەم لە جۆنسۆنو ژنە خزمەتكارەكەمان پاش كوشتنی كەنەدی بێ سەروشوێن كران، ئەویش بڕیاری دابوو لەترساندا هیچ قسەیەك نەكات. مادلین كە ماوەی ٢١ ساڵ لەگەڵ جۆنسۆندا بووە وتوویەتی،

بەرنامەی كوشتنەكە زۆر ورد داڕێژرا بوو، ئەگەرنا زوو جۆنسۆن دەگیرا، ئەو كاری كردووە بە هەموو شێوەیەك كەنەدی لەناو ببات، بەدڵنیاییەوە دەڵێم ئەو دەستی لەو كوشتنەدا هەبووە.

✻ ✻ ✻

لە مانگی سپتەمبەری ساڵی ٢٠٠٩ لە رۆژنامەی (ئەلجەریدەی)ی كوێتی بەزنجیرە بڵاوكراوەتەوە.

ئەبو جیهاد

ئەبو جیهاد بەرنامەرێژی زۆر لە نەبەردی فەڵەستینییەکان.

یوسف ئەلسباعی

وێنەی ئەلسباعی لەگەڵ هاوڕێیەکەی لەماڵەکەی خۆی

مارتن لۆسەر

مارتن لۆسەر خەونەکەی هاتەدی

ژەنرال کلیبری فەرەنسی

سلێمان حەلەبی

وێنەی ڕووداوی کوشتنی کلیبر

تابلۆیەکی کاریکاتێری ناجی ئەلعەلی

ناجی ئەلعەلی لەگەڵ هاوسەرەکەی لەساڵی ١٩٤٨ لە ئەلشارقە

ناجی و گوژاڵکەکەی

رۆمل ڕێوییەکەی بیابان

رۆمل فیڵبازەکە لە شەڕی ئەلعەلەمێن ئاراستەی جەنگی دووەمی بە شکانی ئەڵمانیا گۆڕی

پاشا فەیسەل کوڕی عەبدولعەزیز

مەلیک فەیسەل لەگەڵ جەمال عەبدولناسر

# وەرگێڕ لەچەند دێڕێکدا

لە ساڵی ١٩٥٥ لەشاری دێرینی (هەولێر) لەدایکبووم.

ئامۆژگای تەکنەلۆژیای بەغدام تەواوکردووە.

تا لەوڵات دەرچووم فەرمانبەری شارەوانی هەولێر بووم.

لەساڵی ١٩٩٨ ەوە لەوڵاتی سوید دەژیم.

چاپکراوەکانم ...

- لە یادی سەد ساڵەی شارەوانیدا، ١٩٨٥ کتێبی (هەولێر)م بە قەبارەی ٢٦٥ لاپەرە ئامادەو چاپکرد.
- هەر لەشارەوانیدا لەساڵی ١٩٩٤ دا، ١٢ ژمارەی رۆژنامەی(هەولێر)م دەرکرد.
- کەلاوە... ١٩٩١ ریپۆرتاژ، بۆ ئۆردوگاکانی دەڤەری هەولێر.
- دیوەخانی فلین... رۆژانەو ریپۆرتاژە، لە ١٩٩٩ لەرۆژنامەی (ئاڵای ئازادی)ی زەحمەتکێشان لەدە ئەڵقەی درێژ بڵاوکرایەوە.
- هەولێر... تا دبلن...... ٢٠٠٠ ریپۆرتاژ، زانکۆی ئازادی بەرلین.

❖ بەغدا.... بۆ هەولێر!..... ٢٠٠٠ ریپۆرتاژ، سویدو سلێمانی.

❖ مەملەکەتی فارگۆنەکان.....٢٠٠١ ریپۆرتاژ، سلێمانی.

❖ کاکە، ئەبو ئیسماعیل.. ٢٠٠١ ، سلێمانی.

❖ بەسەرهاتی دەریاوانێکی خنکاو ٢٠٠١ رۆمانی گابریل مارکیز، لە ژمارە ٢٥ی گۆڤاری (ئاینده)ی سلێمانی بڵاوکرایەوە، وەک نامیلکەش بڵاوکرایەوە.

❖ دە رۆژەکەی هەولێرم، (١١) وتارو ریپۆرتاژبوو لەگۆڤاری (گوڵان)ی هەولێرو رۆژنامەی (کورد) لە ئوسترالیا بڵاوکرایەوە.

❖ رێگای دوورم بۆ ئازادی، نیلسۆن ماندیلا، وەرگێران. هەولێر لەدەزگای موکریانی بڵاوکرایەوە.

❖ سارد، یان گەرم (١٢) ریپۆرتاژبوو، لەرۆژنامەی (هەواڵ)ی سلێمانی لەمیولیو ٢٠٠١ ی یەنایەری ٢٠٠٢ بڵاوکرایەوەو وەک نامیلکەش بڵاوکرایەوە.

❖ فارگۆنەکان، ریپۆرتاژو بیرەوەرییە لەدەزگای بەدرخان لەهەولێر ٢٠٠٥ بڵاوکرایەوە.

❖ مەملەکەتی کەلاوە، وتارو پێناسەی بیناسازی کوردییە وەک نامیلکە لە وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر بڵاوکرایەوە.

❖ کۆریا پێناسەو مێژووی کۆریای باشوور، لە خانەی وەرگێران لە هەولێر ٢٠٠٧ بڵاوکرایەوە.

❖ هولۆکۆست.. کتێبێکە لەسەر قرکردنی جولەکە لە ئەوروپا، وەرگێران ... سەنتەری نما هەولێر ٢٠٠٧.

❖ دوو پرێنسیسی نازداری بێناز، دیاناو ماساکۆ.. هەولێر دەزگای ئاراس ٢٠٠٨.

❖ مارتن لۆسەر وەرگێڕانو ئامادەکردن، بەشێکە لە کتێبی ئاتوندوتیژی ١ سەنتەری مەسەلەهەولێر ٢٠٠٨.

❖ بەرەو کۆشکی ئالیزی ، شیراک، روایال، سارکۆزی ... و، خانەی وەرگێڕان سلێمانی ٢٠٠٨.

❖ سێکسو پۆلیتیک، دیوێکە لەژیانی دبلۆماتی فەرەنسای نوێ..و، دەزگای سەردەم ٢٠٠٨

❖ تەها حوسین، نابینایەکی بینا، وەرگێڕانو ئامادەکردن.. دۆسیەیەک لەگۆڤاری نما ٢٠٠٨

❖ ٩٥٥ دەقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەس دیمانە ... دەزگای نما ٢٠٠٨

❖ دۆلار لەئەمریکا، دوو بابەتی ئابووریە....و، دەزگای ئاراس ٢٠٠٨

❖ مەجبوور، سەربردەو ریپۆرتاژە... سلێمانی ٢٠٠٨

❖ مـن رۆژنامەنووسـم، جاسـووس نـیم.. وەرگێـڕان خـانەی وەرگێـڕان سلێمانی ٢٠٠٩

❖ مۆساد. وەرگێڕان. لە بڵاوکراوەکانی ئاودێر هەولێر ٢٠٠٩

❖ دانپێدانەکانی حاجی پاولۆ .. لە بڵاوکراوەکانی ئاودێر هەولێر ٢٠٠٩

❖ ترێنە خێرایەکی خۆرهەڵات ... وەرگێڕان دەزگای موکریانی ٢٠٠٩

❖ نهێنییەکانی سندووقە رەشەکە ... وەرگێڕان وەزارەتی رۆشنبیری ٢٠٠٩

❖ کاکە ئەبو خەلیل ... بەسەرهات ... رەخنەی چاودێر سلێمانی ٢٠٠٩

❖ برادەرە جوانەکە، رەشیدە داتی ... دەزگای ئاراس وەرگێڕان ٢٠٠٩

❖ سارا پالین ... ژنێکە دەرچوو لە نەریتەکان .. وەرگێڕان دەزگای ئاراس ٢٠١٠

❖ دەسەڵات و نەخۆشی ... وەرگێڕان خانەی وەرگێڕان سلێمانی ٢٠١٠

❖

❖ ئامادەی چاپە ،

❖

❖ هەتان... چەند وتارێکە لەسەر بیناسازی کوردەواری، لەساڵی ١٩٨٨ ەوە ئامادەیە.

❖ سیڤییەکان ١ـ کۆمەلەدیدارێکە ٢٠٠٢ _ ٢٠٠٩

❖ سیڤییەکان٢ کۆمەڵەبابەتو دیمانەیە ٢٠٠٢ ٢٠٠٩

❖ جیهانی لەدیدی کۆشنێر ... وەرگێڕان ٢٠٠٩

❖ دەسەڵاتی دوو ژن ...ئەنجیلا مێرکلو ئیلیزابێپی شاژن ٢٠٠٧ _ ٢٠٠٨

❖ پایزە ساڵ ... تۆماری رووداوەکان ... ٢٠٠٩

❖ گەشتێک بەرەو ئەوروپای نوێ ... وەرگێڕان ٢٠١٠

❖ ئیسکێپ (دەربازبوون) ... وەرگێڕان ٢٠١٠

❖ سیاسەتی دڵ ... وەرگێڕان ٢٠١٠

❖

❖ بەهەشتی زینـدان... وتارو ریپۆرتـازە لە١٩٩٦ەوەو بەبەردەوامـی دەینووسم، ئێستاش گۆشەی (بریڤ) لەچەندین گۆڤارو رۆژنامەو ماڵپەڕەکانا لەوڵاتو دەرەوەی وڵات بڵاودەکەمەوە.

من وا هەست دەکەم ناوەڕۆکی ئەم کتێبە بابەتێکی زیندووەو کەم لە کوردستان و ناوچەکەمان ئازایانە ئاو ڕی لێ دراوەتەوە، چونکە ماوەی حوکمڕانی سەرۆکەکانی ئەم ناوچەیە، تا مردنە لە کورسییەوە بۆ نەخۆشخانە، یان یەکسەر بۆ گۆڕستان بووە، لەو ماوەیەشدا کەس باسی نەکردوون و توێژینەوەی بابەتییانەیان لەسەر نەنووسراوە.

کتێبی دەسەلات و نەخۆشی، کە لە لایەن وەزیری دەرەوەی بریتانی پێشووتر (دیڤید ئۆین) نووسراوەو لە ڕۆژنامەی ئەلشەرقی ئەوسەت بە زنجیرە بڵاوکراوەتەوە، لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر باندۆری سەرۆکە نەخۆشەکانی جیهان . بابەتێکە لەسەر باندۆری نەخۆشییەکان و چارەسەرکردنەکانی جەستەیی و دەروونییان، لەسەر بەڕێوەبردنی دەسەلات و دەرکردنی بڕیارەکان، کە ئەنجامی بڕیارەکان کوێرانەو گێژانەو گەوجانە بووە.